کۆتفرید یۆهانز میوولەر

# لەڕۆژهەڵاتی گڕگرتوودا

## نێردەی بە مەترسیی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ١٩٤٣



**بەدران ئەحمەد حەبیب**

لە ئینگلیزییەوە کردوویە بە کوردی

**دوکتۆر مارف خەزنەدار**

پێیدا چووەتەوەو پێشەکیو تێبینی لەسەر نووسیوە

## کۆتفرید یۆهانز میوولەر

# لەڕۆژهەڵاتی گڕگرتوودا

## نێردەی بە مەترسیی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ١٩٤٢

**بەدران ئەحمەد حەبیب**

لە ئینگلیزییەوە کردوویە بە کوردی

**دوکتۆر مارف خەزنەدار**

پێیدا چووەتەوەو پێشەکیو تێبینی لەسەر نووسیووە

ناوی کتێبەکە بە ئەڵمانی:

**Im Br nneden Orient**

ساڵی ١٩٥٩ لە شتووتگارت بڵاوکراوەتەوە.

---

چاپی یەکەمی ئینگلیزی:

**In The Burnning Orient**

لە گۆرینی **peter Mccarthy**

لە ساڵی ١٩٨٠ لە ئەڵمانیا بڵاو کراوەتەوە.

---


لە ڕۆژهەڵاتی گڕگرتوودا (نێردەی بەمەترسیی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ١٩٤٣)
نووسینی : گۆتفرید یۆهانز میوولەر
گۆرینی : بەدران ئەحمەد حەبیب
پێشەکی  د. مارف خەزنەدار
چاپی یەکەم (بەکوردی)، هەولێر ١٩٩٢
(٣٠٠٠) دانە لەم کتێبە بڵاو کراوەتەوە
دەست پێکردنی چاپ  ١٩٩٢/٥/٣٠
لێبوونەوە لە چاپ : ١٩٩٢/٦/٥



**● براتان بیرکەنەوە ...**

( رەمزی )

# پێشەکی

# مرۆڤی مەرد و نەبەرد

**دکتۆر مارف خەزنەدار**
ماموستای بەشی زمانی کوردی
کولیجی ئەدەبیات ـ زانستگای سەلاحەدین

## سڤاستیکاو تاریکی و جەنگ

لەسەرەتای جەنگی دووەمی گێتییەوە ئەڵمان سستی بە خۆیەوە نەدیو لە سەرکەوتن دا بوو. نازی لە لووتکەی بەرزیو لە خۆباییی دابوو. مەستی ئەو دووا رۆژە بوو کە بە خەیال هەموو نیشتمان و نەتەوەکانی سەر زەوی یەك خست بوو و کردبووی بەیەك وڵات و یەك نەتەوەو نەژادی جەرمەنی ئەو دەوڵەتـە گێتیـیـەی بەرێـوە دەبـرد. لە ساڵانی سەرەتای جەنگ دا سڤاستیکای ئەڵمانیای فاشیست تەنیـا دروشمی دەوڵەتی نازی نەبـوو، بەڵکـو بووە نیشانەی زۆرداری لەلای هەموو مرۆڤـایـەتیی ووشیـارەوە. بوو بەڵگـەی زوڵم و کارەسات و تاوان، بوو بە رەمزی بێ بەزەیی و نامەردی، بوو بەوێنەی هێزی تاریکی.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٢ و سەرەتای ساڵی ١٩٤٣، لەو ماوەیەدا وێنەی شکانی ئەڵمانیای نازیو پارچە بوونی لە پێش چاویدا وەك رەنگدانەوەی ناڵەی سەرەمەرگی دێوی رەش لە گۆمی شڵەقاودا وابوو، بەڵام ئەڵمان کۆڵی نەدەداو سوور بوو لە سەر بەردەوامی جەنگ. کەم بوونی سووتەمەنی بەتایبەتی نەوت (پیترۆڵ)بووە هۆی ئەوەی لقێکی بچووکی خەفیەیی بیر لە دانانی کردەوەیەك بکاتەوە بەناوی «کردەوەی ماموێنت» بۆ ئەوەی ئەڵمانەکان بتوانن چاڵەکانی نەوتی کەرکووك و مووسڵ وبخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە. بێگومان دەبوو ئەم کارە بە یارمەتیی کورد بکاتە ئەنجام، کە کوردیش بیکا دەبوو پاداشتی بدرێتێ لەو دەوڵە گێتییەی کە لە کۆتایی جەنگ دا ئەڵمان دروستی دەکرد!

بەڵام لای ئێمەو لای ئەوان، لە وڵات و هەندەران چی باس بوو؟

## لای ئێمە چی باس بوو

لەپـاش جەنگی یەکـەمی گێتییەوە، بەتایبەتی لە کوردستانی عیراق دا سێ رێرەوو بیروباوەری سیاسیو ئیدیۆلۆجی لە ناوەوە بوو،بەزۆریش رووکەش بوو و لە ناخی تێگەیشتنەوە هەڵنەقوڵا بوو:

١- ئەوانەی سەر بە ئینگلیز بوون و زۆربەشیان پێوەندی‌یان پێیانەوە هەبوو.
٢- ئەوانەی خۆیان بە لایەنگری ئەڵمان دەزانی وشانازی‌یان بەوە دەکرد کە نازی‌یان پێ‌بڵێن، بەڵام هیچ پێوەندی پێکیشیان بە ئەڵمانەوە نەبوو.
٣- ئەوانەی تورکچیەتی‌یان دەکرد، ئەمانە بوو بوون بە دوو بەشەوە، بەشکێکیان بۆ دەسەڵاتی عوسمانی دەگریان و دەیان لاواندەوە، بەشەکەی تریان خۆیان سەر بەتورکیای مستەفا کەمال و لاتینی دەزانی، لە رووی بیرو باوەری ئیدوۆلۆجیشەوە ئەمانە مەیلیان زیاتر بۆ نازی هەبوو، چونکە عوسمانی و تورکی پاش عوسمانیش لەگەڵ ئینگلیز رێك نەبوون[1]
هەموو ئەم خەڵکانەش تورکچیەکان نەبێ، واتە سەر بە ئینگلیزو، لایەنگری ئەڵمان بیرو رایان هەرچی بووبێ لە چوارچێوەی «کوردایەتی» نەچوو بوونە دەرەوە، هەموو شتێك بەلای ئەوانەوە دەبوو لە پێناوی چاکەی کورد بێ. بێ گومان پارتی هیوا قاووغێکی پر بە پێستی بوو بۆ پاراستنی ئەم رێرەو و ئیدیۆلۆجی یەتانە لە ناو رێزەکانی‌دا[2]
یەکێتی ئیدیۆلۆجی لەناو ئەندامانی پارتی هیوا نەبوو، رەنگە ئەمەیان بە خەوش بۆ دانابێ، جگە لەمە خەوشێکیان‌بۆ دۆزیوەتەوە، بەوەی کە دەڵێن پارتی‌یێکی بۆرجوازی بوو. نەیەکەم و نەدووەم هیچ یەکێکیان خەوش نین. یەکێتی‌ی ئیدیۆلۆجی‌ی نەتەوایەتی تێدا هەبوو، بەڵام هەستی ئیدیۆلۆجی‌ی چینایەتی تێدا نەبوو. هەرچی بۆرجوازیشە هەمیشە خراپ نی‌یە، هەمیشە دوواکەوتوو نی‌یە. پارتی هیوا شانازی‌ی کوردە، لەسەردەمێکی پاش جەنگی یەکەمی گێتی پێویستی‌یێکی مێژوویی ئاڵای کوردایەتی دایە دەستی‌و لاوی خوێندەواری کوردی لە دەوری خۆی کۆ کردەوەو فێری نیشتمانپەروەری کردن و رێگەی خۆش کرد بۆ پەیدا بوونی رێکخراو و پارتی‌تر لە کۆمەڵی کوردەواری‌دا لە دووا ساڵانی جەنگ و پاش جەنگ . ئەوانەی رۆژی لە رۆژان لە پارتی هیوا بوو بن جێگەی رێزگرتنن.

## لای ئەوان چی باس بوو

لە ئەوروپا سێ بیروراو ئیدیۆلۆجیەتی سەرەکی لە ناوەوە بوو، ئەمانە بوو بوون بە هێزو لە دەسەڵاتی دەوڵەت دا رەنگیان دابووەوە:
١- دەوڵەتە بۆرجوازی‌یە دیموکراتی‌یە لیبرالی‌یە پێشکەوتووەکانی ئەوروپای ناوەراست و رۆژئاوا (بەریتانیا، فرەنسا...) لەگەڵ وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.
٢- دەوڵەتە بۆرجوازی‌یە نازی - فاشستە میلیتاری‌یەکانی ئەوروپای ناوەراست و خوارووی (ئەڵمانیا، ئیتالیا..).

٣- دەوڵەتی سۆسیالیستی سۆڤیەت کە لەسەر بنچینەی مارکسیزم دروست بوو بوو و باوەری بە کۆمۆنیزم هەبوو.
ئەم ئیدۆلۆجی‌یەتانە بوو بوونە هۆی بگرەو بەردەو خەبات و زۆرانبازی‌و چوونە مەیدان بە شێوەیێکی گەلێك تیژ لە نێوان رێرەوەکانی «دیموکراتی - لیبرالی» و «نازی - فاشیزم» و «مارکسیزم

ـ کۆمۆنیزم». ئەم دیاردەیە دەبوو بە جەنگ ئەنجام پێ بدرێ، بەتایبەتی بە بیروباوەڕی ئەڵمانیای فاشستی، هەوری ڕەش لەو ڕۆژە باڵی بەسەر هەموو ئەڵمانیادا کێشا، کە هیتلەر دەسەڵاتی گرتە دەست و بوو بە کەنسلەر (موستەشار) (١٩٣٣)، ئینجا لە پاش مردنی هیندنبورگ بوو بە دیکتاتۆر (١٩٣٤).

هیتلەر ڕژێمێکی میلتاری ـ فاشستی (عەسکەریتاری ـ تۆتالیتاری) بەناوی سڤیلیزاسیۆنی نەژادی جەرمەنی دامەزراند بە هیوای ئەوەی هەموو گێتی داگیر بکا.

بەرنامەو پیلانەکانی بۆ ئەم ئامانجە بتەو و ژیرانە بوو، ڕاوێژکەرەکانی شارەزاو بلیمەت بوون، لە سەرەتادا توانی هەندێ کەس بخەڵەتێنێ، بەتایبەتی دوژمنی هەرە گەورەی رووسی سۆسیالیست، بۆ ئەم ئامانجە پەیمانیلەگەڵ دا بەست بۆ ئەوەی دوژمنە بچووکەکەی (دەوڵەتە پێشکەوتووە بۆرجوازییەکانی ڕۆژئاوای ئەوروپا) لە پێشانا لەناوببا، ئینجا بگەڕێتەوە سەر دوژمنە گەورەکە نوێنەرانی کۆمۆنیزم (یەکێتی سۆڤیەت).

## گوریس کێشانێ

جموجۆڵی دیبلۆماسی ـ سیاسیو کردەوەکانی ئەڵمان بەتایبەتی لە ساڵی ١٩٣٩ بۆنی جەنگیان لێ دەهات، هەموو شتێك ئاواز و دەنگی جەنگ بوو، پێش ئەوەی بەرەسمی جاری جەنگ بدرێ (١ی ئەیلوولی ١٩٣٩) لە لایەن ئەڵمانەوە، ڕووداوە هەرە گرنگەکانی پێش جەنگ گەلێ شتی نهێنیمان بۆ روون دەکەنەوە

- لە ١٥ی مارت هیتلەر چیکۆسلۆڤاکیای داگیر کرد.
- لە ٧ی نیسان مۆسۆلینی ئەلبانیای داگیر کرد.
- لە ٢٢ی مایس پەیمانێکی عەسکەری لە نێوان ئەڵمانیاو ئیتالیا بەسترا (هیتلەر ـ مۆسۆلینی).
- لە ٢٢ی ئاغستۆس پەیمانێك لە نێوان ئەڵمانیاو سۆڤیەت بەسترا (هیتلەر ـ ستالین).

لەپاش مۆرکردنی پەیمانی ئەڵەمان و سۆڤیەت بە ١٠ ڕۆژ جەنگ دەستی پێکرد بە هێرشی هیتلەر بۆ سەر پۆڵۆنیا، لەپاش دوو ڕۆژ (٣ی ئەیلوولی ١٩٣٩) بەریتانیاو فەرەنسا جاری جەنگیان دا لە دژی ئەڵمانیا.

بەم جۆرە جەنگ کەوتە نێوان بەرەی دیکتاتۆری ـ فاشیزم و بەرەی لیبرالی ـ دیمۆکراتی ـ بۆرجوازی، بێگومان بەرەی سۆڤیەتی مارکسی ـ سۆسیالیست خۆشی خۆشی بوو، سەیری جەنگی نێوان هەردوو دوژمنی دەکرد! ئاگرە سوورە لە خۆم دوورە! بەڵام ئاخۆ دەبێ لەو ڕۆژەدا ئەم بەرەیە بیریان نەکردبێتەوە کە ئەوان دوژمنی ڕاستەقینەی هیتلەرن؟! چار نییە دەبێ ئەوانیش بەرکەون چونکە هەر لە بنچ دا جەنگەکە بۆ لەناوبردنی ئەوان پێش خەڵکی تر دامەزرێنرا بوو. وابوو هێشتا دوو ساڵ بەسەر جەنگ دا تێپەری نەکردبوو هیتلەر «کردەوەی بارباڕۆس»ی خستە کار و لە ٢٢ی حوزەیرانی ١٩٤١ هێرشی بردە سەر رووسیا و هەمووولاتی سۆڤیەت.

## یەك دیاردە، ناوی زۆر

جەنگی دووەمی گێتی، جەنگی ئەمپریالیستی، جەنگی نیشتمانیی مەزن، جەنگی رزگارکردنی

مرۆڤایەتی. ئەمانە هەموویان ناوی جەنگەکە بوون، هەر یەکەیان لە دەستەو دایەرەیێکەوە دەنگ و ئاوازیان بڵاو دەبووەوە.
سۆڤیەتەکان «جەنگی ئەمپریالیستی» یان بە «جەنگی دووەمی گێتی» دەووت، لە سەرەتای دەست پێ کردنیـەوە تا ڕۆژی هێرشی هیتلەر بۆسـەر خاك و نەتـەوەکـانیـان، ناویشی هەر وا مایەوە لە ئەدەبیاتیان دا، بەڵام پاش «کردەوەی باربارۆس» ناوی نرا «جەنگی نیشتمانیی مەزن» (١٩٤١ ـ ١٩٤٥). هەرچی ئەڵمانیای هیتلەریش بوو جەنگەکەی بە جەنگی ڕزگار کردنی مرۆڤایەتی لە قەڵەم دەدا، بەمانای ئەوەی جوگرافیا دەبێ بە ئەڵمانیا، مرۆڤ دەبێ بە ئەڵمان، پایتەخت دەبێ بە بەرلین.

ئەنجامی جەنگ ئەوەی ئاشکرا کرد کە مرۆڤی ژیر دەیتوانی بیر لەوە بکاتەوە کە ڕۆژی لە ڕۆژان ئینگلیـزو ئەمەریکیو فرەنسیو ڕووسی دەچنە ناو بەرلینەوە، چارەنووسیش هەر ئەمە بوو، بەڵام نەیدەتووانی بیر لەوە بکاتەوە کە ڕۆژی لە ڕۆژان ئینگلیزو ئەمەریکیو فەرەنسیو ئەڵمان دەچنە ناو مۆسکۆوە، چونکە سۆسیالیزم و کاپیتالیزمی لیبرالی دەتوانن پێکەوە هەڵبکەن و دەبێ پێکەوە بژین، بەڵام فاشیزم لەگەڵ هیچ یەکێکیان هەڵی نەدەکرد.

## گۆتفرید یۆهانیس میوللەر

گوتفـریـد یۆهانیس میوللەر ئەفسەرێکی ئەڵمان بو، هۆگری ئایین بوو، باوەری گاووری دڵ و دەرونی داگیر کردبوو، لە هەموو تەنگانەیێك دا دەستی پارانەوەی بەرز دەکردەوەو موناجاتی لەگەڵ خودادا دەکرد و یامەتیی لێ دەخواست میوللەر نازی نەبوو، بەڵام بۆ چاکەی ئەڵمانیا سلی لە هیچ شتێك نەدەکردەوەو دەچووە ناو هەموو تەنگانەیێکەوە.
میـوللەر لە پێش جەنـگی دووەمـــەوە مەیلێکی زۆری بووە بۆ بینینی زەوییـە پیرۆزەکـان (فـەلەستین)و شارە ئەفسانەیی یەکە (بەغدا) و هەرێمە ڕەنگینەکان (کوردستان)، هەر بۆ ئەم ئامانجە کە هێشتا لاوێکی تازە پێ گەیشتوو بووە بە پایسکل گەشتی ئەو ناوچە دڵگیرانەی کردووە. لە پاش گەڕانەوەی بۆ نیشتمانی خۆی لە ساڵی ١٩٣٧ کتێبێکی بە ئەڵمانی بە ناوی «خۆ کوتانە ناو کوردستانی داخراو»(٣)ەوە بڵاو کردەوە.
میوللەر ناوچەکانی کوردستانی عیراق گەرا بوو، پەیوەندیی لەگەڵ گەورەی کورد شێخ مەحموود پەیدا کردبوو، خۆشەویستیی دێرێنی بەرامبەر بە کوردو لە نزیکەوە ناسینی کوردو وڵاتەکەیان، ئەمە هەموو بووە هۆی ئەوەی ببێتە پسپۆری ڕاوێژکەری مەسەلەی کورد لەلای دەسەڵاتی ئەڵمان. بۆیە لە ماوەی جەنگی دووەم دا کرا بووە بەڕێوەبەری یەکێ لە مەڵبەندی خەفیەیی ئەڵمان لە شاری ئەستەمووڵ.
لە ساڵی ١٩٤٢ کە ئەو مەڵبـەنـدەی بەرێـوە دەبـرد لە ئەستـەمووڵ، لە یەکێ لە گەرانەوەو سەردانەکانی ئەڵمانیای ئەوەی زانی بوو کە کەمی سووتەمەنی (پیترۆل) تەنگوچەڵەمە بۆ سوپای ئەڵمـانیـا دروست دەکـا، لە بەر ئەوە پێشنیاری بۆ فیلد مارشال کایتل فەرمانبەری سوپای ئەو

سەردەمەو سەرۆکی گشتیی هێزە چەکدارەکانی ئەڵمانیا کر دبوو کە هەوڵ بدرێ بیرەکانی نەوتی عیراق داگیر بکرێو ئینگلیزی لێ دەربکرێ بۆ هێنانە دی ئەم ئامانجە پێویستیی بە کوردێك دەبێ وەشاوە بێ، بۆ ئەوەی ئەم ئاواتە لەگەڵ ئەودا بگەیێنێتە ئەنجام.

## ڕەمزی نافیع ڕەشید

ڕەمـزی نافیـع رەشیـد لە ساڵی ١٩١٧ لە هەولێر لە دایـك بووە. لە کۆشی دایـك و باوکێکی دەوڵەمەندو دەست ڕۆیشتوو و تێر پەروەردە کراوە. قوتابخانەی سەرەتاییو ناوەندی لە هەولێر تەواو کردووە، ئیتر لەبەر نەبوونی قوتابخانەی ئامادەیی لە هەولێر، رووی کردۆتە کەرکووك و ساڵێکی خوێنـدنی لەوێ بردۆتــە سەر، لە بابەت هەڵسوکەوتی ڕەمزی لەو ماوەیەی کە لە کەرکووك بووە، هاوڕێی بەڕێز دوکتۆر موکەڕرەم تاڵەبانی پێی ووتم: «پێش حەرەکاتی رەشید عالی، رەمزی لە کەرکووك بوو، لەو کاتەدا ئەندامی پارتی هیوا بوو، لە قوتابخانە زوو زوو یەکتریمان دەدیو رەمزی کوڕێکی باش بوو، کورد ایـەتی دەکرد، زۆر لە کەرکووك نەمایەوەو دەرچوو. لە پاشانا کە لەگەڵ ئەڵمانەکانا ڕێك کەوت، پارتی هیوا ئاگاداری ئەو پێوەندیيە نەبوو، چونکە ئەڵمانەکان بۆ مەبەستی دەست تێوەردان لە مەسەلەی کورد پێوەندیان لەگەڵ پارتی هیوا نەبەستووە.»[١]

لە کەرکووکەوە هەر بۆ ئامانجی تەواو کردنی خوێندن دەچێتە بەغدا و ساڵی خوێندنی ١٩٣٧ ـ ١٩٣٨ لە پۆلی پێنجـەمی زانستی (علمي) بووە لە قوتابخانەی ئامادەیی ناوەندی (الاعدادية المركزية)ی بەغدا.

لەساڵی ١٩٣٩ روو دەکاتە بێرووت لە زانستگای ئەمەریکی دادەمەزرێ، دوو ساڵی خوێندن لەوێ تەواو دەکا و پلەی (فرێشمان) وەردەگرێ. لە پاشانا هەر بۆ تەواو کردنی خوێندن دەچێتە ئەستەموول و دەبێ بە قوتابیی کۆلیجی ڕۆبەرت (ڕۆبەرت کۆلیج). لەساڵی ١٩٤٢ کە ڕەمزی لە ئەستەموول دەبێ بە تایبەتی لە نیوەی دووەمی ئەو ساڵە ئیتر گۆتفرید میوللەر خەریك دەبێ بۆ خۆ ئامادە کردن لە پێناوی هێنانە دی «کردەوەی مامۆنت». بەم جۆرە ڕەمزی لەگەڵ میوللەرو تاقمەکەی کە دوو کەسی تریش بوون روو دەکەنە ئەڵمانیا و لە بەرلین خەریکی مەشق کردن دەبن.

پێـوەنـدیی میـوللەر و ڕەمزی لە چووار چێوەی یەکتری ناسین دەچێتە دەرەوە و دەبێ بە دۆستـایـەتی، ئنجـا هاوڕێیەتی و برادەری، لەوەش ڕەت دەکا بۆ برایەتی و تا دەگاتە رادەی خۆشەویستی، هەر لەبەر ئەوەشە تا ئێستا یادی ڕۆژانی میوللەر لەگەڵ ڕەمزی یادگارێکی بە نرخ و بێ وێنەیە لەلای، وەکو لە سەرانسەری گێڕانەوەکانی دا دەردەکەوێ.

لە هاوینی ساڵی ١٩٤٣ تیپـە چووار کەسیيـەکـەی «کـردەوەی مامۆنت» بە شەو خۆیان بە پەراشووت دەهاوێنە خووارێ، لە ناوچەیێکی سێ گۆشەی سنووری عیراق ـ تورکی ـ سووری لای رۆژهەڵاتی رووباری دیجلە دەکەونە سەر زەوی. لەوێوە بە قاچاغیو بە سوواری پاسە تەختەکانی ئەو سەردەمــەو وولاغ و کاروان دەگەنە مووسڵ بەری نینەوا (یوونس پێغەمبەر)، ئنجا قایەغی گوێـرو لە پاشانا هەولێر، لەوێوە بەرەو ژوور لە گوندی بێوکە دەنیشنەوە. ئەڵمانەکان دەگیرێن و ڕەمزیش لە هەولێر خۆی دەدا بە دەستەوە.

له گرتووخانەی هەولێرەوە دەبرێ بۆ مووسل، لەوێوە بۆ بەغدا، ئنجا بۆ قاهیرەو دووبارە دەیهێننەوە بەغدا. لە ساڵی ١٩٤٥ لەگەڵ کۆتایی جەنگ دەدرێ بە دادگای عورف و بریاری لەسێدارەدانی بۆ دەردەچێ. لە پاشانا بریارەکە دەکرێ بە هەتا هەتایە (٢٠ ساڵ)، لە بەندیخانەی ناوەندی بەغداو لە قەلعەی دووەم بەند دەکرێ.

زۆری پێ ناچی بریاری ئازاد کردنی دەردەچێ بە هۆی راپۆرتێکی پزیشکی «لەبەر تووش بوونی بە نەخۆشی‌یێکی کوشندە». بەراستیش رەمزی لە ژێر زەبری کارەسات و ئەشکەنجەو دەردی دەروونی مێشکی سووك بوو و تێك چوو بوو، هەر لەبەر ئەوەش بوو لە پاش دەرچوونی لە بەندیخانە لەساڵی ١٩٤٧ لە هەولێر سەری نایەوە هەتا هەتایە پاش ئەوەی ئەفسانەییکی لە دووای خۆی بەجێ هێشت بۆ نەتەوەکەی.

## کردەوەی مامۆنت

تیپی بە ئەنجام گەیاندنی « کردەوەی مامۆنت » لە چووار کەس پێك هات بوو سەرۆك و بەرێوەبەریان میوللەر بوو، دوو کەسی تریشی لە گەلا بوو، یەکەمیان هۆفمان ناوێك بوو، ئەمەیان نازی بوو، ئاگاداری رۆژهەلاتناسی بوو، چونکە بۆ ماوەیێك مامۆستا بووە لە زانستگای تاران دووەمیان کۆنێچین یا (کانێچین) لە بنجدا بە نەژاد پۆلۆنی بووە. چووارەمی تیپەکە رەمزی بوو، ئەمە دەمراست و رێبەریان بووە چونکە کوری هەرێمەکە بووە و بەبێ ئەو کارو کردەوەیان نەدەچووە سەر.

لە پاش مەشقی پراکتیکی لە خۆ فرەدان بە پەراشووت و سیلاح شۆری و فێر بوونی دەستوورە بنچینەیی‌یەکانی خەفیەیی لە شاری بەرلین و هەرێمەکانی سینگەربێرگ و بۆدێنتەل و وینەرنیوشتادت ئامادەی بەجێ هێنانی «کردەوەی مامۆنت» دەبن، پێویستە ئەوەش بۆ راستی بووترێ کە پیلانەکەیان لە بنجدا بە جۆرێك رێك دەخەن کە لە بەهارا دەست پێ بکەن، بەلام دووا دەکەون بەسەر ترسی گەرما زاڵ نابن و کردەوەکەیان دەکەوێتە هاوین ، دیارە ئەمەش گەلێ تەنگوچەڵەمەی لاوەکی یان بۆ دروست دەکا.

ساعەتی سفریان لەو کاتەدا دەست پێ دەکا کە یەکێ لە فرۆکەکانی «کۆندۆر» دەکەوێتە ئاسمانەوە بەسەر قرم و زەریای رەش خۆی دەکوتێتە ناوچەکانی سەرووی کوردستانەوە، لە نجەیێکیش بەسەر شاری مووسڵ دا دەکا، گلۆپە زۆرەکانی شار کە بەڵگەی گەورەیی شارەکە بوو سەریان لێ دەشێوێنێ و میوللەر هەست دەکا کە ئاسمانەکە ئاسمانی ئەو جێیە نی‌یە کە پێویستە خۆیان بە پەراشووت فرێ بدەنە خوارەوە، بۆیە دەکەوێتە گومانەوە. مەنزڵی خۆ فرێ دان بەپەراشووت دەشتی بیتوێن دەبێ، چونکە نزیکترەو بە ئاسانیش دەتوانن بگەنە هەولێر، بەلام فرۆکەوان جێ‌یێکی تریان بۆ دەست نیشان دەکاو بە بیتوێنی دەزانن هەر چوار ئەندامانی تیپەکە و کەلوپەلیان کە لەناو باووڵ بووە بە پەراشووت دێنە خوارەوە بۆ سەر زەوی. هێشتا بە ئاسمانەوە هەڵواسرا بوون ونەگەیشتبوونە سەر ئەرز لەوکاتەی کە میوللەر لە ژێرەوە چاوی بە رووبارێکی گەورە (دیجلە) دەکەوێ گومانەکەی لێ دەبێ بەراست و دەگاتە ئەوەی کە هەڵەیێك رووی داوە.

ئەمەو کە چاویشی بە ڕووباری خوارەوە دەکەوی مەترسیییکی تریشی بۆ پەیدا دەبێ خوانەخواستە لەباتی سەر زەوی بکەونە ناو ئاوەوە. ڕەنگە خۆیان بەمەلە ڕزگارییان ببێ بەڵام ئەگەر کەلوپەلەکانیان لە ناو ئاو نیشتەوە !

ئەو ناوچەیەی کە لێی کەوتنە سەر زەوی «فلفیل» ی پێ دەڵێن، کەوتۆتە ناو سێ گۆشەی سنووری عیراقی - تورکی - سووری لای ڕۆژهەلاتی ڕووباری دیجلە. بەپێی جلوبەرگی دەشتەکییانی ئەوێ کە زۆربەیان تەیاری بوون ناوچەکە دەناسنەوە ئیتر بە پاسەتەختەکانی دەوروبەری جەنگ خۆیان دەگەیێننە نزیك مووسڵ، دیوی نینەوا (یونس پێغەمبەر) ڕەمزی دەبوو لە ڕووبار بپەڕێتەوە بۆ ناو شارو هانا بەرێتە بەریەکی لە خزمەکانی باوکی لە مووسڵ، لەبەر ئەوەی پشکنینەوەییکی زۆر لەسەر پردی مووسڵ هەبوو تاقمەکە لە چایخانەییك بەجێ دێڵێ و خۆی دەچێتە ماڵی جەلال یاوەر (لەحەفتاکانا مردووە) کە کوڕی خەزووری باوکی ڕەمزی بووە[5] بەڵام ڕەمزی بە نائومێدی دەگەڕێتەوە لای هاوڕێکانی و دەڵێ خزمەکانی هیچان بۆ ناکرێ، هەر لەوانیشەوە ئەوە دەزانێ کە مەسەلەیان لەناو خەڵکی ئاشکرا بووە و میری و ئینگلیز بە دوایانا دەگەڕێن[6]

ڕووبەڕووی ئەوێ بەجێ دێڵن بەرەو ڕۆژهەلاتی مووسڵ، واتە ڕووەو هەولێر بە ڕێگەی (وادی شۆر) کە ناوچەییکی قامیشەلان و پڕ لە دارو دەوەن بووە دەچنە گوندی «بازیوە»، ئەمە گوندی شەبەکەکانە. لەوێ پیرەمێردێك ڕەمزی دەناسێتەوە بەهۆی ناوبانگی باوکیەوە، بۆیە زۆریان ڕێز لێ دەنێ و میواندارییان دەکا. بەم جۆرە بۆ مەبەسی ڕزگارکردنیان لەسەر داوای تیپەکەو بەکیسەی ئەوان چەند ئیسترێك بەکرێ دەگرێ، ماوەییك لەگەڵیان دەڕوا، لەبەر ماندوویی کە دەگەنە لای کەندەلانێك لەوێ دەحەسێنەوەو خەویان لێ دەکەوێ ئیتر کابرای شەبەك ئەمە دەزانێ، گەشتەکەیان پێ تەواو ناکا و بەجێیان دەهێڵێ ، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا ئەندامانی تاقمەکە ئەم کردەوەیە بە کارێکی خراپ حسێب ناکەن چونکە هیچ زیانێکی پێ نەگەیاندن لەو کاتەی کە دەیتوانی بە گرتنیان بدا.

تاقمەکە بە تەنیا دەکەونە ڕێ و لە نزیك کەلەکی یاسین ئاغا لەڕێ لا دەدەن بەرەو خووار بۆ لای قایەغەکەی گوێر. بەقایەغ لەزێی بادینان (زێی گەورە - زێی کەلەکی یاسین ئاغا) دەپەڕنەوە دیوی هەولێر، ئێوارە وەختێك دەگەنە گوندی تەرجان، ئەمە گوندی ماڵی ڕەمزی. بوو ئەگەرچی تادەهات مەترسییان زیاتر دەبوو، بە تایبەتی کە لەشارو ئاوەدانی نزێك دەبوونەوە، بەڵام بە هۆی خەڵکی ئەو ناوچانە کە ناسیاو بوون بزووتنەوەو کاری خۆ ڕزگار کردنیان ئاسانتر دەبوو. بەهۆی ئەو ناسیاوانەوە تیپەکە بە سوواری وولاغ دەگەنە هەولێرو ڕوو دەکەنە ماڵی عەتائوڵڵا ئاغا[7]. لەوێ میوللەر و تیپەکەی چاویان بە نافیع ئاغا ناکەوێ، لەباتی ئەو قەرەنی نافیع (١٩١٢ - ١٩٦٩)ی براگەورەی ڕەمزی، هەموو شتێك لە میوللەر دەگەیێنێ. ئەندامانی تیپەکە لەتەك یەکەوە وەستا بوون، ڕەمزی دەستی ڕێزی خستبووە سەرسینگی، سوعاد نافیع (١٩٢٩) ی برا بچووکی و حاجی عەلی قاوەچی[8] بزێو بوون هەڵسوکەوتیان ئەوەی دەردەخست کە لایەنگری ئەڵمانن. ئیتر قەرەنی بەناوی باوکییەوە دەڵێ: ئێمە هیچمان پێ ناکرێ بۆ ئێوە، باب و باپیرانمان بە ناحەزی ئینگلیز لەقەڵەم دراوون، گەلێ زیانمان لێ کەوتوو لەم ڕووەوە ئیتر ئێوە خۆتان چارەسەری خۆتان

بکەن، چونکە ئێمە هیچمان بۆ ناکرێ.

بەڵام ڕەمــزی مەردانــە پشتیــان تێ ناکــا، چونکە بەڕاستی چارەنووسی خۆیبە چارەنووسی ئەوانەوە بەستبووەوە ئیتر لەبەر ئەوەی ئەو ئامانجەی بۆی هاتبوون لەم هەڵویستەدا زیندە بەچاڵ کرا، پیلانی میوللەر ئەوە بوو یەکێ لە ئەندامانی تیپەکە بگەیێنێتە سەر سنووری تورکیا، لەوێ خۆی بدا بەدەستــەوەو بگیرێ و بخرێتە گرتووخانەوە، بەم ڕەنگە دەتوانن بە هۆی دەسەڵاتی تورکەوە قونسوڵی ئەڵمان لەوێ ئاگادار بکەن، بەمە پێوەندی لەگەڵ دەوڵەتەکەیان پەیدا دەکەنەوە.

بۆ هێنانە دی ئەم ئامانجەو بەهۆی ڕەمزی‌یەوە لە هەولێر دەردەچن بۆ گوندی «بێوکە» ی نوورەدین ئاغای مامی ڕەمزی. لێرە خورشید نووردین (١٩١٧ ـ ١٩٨٧) ئامۆزاو هاوڕێی ڕەمزی یارمەتیان دەدا ئیتر بۆ مەبەسی گەیشتنەسەر سنووری تورکیا لەگەڵ قاچاغچیەکان دەگەڕێنەوە گوندی بێوکە و ڕێبەری‌یان دەکەن تا سنووری تورکیا. ڕەنگە هەڵەی هەرە گەورەی میوللەر ئەوە بووبێ کە لە پێشەوە هەموو کرێکەی دابووە قاچاغچیەکان، ئیتر ئەوان کرێکەی میوللەریان خستە گیرفانیانەوە و لە هەولێر جێگەی خۆشاردنەوەی ئەڵمانەکانیان بۆ پۆلیسخانە ئاشکراکرد، بە ئومێدی ئەوەی هەزار دینار(بۆ هەر سەری ٢٥٠ دنیار)مکەی پاداشی میری بۆ گرتنی تاقمی «کردەوەی مامۆنت» مسۆگەر بکەن.

ئەفسەری پۆلیس بەدیع محەمەد نەزهەت (١٩١٠ ـ ١٩٦٠) و پیاوەکانی دێنە گوندی بێوکەو گەمارووی ئەو جێ‌یە پڕ لە دارو دەوەنە دەدەن، هەرسێ ئەڵمانەکان دەگرن.

لەوکاتەدا ڕەمزی لەوێ نابێ. هەر بۆ ئامانجی لێکۆڵینەوەو ترساندن و ئاسان کردنی گرتنی ڕەمزی هەموو کەس و کارو مامەکانی دەگیرێن. تەنیا نوورەدین ئاغا ئازاد کرا بوو بۆ ئەوەی ڕەمزی بگرێو بیدا بە میری. ئیتر لەو کاتەی کە ڕەمزی دەچێتە لای نوورەدین ئاغا بۆ ئەوەی ڕزگاری بکا بۆی ئاشکرا دەبێ کە ئەڵمانەکان گیراوون و هەموو کەس و کاری خۆشی یا دەست بەسەر کراون، یا خراونــەتــە گرتــووخــانــەو بە قسەی نوورەدین ئاغا پێویستە خۆی بدا بە دەستەوەو هەموو هەوڵێکیشی بۆ دەدەن کە ئازاری پێ نەگا. بەم جۆرە خۆی دەدا بە دەستەوەو لە گرتووخانەی هەولێر دەگاتەوە هاوڕێ ئەڵمانەکانی.

وەکو لەم گێڕانەوەیە بۆمان دەردەکەوێ «کردەوەی مامۆنت» بە مردوویی لە دایك بوو، چونکە میوللەرو ڕەمزی هەردووکیان تێڕوانینیان بۆ ناوەرۆك و حەقیقەتی وەزعی کوردستان و ڕۆژ هەڵاتی ناوەڕاست و جمو جۆڵی سوپای سوێند خۆرەکان بە تایبەتی سوپای سوور (سوپای سۆڤیەت) ڕاست نەبوو. خۆ تاقی کردنەوەکەی ڕەشید عالی لە مێژ نەبوو ڕووی دابوو. میۆللەر تەنیا لەبەر ئەوەی کورد بەگشتی ئینگلیزی خۆش نەدەویست وای دەزانی قوربانی دەدا بۆ سەرکەوتنی ئەڵمان، بێ گومان پێوەندیی کۆنیش بە شێخ مەحمودەوەو ناحەزیی شێخ لەگەڵ ئینگلیز وای لێ کردبوو کە ئومێـدێکی زۆری بەو هەبێ، زیــاد لەسەر ئەم هەمووانە ڕەمزی لەڕووی دڵسۆزی و گیانی ڕاستــەقینــەی کوردایــەتی‌یــەوە دەسەڵاتی ماڵی باوکی و دایکی وا دەرخست بوو کە دەتوانن سوپایێك دروست بکەن بۆ پاڵپشتی ئەڵمان بۆ مەبەسی دەرکردنی ئینگلیز لە وڵات.

ئەمــە دیــارە بینــین و دیــاردەیێکی ڕاست نەبوو، چونکە نەك بنەماڵەی ڕەمزی بەڵکو هەموو

ئاغـاكانی ناو شاری هەولێر عەشرەتیان نی‌یە، لەگەڵ كرمانجەتی ناژین. خەڵكی گوندەكانیان لە هەموو ئەو خزم و كەس و كارانەش وە نەبێ لایەنگری ئەڵمان بووبن و رقیان لە ئینگلیز بووبێ، جگە لەوەی زۆر جار تەنگـوچـەڵەمەی نێوان بنەماڵە دەوڵەمەندەكان بوونەتە هۆی ئەوەی هەریەكێك بەلاییك دا رای بكێشێ.

لایـەنی ئینگلیـز زۆر بوون، لایـەنی توركیش هەبـوون، پێـوەندیی هەندێ بنەماڵەی كورد بە ئینگلیزەوە بە میرات لە باوكەوە بۆ كور دەمایەوە.

ئەوەی بەڵگەی ناراستیی بۆ چوونەكانی میوللەرو رەمزی‌یە قسەكانی قەرەنی نافیعە بە زمانی باوكیەوە كە بە دوو ووشە كۆتایی بە مەسەلەكە هێناو «كردەوەی مامۆنتَ» لە ماڵی عەتائوڵلا ئاغا لە هەولێر دوایی پی هات. ئەمە بووە هۆی ئەوەی ئیتر میوللەر بیر لە رزگاركردنی خۆی و ئەندامانی هەموو تیپەكە بكاتەوە.

رەنگە هی وا هەبێ بڵێ ئەگەر لە بیتوێن بهاتنایە خووارەوە، مەسەلە رێ‌یێكی تری دەگرت ، ئەمەش وا نیە، چونكە لەو سەردەمەدا نە خاڵوانی رەمزی، نە ماڵی باوكی، نە هیچ لاییكی تری كوردیش بۆیان دەكرا یارمەتیی ئەڵمان بدەن، چونكە ئەڵمان كەوتبووە لێژی‌یەوە، هەروەها لە ووزەو چاكەی چینایەتی سەرەك عەشرەت و دەوڵەمەندەكانی شارا نەبوو لە كوردستانا بەگژ ئینگلیزدا بچن. لە خووارووو ناوەراستی عیراق دا ئینگلیز بە هێز بوو، لە هەرێمە دراوسێكانی رۆژهەلات و رۆژئاوای عیراق دا (ئێران و سوریا و لبنان و ئوردون) سوێندخۆرەكان دەسەلاتیان هەبوو، توركیا لە دژی هەموو مافێكی كورد بوو، ئیتر ئەمە هەمووی تەگەرە بوو لەرێی داگیركردنی چاڵەكانی نەوتی عیراق.

تیپـەكـەی «كردەوەی مامۆنت» لە رۆژهەلاتەوە (موسڵ) روویان كردە هەولێر، مەسەلەكەیان ئاشكرا بوو بۆیە ناخۆشیان دی، ئەگەر لە بیتوێن بنشتنایەوەو بەبێ ناخۆشی و مەسەلەكەشیان ئاشكـرا نەبـووایـە یا دەبوو لە رێوە هانا بەرن بۆ خاڵوانی رەمزی پێم وایە ئەمانە هیچیان بۆ نەدەكردن، بەلام لە بەر ئەوەی لەگەڵ رەمزی بوون رەنگە هەبوو یاریدەیان بدەن و بیانگەیێننە سەر سنـووری توركیا، یا دەبوون بگەیشتنایە هەولێر قەرەنی نافیع هەر ئەو قسەیەی دەكرد ئەوەی كردی، بەلام ئەویش ئامادە دەبوو بیانگەیێنێتە هەر جێ‌یێكی میوللەر بیویستایە.

لەبـەر ئەوەی «كردەوەی مامۆنت» لە پلەی ئەو ئامانجە نەبوو كە بۆی دانرابوو (داگیركردنی چاڵەكانی نەوت و گەیاندنی كورد بە مافە نەتەوایەتی‌یەكانی) سەر نەكەوت.

رەنگـە هەر لەبەر ئەوەش بووبێ فەرماندەی سوپایی ئەڵمان لە سەرەتاوە بایەخێكی ئەو تۆی نەدایە تیپەكەی «كردەوەی مامۆنت» بەلام لەگەڵ ئەوەش دا «كردەوەی مامۆنت» جارێكی تریش ئەوە دەخاتە روو كە كوردستان بۆ سیاسەتی ئەڵمانیا گرنگ بوو، هەر لەبەر ئەوەش نەوەكو تەنیا لە جەنگی دووەمی گێتی‌دا دەستی لە مەسەلەی كورد وەرداوە، بەڵكو لەپێش جەنگی یەكەمەوە، یا راستتر لە دووا سالانی سەدەی نۆزدەمەوە ئەڵمان خەریكی ناوچە كوردی‌یەكانی دەوڵەتی قاجاری و عوسمانی بووە. دیارە كۆششە خوێندەواری و رۆشنبیری‌یەكانی ئۆسكارمانی زانا بەشێك بووە لەم ئامانجەی ئەڵمان.

# ڕەمزی و من

کە باس لە خۆم دەکەم مەبەسم شەخسی خۆم نییە، بەڵکو هەموو ئەو نەوەیەی لە تەمەنی من بوون و قوتابیی قوتابخانە بوون و لە ڕووی نیشتمانپەروەریو کوردایەتییەوە بیرو باوەڕیان لە یەکترییەوە نزیك بوو. من لێرەدا ڕەنگدانەوەی دڵ و دەروونی هەموو ئەو کەسانە دەخەمە ڕوو.

کە هەواڵی ڕەمزیو پەراشووت و سوپای ئەڵمان بڵاو بووەوە، تازە تاقی کردنەوەی بە کالۆریای پۆلی شەشەمی سەرەتایمان دا بوو یا دەدا. هەندێکمان دڵیان زور بەوە خۆش بوو کە پاداش و دیاری و سەوقاتی سەرکەوتن و دەرچوونمان لە قوتابخانەی سەرەتاییەوە بۆ قوتابخانەی ناوەندی چوونە ریزی بەچکەشێرانی هیوایە.

ئەحمەدو خالیس و من بووین، ئەنوەر بە قورئان و خەنجەروشتی تر سوێندی داین، ئنجا عەلی بوو بە ڕێبەر و فێرکەرمان. ئێمە کەناوی ڕەمزیمان بیست نەماندەزانی بەڕاستی ئەندامی هیوایە،بەڵام لەوە....

موچرکی خۆشەویستی بە لەشمانا دەهات، هەندێکمان حەزی دەکرد لەگەڵی بووایە. ئاخۆ ئێمەش کە گەورە ببین بۆمان ڕێك دەکەوێ لەسەر شانۆی ژیان دا دەورێکی وەکو ڕەمزی بنوێنین! ڕەمزی بۆ ئێمە کاکە بوو ئەگەرچی زۆریشمان چاوی پێ نەکەوت بوو. بەڵام من بەش بە حاڵی خۆم لە هاوینی ساڵی ١٩٤٣ وە تا ئێستا ئەدگاری دیاری ڕەمزی لە سوعادی برای و ئامۆزاکانی دەبینم، ئەوانەی لەگەڵ ئێمە هاوتەمەن بوون لە قوتابخانەی سەرەتایی، هەموومان هاوڕێی خوێندن و قوتابخانە بووین، بەڵام ئەدگاری ناوەوە و شارراوەی ڕەمزی هەموو نیشتمانپەروەرو کورد پەروەرێك لە ناخی دڵ و دەروونی خۆیدا دەیبینێ.

مەسەلەی ئازاییو قارەمانیەتی و نیشتمانپەروەری ڕەمزی شتێك بوو لە بیر نەدەچوونەوە. زانیاری لە بارەی «کردەوەی مامۆنت»ەوە هەر ئەو زانیارییانە بوون کە بنەماڵەی ڕەمزی دەیانزانی یا خەڵکی گوندی بێوکەو دەورو بەری ئاگاداری بوون. باوەڕیش ناکەین خەڵکی تا دەگاتە خزمەکانی ڕەمزیش هەموویان لەگەڵ کردەوەی ڕەمزی بووبن و مەسەلەکەیان بە هی خۆیان زانیبێ، بەڵکو لەوە دڵنیاین کە بەشێکی زۆر لەوانەی کە بە هۆی ڕەمزییەوە زیانیان پێ گەیشت بوو، نەوەکو تەنیا خۆیان دوورە پەرێز دەگرت بەڵکو خۆیان لە خزمایەتی و هاوڕێیەتی ڕەمزیش دوور دەخستەوە. بۆیە مەسەلەکە لای خۆمان کپ بوو، پەردەی خرابووە سەر تا چەند ساڵێك لەمەو بەر.

لەساڵی ١٩٥٩ کە کتێبەکەی میوللەر بە ئەڵمانی بڵاو کرایەوە، یەکسەر هەواڵی بەر گوێم کەوت. لە سەرەتای شەستەکاندا بۆ خوێندن ڕووم کردە یەکێتیی سۆڤیەت (مۆسکۆ و لینینگراد) لە یەکەم گەشتی شاری بەرلینی ڕۆژئاوا (هاوینی ١٩٦٠) دەنگوباسی ئەم کتێبەم لە خوێندکارە کوردەکانمان پرسی، گەلێك لە ناوەرۆکی هەر لەو کاتە بۆم ڕوون بووەوە. لەپاشانا کە دوکتۆر عەبدلقادر غەریب بووبە قوتابی لە بەرلینی ڕۆژئاواو بە ناوی ئەوەی کە هەولێرییە هەر لە سەرەتاوە بایەخی زۆری بەم مەسەلەیە دابوو، کتێبەکەی دەست خست و ئاشنایەتیو دۆستایەتیشی لەگەڵ میوللەردا پەیدا کرد. هەر لەو سەردەمەوە چەند جارێك قسەمان لەم بابەتەوە کرد کە. ئەو کتێبە

بگۆڕینە سەر زمانی کوردی یا عەرەبی، دیار بوو لە نووسینی کوردیو عەرەبییەکەی رازی نەبوو، نەشی دەویست لە پێداچوونەوەیدا من ماندوو بکا. بێ گومان زۆریش حەزی دەکرد کە کتێبەکە بکرێ بە کوردی.

ئیتر مەسەلەکە مایەوە تا ساڵی ١٩٨٠ کە چاپی ئینگلیزی کتێبەکە دەرچوو، دوکتۆر عەبدلقادر غەریب زوو زوو دانەیێکی پێشکەش کردم. ئەمە لە پاڵەوە ئەوەی دەگەیاند کە چاپە ئینگلیزییە کە زیاتر رێگە خۆش دەکا بۆ گۆڕینی بۆ زمانی کوردی.

بەڵام دوورخستنەوە لە زانستگا ی بەغدا (١٩٨١) و لە دووا جاردا دوور کەوتنەوە لە وولاتیش (١٩٨٣ ـ ١٩٨٨) رێگەی هێنانە دی ئەم پرۆژەیەی لێ گرتم. وا بوو لەو ماوەیەی کە لە دەرەوەی وولات بووم (زانستگـای عەننابە لە جەزائیر) میوللەر خۆی دانەیێکی لە چاپە ئینگلیزییەکە بۆ ناردم، ئەوەشی دەربڕی کە زۆر بەختیار دەبێ ئەگەر کتێبەکەی بە زمانی زگماکی رەمزی ببینێو ئامادەیە بۆ هەموو یارمەتییێك لە پێناوی گۆڕینی کتێبەکە بۆ زمانی کوردی.

هەر لەو سەردەمەدا بوو، بۆ یەکەمین جار کۆمەڵێك لە نووسەرانی کورد هەندێ ووتارو تێبینییان لە رۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکان دا بڵاوکردەوە. بەگشتی نووسینەکان دوو بابەت بوون، بەشێکیان زانیـارییـان لە نزیکـەوە تێـدا بوو، واتە هاورێو ناسیاوی رەمزی بـــوون، بەشەکـــەی تـــریـان لە

دوورەوەو لەرووی تیۆرییەوە لەژێر رۆشنایی ئیدیۆلۆجیەتێکی دیاری کراو تەماشای رەمزیو کردارەکەیان دەکرد لەبەر ئەمە ئەو بەشە بووبە دوو بیرورای جیاو پێچەوانەی یەکتری، وای لێ هات بەیەکەمیان بڵێ: «نەواسوێر»و بەدووەمیان بڵێ «نەوابێخوێ». ئیتر ئەم نووسینانە زیاتر هانیان دام کە بکەومە خۆ بۆ ئامادەکردنی کتێبەکەی میوللەر بەکوردی کەبێ گومان وەرامی گەلێ پرسیار دەداتـەوە، دەمێنێتـەوە سەر بیرورای خەڵکی لەبـابـەت هەڵویستی رەمزییەوە، ئەمەش دەبێ بەگیانێکی دیموکراتیانە وەربگیرێو هەموو کەسیش سەربەستە لەبیرورای خۆی ئێمەش بیرورای خۆمان هەیە.

لەپاش گەرانەوەم بۆ مەڵبەندی رووناکی لە هەولێر لە هەموو شتێك زیاتر دەستووبردم کرد بۆ ئامادەکردنی کتێبەکەی میوللەر بەکوردی. بەخت یار بوو و لاوێکی ژیرو تێگەیشتووی کوردیو ئینگلیزی زانی وەکو بەدران ئەحمەد حەبیب[٩] هەڵکەوت کە بتوانێ ئەم ئەرکە بەچاکی بگێنێتە ئەنجام.

بەدران کتێبەکەی گۆرییە سەر زمانی کوردی، پێداچوونەوە و بژارکردنی کەوتە ئەستۆی من جگە لەوە دەبوو پەراوێزو شیرازەشی بۆ بکەم، بێ گومان پێشەکیش شتێکی پێویست بوو، چونکە گەلێ لایەنی تری مەسەلەکە روون دەکاتەوە.

سەرچاوەو کەرەستەی پەراوێزو شیرازەو نووسینی پێشەکی زیندوو بوو، واتە قسەی سەر زمان و ئەزبەر بوو، لەپێشانا لە براو کەس و کارو نزیکەکانی رەمزی وەرگیرا.

ئنجـا دۆست و برادەران و ئەو کەسـانـەی ئاگـاداری رووداوەکـان بوون لەبەر ئەوە سەرچاوە نووسراوەکان (ئەو ووتارانەی لەسەر مەسەلەکە بڵاوکرابوونەوە) پشت گوێ خران، چونکە زۆریان

بیرو رای ئیدیۆلۆجی بوون، وەکو ئاشکراشە مەبەسی ئێمە ئەوە بوو کتێبەکەی میوللەز لە نهێنی دەربێنـین بۆ ئەمە تەنیا ئەو زانیاری‌یانە بخەینە روو کە پێوەندی‌یان بە روون کردنەوەو راست کردنـەوەی زانیاری‌یەکانی ناوکتێبەکە هەیە. ئێمە لەم پێشەکی‌یەدا کارمان بەسەر ئەوەدا نی‌یە تێبینی بەرامبەر ئەو بیرو رایانە دەربرین کە بۆ مەسەلەی رەمزی هاتوونەتە ناوەوە، واتە ئەوەی بەلای ئێمەوە راستە پەنجەی بۆ درێژ بکەین و ئەوەی هەڵەیە بەبەڵگەوە رەتی بکەینەوە، ئێمە ئەمە ناکەین بەڵام مافی ئەوەمان هەیە بیرورای تایبەتی خۆمان دەربرین بە هەموو سەربەستی‌یێکەوە، هەر کەسێکی هی تری هەیە، یاپێچەوانە، با بفەرموێ .. هیچ شتێکیش لە دیموکراتی و سەربەستی خۆشتر نی‌یە.

## رەمزی‌ی نیشتمانپەروەر

نزیکەی نیو سەدە بەسەر ئەو رووداوانەدا تێپەری کە میوللەرو رەمزی قارەمانی بوون، کەچی میوللەری ئەڵمان وا لەشاری شتوتگارت دەژی و هێشتاماوە، بەڵام رەمزی‌ی کورد زیاتر لە چل ساڵ لەمەوبەرەوە هاو وڵاتی شاری خامۆشانەی لە هەولێر. ئەم ماوە زۆرە هەموو کردەوە و رووداوێك لە نهێنی دەردێنی، بۆیە نابێ هیچ شتێك پەردەی بە سەردا بگیرێ و پێویستە هەموو شتێك بە ئاشکرا بووترێ.

ناوەروکی نیشتمـانپـەروەری شتێکی موتلەق و هەمیشەیی نی‌یە، بەپێی سەردەم و رۆژگار دەگـۆرێ، هەروا بە پێی هەڵوێست بەرامبەر بە کردەوەیێك خوێندەواری دەورو بەری جەنگی دووەم لە کۆمەڵی هەولێر ئەوانەی بیریان لە دووا رۆژی میللەت دەکردەوە دەبوو یا لایەنگری ئینگلیز بن، یاخۆیان سەر بە ئەڵمان بزانن، یا تورکچی بن، ئەوەی تورکچیەتی دەکرد پێوەندی بەم باسەی ئێمەوە نی‌یە هەرچی ئینگلیز بوو لەو سەردەمەدا ئێسکی قورس بوو، خراپەی لەگەڵ هەموو عیراق کردبوو نەوەکو تەنیا کورد، کاربەدەست و مووچەخۆری گەورەو بەشێك لە بۆرجوازی و دەرەبەگ و دەست رۆیشتووەکان کە سەر بە ئینگلیز بوون وەنەبێ لە کۆمەڵ دا رێزیان گیرا بێ، بێ گومان خۆشیان هەستیان بەمە دەکرد، بەرامبەر بەمە تەنیا نازی بوو کە هێزو ناوێکی هەبوو لە ناوچەکەدا و دژی ئینگلزیش بوو، خەڵکەکە خراپەیان لێ نەدی بوو، بەقووڵیش لە فەلسەفەی نازی نەگەیشت بوون ، ئاگاداری کردەوە ناهەموارەکانیان نەبوون کە هەموو مرۆڤایەتی تووشی بوو بوو، لەبەر ئەوە لایەنگری ئەڵمان بوون بە بەڵگەی نیشتمانپەروەری ئێمە هەموومان لە بیرمانە ئەو مندالانەی خۆیان بە نازی دادەنا گەلێ سەر بڵندتر بوون لەوانەی کەوا هەست دەکرا کە سەر بە ئینگلیزن، دەبێ ئەوەش بزانین کەلەو سەردەمەدا لە هەموو عیراق نازی قەدەغە بوو و دەستووری ئینگلیز لە ناوەوە بوو، خۆ هەموومان هەراکەی هەولێرمان لە بیرە کە سالح زەکی موتەسەریف بوو (١٩٤١) ، هەروەها لە بیرمـانــە هەر منـدالێکی باوکی پیـاوی ئینگلیز بووبێ چەند چاوشۆر بووە لەناوخەڵکی ئەمە هەمـووی بەڵگـەیێکی ئاشکراو گرنگ بوو کە ئەم خەڵکە ساکارە لە دژی ئینگلیز بوون. کەچی راستی‌یـەکـەی پێچەوانە بوو ، نەك لەو رۆژەوە کە هیتلەر دەسەڵاتی گرتە دەستی خۆی نازی دەردێکی کوشندە بوو تووشی هەموو مرۆڤایەتی بوو بوو، جەنگەکەش هەر لە سەرەتاوە جەنگێك بوو

له نێوان چاکه و خراپه ، هەر لە سەرەتاوە جەنگێکی نیشتمانی بوو بۆ هەموو مرۆڤێکی دژ بە نازی نەك لەو ڕۆژەوە کە هیتلەر هێرشی نامەردانەی بردە سەر وولاتی رووس و سۆڤیەت لەبەر ئەوەیە رەمزی نەوەکو لە سالانی ١٩٤٢ ـ ١٩٤٣، بەلکو لە سالی ١٩٤٠ یا لە سالی ١٩٤٥ یش هەروەزی لەگەل ئەلمان بکردایە بۆ ناوەرۆکی سیاسی ئەو ڕۆژە ڕاست بوو.

رەمزی یا دەبوو لایەنگری ئینگلیز بێ یا ئەلمان، نەدەبوو بە لایەنگری تورك چونکە بە کوردی پەروەردەکرا بوو، لە مالیان دا هەوایێکی دژ بە ئینگلیز هەبوو ، ئەمە بوو بوو بەهۆی ئەوەی مەیلی بۆ ئەلمان هەبێ، لەو کاتەدا ئەو مەیلە دروشمی نیشتمانپەروەری بوو، خۆ ئەگەر ببوایە بە ئینگلیز خوا ئێستاو ئەوساش بە چاوێکی تر تەماشا دەکرا. ئەمە لەلایێك لە لایێکی ترەوە رەمزی بەدووای هیـوا و ئامانجێك وێل بوو کە چەند جاران ئینگلیز بوو بوو بە تەگەرە بۆ هێنانە دی ئەو هیواو ئامـانجـانـە، بەلام وارێك نەکەوت بوو تاقی کردنەوەی لەم لایەنەوە لەگەل ئەلمان رێك بکەوێ. مەسـەلەکـە هیـچ نەبێ لە رووی تیـۆری‌یەوە ڕاست و رێك بوو بۆیە بەلگەی لە خۆ بووردن و قارەمانیەتی زیاتر لە رەمزی دا دەردەکەوێ.

بێ گومان پارتی هیوا دەورێکی بالای بووە لە بەهێز کردنی گیانیٌ نەتەوایەتی لە رەمزی ولاوی کوردی ئەو سەردەمە، ئەگەرچی هیوا تێوری‌یێکی تایبەتی نەکردبوو بە ئیدیۆلۆجیەتی خۆی، لەبەر ئەوە تەکتیکی لێل و شێواو و پڕ لە تەنگوچەلەمە بوو، بەلام لەبەر ئەوەی ستراتیجی هێنانە دی ئامـانجی نەتـەوایـەتی بوو بۆیـە وەك پارتی‌یێکی نیشتمـانپەروەر چووە ناو مێژووی سیاسی‌ی میللەتەوە. جا هەر ئەندامێك بەلگەیێکی هەبوو بۆ هەلبژاردنی ئەو بیرو باوەرەی بەراستی دەزانی بۆ دیار کردنی دووا ڕۆژی نەتەوە، لەبەر ئەوە ئەگەر رێگەیێکی ناراستیشی گرتبێ (گرتنی لایەنی نازی) هەر دەبێ بە نیشتمانپەروەر چونکە بەدلسۆزی‌یەوە وای زانیوە ئەم رێگەیە دەیگەیێنێتە ئامانج.

رەمزی بۆ هەولێر شۆرشێك بوو، شۆرشەکەی لە پێناسی خۆیەوە دەست پێ دەکا شانازی‌ی بە ووشەی «ئاغا» وە نەکردووە، بە «رەمزی نافیع رەشید» خۆی بە خەلکی ناساندووە. ئەگەرچی لە شار گەورە بووە، بەلام خوو و رەووشتی دەشتیشی پاراستووە. شارێکی دێرینی وەکو هەولێرە کۆنە، بەسەرهاتی مێژوو پەروەردەیێکی تایبەتی‌ی خەلکی شارەکەی کردووە، بەلام رەمزی ئەم بوونەی رووخاند، چونکە نیشتمانپەروەری‌یەکەی تەنیا بەقسەو لەرووی تیۆری‌یەوە نەبوو، بەلکو بە کردەوە و پراکتیکەوە چووە مەیدان. بەرلین و مەشقی پەراشووت وسیلاح شۆری ، بەبێ ڤیزە بە پەراشووت دابەزین لە وولاتی خۆی.

## سلاو و سوپاس

سلاوو سوپاسی گەرم و بێ پایانم:

بۆ گۆتفرید میوللەر، چونکە کتێبەکەی پێشکەش کردم، دلخوشی نواند بۆ گۆرینی کتێبەکە بۆ زمانی کوردی، نەوەکو هەر ئەوەندە بەلکو ئامادەی یارمەتی‌ی تریش بوو.

بۆ دوکتـۆر عەبـدولقـادر غەریب، چونکە هەر لەو ڕۆژەوە لە ئەلمانیا نیشتەوە عەودالی سەرو

ـسوز غی ڕەمزی بوو، ڕەمزی‌ی خۆش دەویست ، وەکو هاونیشتمان و هاوشاری، لە هەموو یەکتری ـینینێك هەر باسی ڕەمزی بووە، میوللەری پێ ناساندم و کتێبەکەی بۆ ناردم.

بۆ کاك سوعاد نافیعی برای ڕەمزی و هاورێی قوتابخانەی سەرەتاییم.

بۆ مامۆستا سەدار میرانی خزمی ڕەمزی.

بۆ مامۆستا عەلی مەحموود جوکلی خەڵکی گوندی ماڵی نوورەدین ئاغای مامی ڕەمزی.

چونکە گەلێ شتیان لە ژیانی ڕەمزی بۆم ڕوون کردەوە، هەموو تەنگوچەڵەمەیێکی لەبابەت مێژوو و جوگرافیا و بیۆگرافیا هەبوو بۆیان ئاسان کردم.

قەرزاری کاك سوعاد نافیعم بۆ هەموو وێنەکان.

سڵاو بۆ گیانی پاکی ڕەمزی

هەولێر ـ ڕووناکی

١ی تشرینی دووەمی ١٩٨٩

**مارف خەزنەدار**

**پەراوێزەکان**

**(١) بەڵام لە خواروو و ناوەڕاستی عێراق بیروباوەری مارکسیزم پەیدا بوو بووو باوەڕ پێکراویشی هەبوو، کەچی لە کوردستانی عێراق تەنیا ناوبانگی هەبوو و لایەنگری بە نەبوو حسێب دەکرا.**

**(٢) زۆربەی بەچکەشێرانی هیوا لەماوەی جەنگی دووەمی گیتی دا خۆیان بە نازی دەزانی.**

3- Muller G. , Einbruch ins Veschlossene Kurdistan «Philadelphian, Buch handlung August Fuhr, Reutingen, 1937, 143, S, 12 Taf

ناوی کتێبەکە لە ئەڵمانی‌یەوە لە کردەوەی د. جەمال نەبەزە، بڕوانە «کورتە مێژوویەکی کوردناسی لە ئەڵمانیادا»، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی دووەم، بەشی یەکەم، بەغدا ، ١٩٧٤، ل ٤٥٣.

(٤) ئەم زانیاری‌یانەم لە د. موکەڕەم تاڵەبانی وەرگرتووە لە ڕۆژی هەینی ٣٠ی حوزەیرانی ١٩٨٩ لە بەغدا.

(٥) ئەم جەلال یاوەرە خاڵی هەندێ لە کوڕەکانی نافیع ئاغایە، هەرچی دایکی ڕەفریشە لە میرانەکانی شەقڵاوەیە.

(٦) کاك سوعاد نافیع کە جەلال یاوەر خاڵیەتی مەسەلەکە بە جۆرێکی تر دەگێڕێتەوە، دەڵێ لەوکاتەی کە ڕەمزی چووەتە سۆراغی ماڵی جەلال یاوەری کردووە ، لەو دەمەدا هەموو کوڕەکانی ڕەشید ئاغا تێیدا دەژیان لەوانە نافیع ئاغای باوکی ڕەفریش بەناوی ماڵی عەتائوڵڵا ئاغای مامی ڕەمزی‌یەوە ناوبانگی دەرکرد بوو.

(٨) میوللەر ناوی قاوەچی‌یەکە بە ئەحمەد دەبا ، ڕاستی‌یەکەی، ئەوەیەکە ناوی عەلی بووە و ناوی کوڕی ئەحمەد بووە، لەو سەردەمەدا تەمەنی نزیکەی شەست ساڵ بووە.

(٩) سوپاس بۆ کاك عەزیز جەریری کە بووە هۆی ئەوەی ببم بە ناسیاو و هاورێی کاك بەدران ئەحمەد حەبیب.

(١٠) ئەوەی پێویستە لێرەدا بووترێ ئەوەیە کە مامۆستا سەردار میران بە زمانی عەرەبی چەند لاپەڕەیێکی لە کتێبەکە (چاپی ئەڵمانی) بڵاوکردۆتەوە لەگەڵ پیشان دانی پێشەکی‌یەکە، بڕوانە: سەردار میران، کردستان في نظر سائح الماني، مجلة كاروان، العدد ٥٧ ، تموز ١٩٨٧، ص ١٣٠ ـ ١٣٤.

# پێشەکی

لەژێرخانەی مردندا چاوەنۆری فەرمانی لە سێدارەدان بووم کاتێ بڕیاری خۆمم دا.

بە خۆمم گوت، دەشێ پەرجوویێک روو بدات. دەشێ بەگیان بمێنم و، بتوانم داهاتووی ژیانم، بۆ تاکە شتێک ـ تەنیا تاکە شتێک تەرخان بکەم ئەویش خزمەتی ژیان خۆیەتی، هەمان ئەو ژیانەی ئێستاکە بە هۆیەوە بڕم ئاوەها ئالۆزو پەرێشان بووە.

ئیـدی لەم بڕیارەوە سالم – Salem کۆمەڵەی لە دنیا ناسراوی بایەخ پێدانی گیانلەبەران بە ئینسان و ئاژەڵیەوە، سەری هەڵدا.

لەپێناوی ئەمەدا پەرجووەکە رووی دا.

چۆن رووی دا ئەوا لەم کتێبەدا ووتراوە.

بەو پەڕی دڵسۆزییەوە ئەم کتێبەم پێشکێشی دۆستانی سالم دەکەم لە هەر کوێیەک بن.

**گوتفرید میوولەر**

# کردەوەی ماوۆنت

## هەراسانی

بە هاری ١٩٤٢ لە ئەستەموولەوە گەرامەوە بۆ ئەڵمانیا. لە ئەستەموولْ، لە کارێکی خەفیەیی‌دا بەشدار بوو بووم و نێردرابوومە یەکە یەکی سپێری سوپایی لە دارستانی بۆ هیمیا. ئەرکی من ئەوە بوو ئەندامە نوێهاتووەکان بۆ پێشە بەرەی روسیا مەشق پێ بدەم، چاوەنۆڕ بووم خۆیشم دوا جار رەوانەی ئەوێ بکرێم.

دڵخۆش بووم بەوەی دەستم لە نێردەی تایبەتی بەر دەبێ و جارێکی تر دەگەرێمەوە نیشتمان. بەڵام هەر لە هەوەڵکۆوە دڵەراوکەیەك دایگرتم. لە دڵی خۆمدا گوتم هەبێ و نەبێ ئەمە شوێنەواری کارە خەفیەیی‌یەکانە کە باجی خۆیان لە دەمار گیریم nerves وەرگرتبوو، هەموو جارێ لە بنەتای هەفتەدا بۆ ئەوەی هۆی ئەم هەراسانییەم لە مێشك وەدەرنێم سەردانی ڤیەننام دەکرد،چەندین ساڵ لەوێ ژیابووم و بەسواریی شەمەندەفەر دووریی چەند سەعاتە رێیەکی کەم دەبوو.

هەر زوو دۆستایەتیم لەگەڵ کابرایەکی ئەفسەر ـ هانز کریستۆف، دا بەست کە چەند جارێك لە شەردا بریندار بوو بوو و ئێستا لەبەر چاوەدێریی یەکەیەکی چاکبوونەوەدا بوو. زۆرمان حەز دەکرد پێکەوە سەرو پەرداخێك شەرابی نوێ بخۆینەوە.

هەموو جارێ کە ووتووێژمان بەناچاری دەسووڕایەوە سەرباسی شەڕ، دەیپرسی:

«بەبیری تۆ سەرەنجام بەچی دەگات؟

لەبیرمە جارێکیان وەڵامیم دایەوە گوتم

گوتــە پێشینەکەی چینیت لەبیرە؟ سێ شت هەن کەسیان لێ دڵنیا نابێ: ژن بیر لەچی دەکاتەوە. باسترمە لەچی دروستکراوەو شەڕ چۆن بە کۆتا دێت.

لە راستیدا وا پێ دەچوو هیوای سەرکەوتنی ئێمە باش بێت. سوپای ئەڵەمانیا لە هەموو بەرەکاندا دەچووە پێش و بەتەواوی گەیشتبووە میسرو قەفقاسیا.

گەلێــك لەو نوختــەیە دوور نەبوون بتوانن ئەو جووڵە ماشەیی‌یە گەورەیە دروست بکەن کە بیرە نەوتەکانی رۆژهەڵاتی ناوەراستمان بۆ دەستەبەر بکات.

بەڵام لە نیشتمان نیشانەی مەترسی گەلێك بوون: شالاوی گەورە گەورەی فرۆکە، چرا هەڵنەکردن، تێوە رژانی کارکەری بیانی، کۆششی بەفیرۆ لە پێناو رەها کردنی تواناداران بۆ کاری چالاك.

بێ گومان ئەڵمانیا بەکاری هاتە هاتی بانگەوازێکی گەشبین و مژدەدەری میری، چاك ملی لە ئەرکی خۆی گوشییــوو. پێـویستــە دانیشی پێدا بنێین کە سەرکەوتنی سەرنج راکێشی ئەو تۆش هەبوون شایەنی نووسین بن: وەك سەرکەوتنی یەك لەسەر یەك لە بەرەکانی شەڕدا. بەڵام بەگشتی وا پێ دەچوو بارەکە روو لە ناهەمواری بێت. ئەو بیرەی بەردەوام تەنگاوی دەکردم ئەوە بوو: ئایا توانای شەرگێریمان گەییوەتە لووتکە؟

## کەمبوونی سووتەنی

هەفتەو مانگ یەك لەسەر یەك رابووردن و هەر چەندە جارێکی لە ڤیەنناوە دەهاتمەوە، دڵەراوکەکەی جاران دایدەگرتمەوە، پتر حەزم دەکرد بە خۆم و ئەوانەی مەشقم دابوون بەرەو ستالینگراد بەرێ بکەوم. واتە وات و دەمگۆی دەربارەی ئاڵۆزی‌و تێشکانی گەورە گەورەی خۆمانمان پێدا پێدا بۆ دەهات.

لە یەکێك لە پیاسەکانماندا بە راشکاوی دەربارەی ئەو بابەتە بە (هانز کریستۆف)م گوت: سووتەنیمان کەمە،

«دەزانم» وەڵامی دامەوە «هەموو رۆژێ لەو بریندارانەی دەبیستم کە دێنە لامان، پێشکەوتمان وەستاندووە، جگە لەمەش هەرچەندە جارێکی ناچار دەبین بەر پەرچی‌پەلامارێکی زۆر بچووکی رووسیا بدەینەوە، ناچار دەبین تانك و چەکەکانمان بتەقێنینەوە، ناتوانین پاشەکشەیان پێ بکەین».

مات بووین، بە چاوی خەیاڵم نەخشەی رووسیام دەبینی، بیرێك لە مێشکم کەوتە نێڵە نێڵ.

گوتم «ئەم وورە بەزینە چییە. ئێمە ئاوەها لێرەدا بێ ئاگردوو بین و سوپاشمان لە بناری باکۆ یەك بست لە کەلووی بەرزی چاڵە نەوتە گەورە گەورەکانەوە دوور بێت.»

«دەدێ ئاوەهـایە،» هانز کریستۆف وەڵامی دامەوە «هەر سووکە تەکانێکی تر بدەین، هەرچی نەوتی بمانەوێ دێتە بەر دەستمان و هەموو گرفتێکیش چارەسەر دەبێت.»

**لەو ساتەوە خولیای نەوت لە کەللەی دام. نەمدەتوانی بیر لە هیچ شتێکی تر بکەمەوە، هەر چەند جارێك لەبارەی شەرەوە گفتوگۆمان بکردایە، دەسووڕاینەوە سەر هەمان بابەت: سوپامان لە قەفقاس لەبەر بێ ئاگردوویی پەکی کەوتووە.**

**دوا جار بڕیارم دا تاکە شتێك هەیە بیکەم: یادداشتێکی بە پەلە بۆ سەرکردایەتیی باڵای سوپا بنێرم و بڵێم من زانیارییەکی گرنگم دەربارەی چاڵە نەوتەکانی کوردستان ـ لە هەرێمی کەرکووك وموووسڵ، هەیە.**

**چەند رۆژێك دواتر، بۆ چاو پێ کەوتنێك لە بەرلین، بانگێشتن کرام، پێشنیازەکەم لەوێ بە چاکی وەرگیراو بەرەو سەرکردایەتی باڵای سوپا رەوانە کرام.**

**فیلد مارشال کەیتلی سەرۆك ئەرکان، کە بڕیاری جێ بەجێ کردنی پێشنیازەکەی منی بەدەست بوو، ئەمەم بۆی نووسی: لە سەردانەکانی پێشوومەوە، هەرێمی کەرکوك و مووسڵ چاك شارەزام و دۆستایەتیم لەگەڵ سەرۆك خێڵە کوردەکانی ئەوێ هەیە. بە یاریدەی ئەوانەوە دەتوانرێ دەست بەسەر چاڵە نەوتەکاندا بگیرێ‌و یا خیبوونێك دژی بەریتانیا ئاگر بدرێ. پێم وایە دەتوانم هەفتەیەك یان دووان ناوچەکە رابگرم تا ئەو کاتەی سەربازی بە فڕۆکە دابەزیووی ئەڵمانیا دەگاتە جێ.**

**فیلد مارشال کەیتل لە ماوەی هەفتەیەك بە نووسین وەڵامی دامەوەو فەرمانی دا دەست بە کارەکە بکەم. هەر لەو کاتەدا فەرمانی پێم دا راپۆرتێك بدەمە دەستەی هەرە بەزی سوپا لە سەرکردایەتی‌ی فوهرەر.**

**ئەفسەرێکی گەورە پێی گوتم: ئەمە کار ێکی یەکجار زۆر پێویستە، تێك زۆر بە پەلە ئامادە بکەو**

بەرەو کوردستان بەریّ کەوە. دەتوانیت دەزگایەکی بیّتەل بەکار بیّنیت؟

«بەڵێ،» گوتم. «من لە هیّزی ئاسمانی ودژەخەفیەیی‌دا مەشقی بەکارهیّنی دەزگای بیّتەلم کردووە».

«کەواتە لە دژە خەفیەیی بوویت؟»

«بەڵێ، لە تورکیا.»

«لە‌دەزگای بیّتەلدا کارت دەکرد؟» بەڵێ

«زۆرباشە، وائیّمە نەخشەکەی تۆمان بە دڵەو دڵنیاشین تۆ چاك لە مەبەست دەگەیت. تەنیا تاکە داوخوازیّکمان لیّت هەیە، دەمانەویّ دەسبەجیّ ڕاپۆرتی بروا پیّکراوان دەربارەی باکووری عیّراق و کوردستانەوە بۆ بنیّریت»

بەسەر سورماوییەوە سەرنجم بۆی هەڵبری.

گوتی: هەبیّ ونەبیّ شتیّکی ناریّك لەویّ هەیە. هەمیشە زانیاریی ناکۆك و دژ بە یەکترمان بۆ دیّت. ڕایکیّشامە لای میّز نەخشەیەك.

«بۆ نموونە لیّرە، ڕاپۆرتم بۆ هاتووە دەڵیّ بەریتانیا خەریکە هیّلیّکی ئاسن لە بەغداوە بۆ باکوور دەکیّشیّ. جرانە زۆر جرانە بزانین برادەرانی ئینگلیز خەریکی چین لەویّ. بەڵام ڕاپۆرتیّکی تر دەڵیّ ئەو هیّلە هیّشتا لە پلەی نەخشە کیّشانە، ڕاپۆرتی سیّیەمیش دەڵیّ هیّلەکە تەواو بووەو هیّندەی نەماوە بەکار بیّت».

« تۆ بابایەکی ئەفسەریت، دەزانم بۆ دەکریّ پشت بەو زانیارییانە ببەستم تۆ بۆمانی دەنیّریت. زۆر گرنگە بزانین ئیّستا چی لەویّ ڕوو دەدات».

کاتیّ گەڕامەوە بەرلین، دژە خەفیەییم پشکنی تا بزانم چ کەرەستەیەکمان دەربارەی هەریّمی چاڵە نەوتەکانی کوردستان هەیەو کاتیّ بینیم هیچ شتیّکی بە کەڵکمان نییە، لە شویّنی خۆم وشك بووم: تیّ نەدەگەیشتم چۆن ئەو زانیارییە کەمەمان لە فایلی تایبەت بە ناو چەیەکی ئەو تۆوە هەیە کە بۆ توانای شەرگیّریمان هیّندە گرنگە.

بە خۆمم گوت: «دەبیّ ئەو شتە ڕاست بکەمەوە. دەبیّ زانیاریی ئەوتۆ بدەمە سەرکردایەتیی باڵا بەکەڵکی ئەو جووڵە ماشەیی‌یە گەورەیە بیّت». پیاوانی خۆمانم لە قەفقاس هاتەوە بیر. «ئەو نەوتەتان بۆ دەسگیر دەکەم، چی لەمە چاکتر هەیە، بەم زووانە بۆتانی دەسگیر دەکەم».

خۆ هەڵدانیّکی بە پەراشووت لە کوردستان، ئاگردانی ڕاپەڕینیّك لەناو خیّلە چیایی‌یەکان، نەوت بۆ سوپامان دەسگیر بکریّ.

هاتبوومە جۆش، هەلی خۆمم بۆ هەڵکەوتبوو، ئەم کارە لەو جۆرە گرموانە بوو من هەمیشە چیّژم لیّ وەر دەگرتن.

## چاڵە نەوتەکانی کوردستان

کورستان ئەو وولاتەیە زۆربەی خەڵك هەر بە ناوەکەیەوە دەیناسنەوە، بەڵام زۆر کەم هاتوچۆی بۆ کراوە. ئەوانـەی ویّـراویـانـە پیّ بنیّنـە ئەو هەریّمـە چۆڵ و کاکی بە کاکی‌یەی کوردستانەوەو نەکەوتونەتە بەر چەنگی چەتەو ئەشقیایان، خۆیان بە بەختەوەر دەزانن لەوەی سەری خۆیان بە زیندوویی دەرباز کردووە.

بەلای منەوە کوردستان تەنیا ناویّکی سەرنج بزیّو نەبوو، بگرە وولاتیّکی چۆڵەوانی وپڕ لە هەڵدیّر

و هەڵەمــووت، هاتم بە نیوچە ڕێکەوتێك ناسیم و خۆشیم ویست. سەردانی جارانی پێشوو ترم کەیاندبوومیە فەلەستین و، دامنا دواجار بە سەردانێکی کورتخایەنی بەغدا کۆتایی بە گەشتەکەم بێنم. پاشان هەستم بە ئەفسوونی سەرنج ڕاکێشی باکوور و کوردستان کرد بە خۆی و بە کەژ و کێوە چۆڵ و سەرکەشەکانیەوە. ئەو کەسەی بچێتە ئەوێ سەری خۆی لە گرەو دەنێ. ئەشقیای لە کێـوان، ئەسپ سوار و نیشـانە شکێن وچاپوکی بێ وێنە بە خۆیان و خەنجەری چەماوەی بەر پشتێنیـان ترس وتەزوو دەبەنە نێو دڵی ڕێبوارەوە. هەڵەت و کەندولەندەکانیش گەلەگورك و ڕەوە وورچیان لە مرۆ پتر بوو، چەندی بڵێی هەڵدێرو هەست بزوێن بوون.
وولاتی کوردان، بە ڕووبەری نزیکەی ۱۲۵۰۰۰ کیلۆمەتری چوار گۆشەیە. لە سویسرای بێ ئوتێل وبازێرو سەیرانگەو بێ بزگور ڕابمێنە، ئەوا وێنەی کوردستانت لەبەر چاوە. کوردستان وولاتی چیـاو دۆڵ و لووتکەی بەفرین و گۆلاوی بەرین، گوزەرانی گەلەکەی ساکارە، تازە بەتازە وەبەر هەندێ شارستانێتی کەوتووە، بەڵام گەلێکی دڵنیاو سەر ئاسوودەن. گوندی بچووك بچووك وەك هێلانەی چۆلەکە بە لاپاڵی چیاوەن.

خانــوو بەرووپشتی یەکتر ڕۆنراون و دەتوانیت پیاسەیەکی سەر تۆقەڵەی گوند بکەیت. دیوار بە بەردی خۆشە نەکراو هەڵچنراوە، بەردەکان بە تێکەلاوی گڵ وکا بەیەکەوە نووساون. ئەم دیوارو ئەو دیوار بەکاریتەی ئەستووری یەك پاردە لە یەکترەوە دوور دارەراکراوە و، پاشان ڕێزە شەقڵەیەك لە سەرەوە بە ئاراستــەیــەکی تر دانراوە، ئینجا هەراشیان هاوێشتووەتێ وچینێکی ئەستووری گڵەبان خانووەکەی تەواو کردووە، دەرگا نییە، ئەوە نەبێ کونێك لە دیوار بە جێ دێڵن کولانکەیەکیش لە ژێر ساپیتە هەیە و لە جیاتی پەنجەرە بەکار دێت. کاتێ دەرەوە سارد دادێت شتێك دەپەستنە نێو پەنجەرەکەوە، پارچە پێستەیەك یان لێفەیەك بەسەر دەرگاوە هەڵدەواسن.
خانوو دوو ژوورو کە وشکەنێکی هەیە. زەوینەی ژوور لە چینێکی توند پەستراوەی گڵ دامەزراوە لە ناوەڕاستی زەوینەی هەر ژوورێك چاڵێك هەیە بۆ کوانووی ئاگر بەکار دێت.

دەچیتە هەر ماڵێك، نەریت وایە لە کەوشکەن پێلاوت دادەکەنی. پێلاوی کورد یان بریتییە لە پێستەیەك و بە تیلمە قایش بە پێوە شەتەك دراوە یان جۆرە سوڵیکە. پێلاوی یەکەم بە تایبەتی بۆ خێرا ڕۆیشتن و پێ چەسپاندنی ناو چیایان لە بارە. ژووری یەکەم بە ناوبرمیەکە نەوی لە کەوشکەن جودا کراوەتــەوە ئەم ژوورە هیپیـاوانــەو ژووری دووەم هی ژنـانــە. لە ژووری پیــاوان، یان لەسەرچۆکان دادەنیشیو پشت بەدیوارەوە دەدەی، یان ئەوەتا لە دەوری ئاگردان لەسەر چینچکان کرووشکە دەکەی. زۆربەی جاران بەجگەرەکێشان و ووتوێژو چا خواردنەوەو نەخشەکێشان کات بەسەر دەبەن. چەندێتیو چۆنیەتی ڕایەخی ناوماڵ ڕادەی گوزەرانی خاوەن ماڵ نیشان دەدات. لە ژووری ژنـان هەموو کارێك دەکرێت، نانکردن، شووشتن، دوورمان، منداڵبوون و منداڵداری.
ئەگەر پیاو یەك ژنی هەبێ ئەوا کاری سووك و ئاسان دەڕوات بە ڕێوە، بەڵام ئەگەر زۆری هەبێ ئەوا گەلێك جار شەرەکووکە هەڵدەگیرسێ، لەبەر ئەوەی ووشەی کار لەلای پیاوان نییە، ژنان هەتا بڵێی گورج و گۆڵن، بێ گومان، ئەمە وا ناگەینێ پیاو هیچ کارێکی تایبەت بە خۆی نییە. پیاو بەو

کەژو کۆسارەدا هەڵدەگەڕێن و وورچ ڕاو دەکەن. زۆر جار بە تاکە کەسی بەرانگژی وورچ دەبنەوە. یان سواری ئەسپیان دەبن و هەرچییەکیان بێتە ڕێ ڕاوی دەکەن: گورگ، بەرازە کێوی، کەمتیار، توورگ، کەڵە کێوی، مامزەکێوی و پڵنگ شتێکی ئەستەمە لە ووزەو توانای کوردان بگەیت.

دوژمنداری و تۆڵەی خوێن بە خوێن ساندن لە کوردستان زۆرە. ساڵێك لێرەو ساڵێك لەوێ سەر هەڵدەداتەوە. لە بەر ئەوەی ماڵ و خێزان و گوند بە جۆرێکی توند بەیەکەوە بەستراون بچووکترین شەرەکووکە لە ڕادە بەدەر تەشەنە دەکات و گەورە دەبێتەوە.

کاری زەویوزار چاندن و بەرهەمهێنانی دانەوێڵە لە ئەستۆی ژنانە. زەوی بە کۆنە هەوجارێکی دار دەکێڵدرێ. دوو ژن یان دوو گوێ درێژ هەو جارەکە ڕادەکێشن.

هەموو ماڵێك حەوشی خۆی هەیەو شوورەیەکی بڵندی بۆ کێشراوە. بە ڕۆژەوە ژن و منداڵ مەڕو ماڵات لە دەشت و دەر دەلەوەڕێنن و، ئێواران لە حەوشەی کۆدەکەنەوە بۆ ئەوەی لە تالان و بڕۆ پاس ببن. هەر گوندێك دوو شوێنی ناوکۆی گرنگی هەیە: ئاو دەست و سەرشۆرك. بەشێوە کە پرێکی سادەن و لە پەرگەی گوندن، لەسەر ئەو چەمەی بەناو گونددا دەڕوا، سەرشۆرك ئاگرێکی لە دیوی دەرەوەی هەیەو، دەتوانیت لەوێ ئاو لە مەنجەڵێك گەرم بکەیت و سووکە شوشتنێکی بۆ بکەیت.

شێخ گەورەو دەمراستی گوندە[1] لەراستیدا شێخ نوێنەری دەسەڵاتی خاوەنی راستەقینەی گوندە کە ئاغایە. ئاغا لە گوندێکی گەورەترو بەر فرەتردا دەژیو لە ماوەی ساڵێك چەند جارێك سەر لەگوندەکانی خۆی دەدات. رادەی دەوڵەمەندێتی ئاغا بەندە بە چۆنێتی ئەو هێزو ئەو پلەی زەبرو زەنگ و ئەو لێزانییەی لە کارو باریدا دەنوێنێ. چەند دەوڵەمەندتربێ پتر چەکدارو گزیر لە خۆی کۆ دەکاتەوە.

لەبەر ئەوەی ئەم باری گوزەرانە لە دێرینەوە باو بووە، کورد بەبێ یاخیبوون وەك پاڵەو کۆیلە ملیان بۆ بارو زرووف ژیانیان کەچ کردووە. بەڵام سەرەرای کۆیلایەتییان ـ کورد بەگشتی لە ناو کووفە ئەورووپاییە شارستانیەکانیان سەربەستترن. چونکە ئەو کاتەی دەستیان لە شەڕو کاری خزمەت بە تاڵ دەبێ دەتوانن بە ئارەزووی خۆیان بەو کەژو کێوە چۆڵانەوە کاتیان بەسەر ببەن.

دەسەڵاتی ئاغا بەبێ سنوورو لێ پێچینەوە بەسەر کرمانجدا دەشکێ. دەتوانێ سەر لەبەری گوندەکانی بفرۆشێو بەزۆری زۆرداری کاریان بەسەردا بسەپێنێ و سەرانەی (عینی)یان لێ وەربگرێ. پیاوان بۆ شەر ڕاپێچ بکاو چەندیش حەز بکا ژن بێنێ. هەروەك هەموو شوێنانی تری دنیا، سەرۆك خێلانی کورد هەموویان وەکو یەك نین. هەندێکیان بە هۆی زەبرو زەنگیان دەبنە مایەی بوغزو کینەو دادو بێدادی خەڵك و، هەندێکیشیان رێزیان لێ دەنرێو، سەر لێ دانی گوندەکانیان دەبێتە مایەی کەیف و شادمانیی خەڵك.

کوردستان هەر لە عێراقەوە تا قەفقاسیاو، هەر لە گۆلی وورمێ لە ئێرانەوە تاچیای ئاگری لە تورکیا کشاوە. زەوینێکە، بیابانی گرگرتووی باشوورو چیای سەربە بەفری ٥٠٠٠ مەتر بەرزتر لە رێکاری دەریای گرتوونەتە خۆ. ئیدی دەتوانی تێ رابمینێ ئەوهەموو شتانەی ئەوێ چەند لە یەکتر جودان. هەر لە چۆنیتی گوزەران و نەریتی خەڵکەوە بگرە تا دەگاتە رووەك و زیندەوار. باوەری

ئاینیش، لە تیرەی دیانەوە ـ کە نەریتیان دەگەڕێتەوە سەردەمانی هەرە زووی کلێسا، تا دەگاتە دەمار گرژترین شێوەی محەمەدایەتی[٢] Mohammedanism لە ناوینی ئەمانەشدا گەلێك باوەڕی جودا جودای تر هەن.

وەك باو بووە، ئەڵمـانیـا لەلایـەن کوردەوە زۆری ڕێز لێ گیراوە. بەڵام ئەو کاتە دەسەڵاتی و کاریگـەریتی ڕووسیـا خەریـك بوو خۆی بەرهـەست بکـات. شێخە کوردەکان بە گەلێك شێوە دەلاواندراونەوەو چەك و تفاقی شەڕیان بۆ دەچوو، بە تایبەتی لەو ناوچانەی دەسەڵاتی زەویدارە کوردەکانیان تێدا بە هێز بوو، گوێچکەی خەڵك بۆ بانگی فریودەری کۆمیونایەتی ووشت بوو بوو ئەمە هۆیەکی تری نەخشەکەی ئێمە بوو!

لەسەردانی یەکەمجارم بۆ ڕۆژهەڵات، هەلێکی چاکم بۆ هەڵکەوت بۆ ئەوەی ناسیاوێتی لەگەڵ بە هێزترین سەرۆك خێڵی کورد ـ شێخ مەحموود، پەیدا بکەم. هەرێمە بەرین و هەراوەکەی ئەو کەوتۆتە باکووری عێراق و بەشێکی خێڵەکەی لە ناوچەی دەورو پشتی چاڵە نەوتەکانی کەرکوك و موسڵ دەژین. چاڵە نەوتەکان کەوتوونەتە دەشتێکی ڕاستان، بەڵام لە پشتەوەیانرا کەندو لەندەکەی لە ناکاو دەبێتە گردی ڕژدو هەڵەتی ئەوتۆ خۆلێدانیان دژوارە. چیاو خەرەندەکان پێدا پێدا بەرەو ژوورتر هەڵدەکشێن.

نابینرێ کوردستان لە ئەتڵەسدا وەك وولاتێکی سەربەخۆ نیشاندرابێ، چونکە تورکیاو ڕووسیا و ئێران و عێراق[٣] بەدرێژی لە نێوانی خۆیاندا دابەشیان کردووە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم ژێر دەستە کردنەی کوردستان شتێکی تەنیا بە ڕواڵەت بووە. کورد ئاغای ماڵی خۆی بووەو نرخێکی‌کەمی بۆ ئەو سنوورە دەستکردانە داناوە. نە عارەب و نە فارس و نە تورك، یان چاکتر بڵێن نە هیچ بێگانەیەك ژیانی خۆی بەلاوە بەنرخ بووبێ وێراویە پێ بنێتەناو خاکی کوردستانەوە. بەڵام بە گۆشەنیگایەکی ئابـووری، لێـك دابـڕان لەگەڵ دنیای دەرەوەدا وا ڕادەگەیێنێ کە ئەم هەرێمە هەرێمێکی تەواو مردووە. سەرەڕای ئەمەش کێشەو هەرای بێ برانەوەی نێوان خێڵەکان نەیهێشتووە دەرفەت بۆ هیچ جۆرە بنکـەیەکی سەرکەوتن بلوێت. پێ ناچێ هیچ شتێك هەبێت بتوانێ کورد لەم تەرزە ژیانە کۆنینەیە هەڵکەنێ مادامەکی مەڕو گاوگۆتاڵیان سەربەست دەلەوەڕێ و مادام کەس نییە دەستیان بگرێ و فێریان بکا چۆن ببن بە گەلێکی سەرفراز.

ئەو کاتەی بۆ یەکەمین جار لە بەغدا شێخ مەحموودم ناسی، پێی گوتم: میوولەرە فەندی، کوردستان حەز بە بێگانان ناکات. بێگانە کاتێ دێنە کوردستانەوە لێی دەرناچن.

چونکە بەلای ئێمەوە هەموو بیگانەیەك دوژمنەو، ئێمە دەستەوبەرۆکی دەبین. بەڵام تۆ برامانی. یەکسەر لوولەی نێرگەلەکەی لەزاری خۆی دەرهێناو خستیە نێوان هەردوو لێوی منەوە.

بۆی نوشتامەوەو گوتم: « ئەمە مایەی سەرفرازیمە، شێخی مەزن،» گوتی: پێم بڵێ (أبو) ـ باوە. هەرچی شتێکیش دەخوازی فەرموو بڵێ، گوتم: ئەوەی پێش هەموو شتێك دەمەوێ ئەوەیە فێربم وولاتی باوکی بەڕێزم بناسم».

لێرە، چاوەکـانی شێـخ بریسکانەوە. خۆی گورج کردەوەو سەری ڕاهەقاند. دەمێکی تەواو بەگژ بیرکردنەوەکەدا چوو، پاشان ڕووی وەرسووڕاندو ماقوڵانە گوتی:

« وەڵڵاهی تۆ شایانی ئەوەی کوڕی منت پێ بگوترێ پێویستە فێربی وولاتەکەم بناسی».

پاکارو کورانی شێخ مەحموودم بەپێش کەوتن و، بەسواریی، درێژیوپانیی کوردستان گەڕام و خۆشیم ویست.
دەمـزانی، بۆ ئەوەی کورد بۆ پیـلانـەکـەی خۆم بکـەمــە ماڵ و، لە پێناوی دەرهێنانی هەرێمە نەوتاوییەکەی کەرکوك و مووسڵ لە چنگی بەریتانیا، دەبوو هەندێك شتی نرخ نائاسایی و سوود ئاشکـرام لە بەرامبەردا پێشکێشی کوردان بکردایە. لەمەش بەولاوەتر دەبوو ئەو پێشکێشکردنە ڕاست و نیازپاك بێ. چونکە ڕۆژهەڵاتیایی لەبارەی ئەم شتانەوە بەسروشت شەش هەست و بەگومانن.
چییان پێشکێش بکەم؟ پارەی لێ ببە دەرەوە، هیچم پارەبە دەستەوە نەبوو.
بەڵام نەدەبوو لەم شتەدا دابمێنم. ئەو شتەی دەبوو پێشکێشیان بکەم ئەوە بوو یاریدەیان بدەم بۆ ئەوەی سەرفرازییان بەدەست بێنن، بۆ ئەوەی سەربەخۆیی نەتەوەییان بچەسپێنن، بۆ ئەوەی لە بواری ئابووری و کەلتووریەوە پەرە بە وڵاتەکەیان بدەن و شوێنێکی شیاوی ڕێز لێ گرتن لەناو گەلانی دنیا بۆ کوردستان بەدەست بێنن.
ئەم ماخـولیایەی کورد سەبارەت بە ناتەبایی و شەڕەکووکەی نێوانی خۆیان تا ئێستا شتێکی لە ووزەو توانا بەدەر بۆوە. بۆ ئەوەی ئەم مرازە بێتە دی، پێویست بوو یاریدەی کوردان بدرێ. ئەم یاریدەیەش لە دراوسێ بەهێزەکانی کوردەوە نەدەهات چونکە ئەوان هەمیشە حەزیان بە کلۆڵی و بێ دەرەتانیی باری ئابووری و کەلتووریی کورد کردووە.هەر نەدەبوو چاوەنۆڕیی ئەو یارمەتییە بکرایە ئەگەر ئەو نەوتە لەبەر چاوان بوایە کە لە سنووری ئەو وڵاتانە دایە.
ئەمــە ئەو پێشنیــازە بوو دەمــویست وەپێشیان نێم: ئەو چاڵە نەوتانەی لەوڵاتی ئێوەدان، هی خۆتــانن. بەڵام ئێـوە ناتوانن بەبێ یارمەتی بە بەریان بێنن. با ئێمە لەمەدا هاوکاریتان بکەین. سەرەرای ئەمەش بۆ ئەوەی بتوانن نەوتەکەتان بە چاکی بەکار بێنن، ئێمە یارمەتیتان دەدەین بۆ ئەوەی سەرفرازیتان بێتە دی.
من لەلای خۆمەوە لە پێناو پەرەپێدانی کوردستانێکی نوێ، زۆرحەز دەکەم بەهەرشێوەیەك بۆم بلوی خزمەتتان بکەم».
**خۆ ئامادەکردن**
ئێستــا بەتەواوەتی سەرگەرمی ئەو ئەرکە گەورەیە بووم کە لە پێشمدابوو. هەر شتێکی لەبارەی کوردستانەوە توانیم بەدەستی بێنم لێم کۆڵییەوە. دەربارەی خەڵك و داوو دەستووریان، دەربارەی سروشتی وڵاتــەکــەو ڕێگــای پێشکەوتنی. گرفتەکەی من ئەوەبوو کەرەستەی نووسراو لەبارەی کوردستانەوە مەیلەو نەبوویێك بوو. بەڵام بەخۆ کەوتم بۆ ئەوەی لەهەر شوێنێك هەبێ بە دەستی بێنم.
بەرێکـەوت کابـرایـەکی سەیـرم بۆ هەڵکەوت. کۆنە دەرسبێژێکی دەرسی تایبەتی،چاویلکەیەکی چوارچێوە کانزای لە چاو بوو، کابرایەکی لەسەرەخۆی ڕووڵەت ووشك. خولیای لە زمانی کوردی بوو. لە سەردەمی قەیسەردا زۆرجاران چووبووە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. هەرچەندە نەگەیشتبووە جێی مرازو سەری لە کوردستان نەدابوو. بەڵام هەموو دەرفەتێکی بەکار دەهێنا بۆ ئەوەی لەگەڵ کوردان بدوێ و هەر ووشەیەکی کوردیشی بۆ هەڵبکەوتایە دەستبەجێ دەینووسییەوەو ئەزبەری

ـ دکرد. چوومە لای کابرا بۆ ئەوەی دەرسی زمانم پێ بڵێ.
گرفتێکی گەورەشم ئەوەبوو، هیچ پارمەتییەکی بە کردەوەم لە کەرتی(سەرکردایەتیی پالای سوپا)ەوە بۆ نەدەهات کە هەر خۆیشیان بەرپرسی پرۆژەکە بوون. نیشانەی پارمەتیدانێك هەبوو بەڵام هیچ ناوەرۆکێکی بە متمانەیتێدا نەبوو. لەوێ بەدوواوە بەخۆکەوتم و خۆم راهێنا بۆ هەموو شتێك پشت بە خۆم ببەستم.
یەکەمین پێویستم ئەوەبوو دەستە پیاوێك پەیدا بکەم لەوانەی باك گراوندێکی لەباریان هەبێ. دەستەیەك لەو کەسانەی پێشتر چووبنە رۆژهەڵاتی نزیك و ناوەراست و ، زانیارییان لەبارەی زمانانی هاوشێوەی زمانی کوردییەوە هەبێت. فێربوونی زمانی کوردی بۆ ئەمانە ئاسانتر بوو سەرەرای ئەمەش دەبوو گەنج و لەشساغ بن و، ئامادە بن هەزاران کیلۆمەتر لەودیو هێڵی دوژمنەوە خۆیان بە پەراشووت هەڵبدەن.
یان بەشێوەیەکی تر، پێویست بوو تا رادەیەکی چاك ئازاو نموونەیی بن. دوو مانگی پێوە بووم تا ئەو کەسە لەبارانەم بۆ هەڵکەوتن ، بەڵام کاتێ بۆم هەڵکەوتن بە دڵی خۆمم هەڵ بژاردن.
باك گراوندی جودایان هەبوو. یەکێکیان چووبووە کابوول و یەکێکی تریان ئێرانی دیتبوو. یەکێکی تر لە لوبنان گەورە بوو بوو.ئەوەکەی تریشیان لەگەڵ ددانسازێکی گەرۆکی ئەمەریکایی کاری کردبوو و، هەموو ناوچەی چاڵە نەوتەکانی کوردی وەك پشتی دەستی خۆی دەناسی. گەلێك جاران بە ئۆتۆمۆبیل هەموو ناوچەی کەرکوك و مووسڵ گەرابوو، لەو شوێنانەی کە کاری ددانسازی پێویستن. لێم پرسین ئایا لەگەڵم دێن؟ هەموویان ئەوپەری ئامادەییان نیشان دا.
گوتم: ئەدی ئەو مەترسیانەی لە بەرودوای ئەم کارەدان ناتان ترسێنێ؟
وەڵامی هەموویان ئەوە بوو کە مەترسی وەك شتێکی سەرجەم کاتی شەر حسێب دەکرێ. ئەو شتەی ئەوان کەیلی بوو بوون. سروشتی ئەرکەکە بوو. سوپاییە یان سیاسی؟
پێم گوتن «برێك لە هەریەکێکیان. رێکخستنی بە نهێنی وتیپ چەکدار کردن، هەروا هەڵکردنی ئاگری یاخیبوونێك کە راپەرینێکی گەورەی لێ بکەوێتەوە.»
هەموو جارێك لە دیمانەی خۆم لە گەڵیاندا. زەینم دەدا، ئەو کەسانە بۆ مەبەستەکەی من یەکاو یەکن. پیاو لە رۆژهەڵات فێر دەبێ چۆن بیری کەسێکی تر تاوتۆی بکات.
ئەگەر لە بەرامبەر رەفتاری یەکێك بچووکترین هەستی دوو دڵیم لەکن دروست ببێ، ئەوا ووتوێژەکەم بە بارتێك وەردەسوورێنم ئیتر کابرا رێ بە دێیی بەو مەبەستە نەبا کە من خەریکی نەخشەکێشانی بووم.
هەرچەند جارێکی سەرنجم دەدان، خولیای خۆ لە مەترسیدان و ئامادەیی پێکەنین بەدەم ترسەوەم لێ دەبینین، و، هەستم بەو خۆشەویستییەی رۆژهەڵات دەکرد کە زۆربەی ئەوانەی سەریان لێی دابێ سەرەنجام ئەو خۆشەویستییەیان لە دڵ چەسپیووە، ئیتر ترسم دەرەویەوەو دەمزانی پێویست ناکا هێندە سەری خۆم بەم بابەتەوە بێشێنم.
ئیتر ئاوەها بوو. رێکەوت کەسانی لە باری بۆ هێنام. هەموویان لە ئامادەبوونی بێ دڵ لە دڵ دانی خۆیان بۆ بەگەڵ کەوتنی کردەوەکە، دڵنیایان کردم.
کاتێ پێکەوەم کۆکردنەوە، قسەکەی (گۆتێ)م هێنایەوە بیریان کە دەڵێ:

کار تانج لەسەری پیاوان دەنێت.

گوتم «کردەوەکەی ئێمە شتێکە شایەنی ئەوە بێ ئاهەنگی بۆ بگێڕین» ئێستا پتر شل بوو بوون، چاوە نۆڕ بوون شتی پتریان گوێ لێ ببێ. بەلام من نەمدەویست شتی زۆر بلێم.

«هەندێك کات دێنە پێشەوە،» گوتم «شتەکە دەبێتە هەلبژارنی ژیان یان مردن».

هەموویان بزەیان هاتێ و کەسیان هیچی نەگوت. ئێستاکە لە هەلبژاردنەکەم دلنیا بووم و یەکە یەکە دەستم بۆ درێژ کردن.

بەلام ئەندامی هەرە گرنگی تیپەکەم هێشتا بۆ بەگیر نەهاتبوو. دەبوو کوردێکی ڕەسەن بەدەست بکەوێ بۆ ئەوەی خۆی لەگەڵ ئێمەدا بە چەتر هەڵدا. ئەوجا بەرەو حەشارگەیەکی چاکمان ببا و پاشان پێوەندیمان لەگەڵ شێخ مەحمود و سەرۆك خێلە کوردەکانی تر بۆ دابمەزرێنێ. ئەمەم لە هەمــوو شتێکی تر پێــویستتر بوو. بەلام کوردێکی ئاوههام چۆن بۆ هەڵدەکەوت؟ ئەگەر هەلیش نەکەوت ئەوا دەبوو کارەکەمان بە چاکترین شێوە ئەنجام بدەین و شوێنی ئەو پڕ بکەینەوە. بەلام ئەمە شتێکی فرە ئەستەم بوو. چەندی پێوە بووم و بیرم دەکردەوە چۆن پێوەندی لەگەڵ کوردێکی لێــوەشــاوە ببەستم. بێ سوود بوو. هەموو ئەوروپا نەیتوانی کوردێکی ئاوههام بۆ دەسگیر بکا. پاشان بیرم لە کۆنە ڕێکخراوەکەی ئەستەمووڵم کردەوە کە بنکەی هەرە گەورەی خەفیەیی و زانیاری بوو. ئەوە بوو یەکێکی هەرە لێوەشاوەیان بۆ دۆزیمەوە، (رەمزی) ناوێك بوو، کوڕی سەرۆك خێلێك بوو لە هەولێر[٤] خێلەکەی باوکی کەم تا زۆرێك لەو ناوچەیەدا دەژیا کە ئێمە دەمانوویست خۆمانی لێ هەلبــدەینە سەر زەوی. شوێنی خۆ هەڵدانە کەشمان لە چیایەکانی بەری ڕۆژهەلاتی ناوچە نەوتاوییەکەی کەرکووك بوو.

شوێنێکی شاراوە لە ئەلمانیا هەبوو، لەشێوەی مەزرایەك بوو. ئەمە فێرگەی دژە خەفیەیی بوو. پیاو لەوێ دەیتــوانی هەموو شتێکی پێویست دەربارەی دەستپێکردنی کردەوەیەکی زۆر گرنگی وەك کردەوەکــەی ئێمەوە فێر ببێ. لە سەردەمی ڕۆژانی ئەستەمووڵ خۆم پسپۆری ئەم جۆرە شتانە بووم، بەلام جارێکی تریش چوومەوە ئەوێ بۆ ئەوەی مەشقی خۆم چاکتر بدەم.

بۆ ئەوەی خەفیەکارییەکی سەرکەوتوو بەڕێوە ببەیت. گرنگترین شتت (ڕێکوپێکی)یە و پێویستە بە چاکی بایــەخی پێ بدەیت. یەکــەمــین شت، پێویستە تۆڕێکی ئالۆزی بامەتیدەرانت هەبێ، سەرچاوەی زانیاریو، پێناوو، شوێنی پێك گەیشتنت هەبێ. یان بەشێوەیەکی تر بلێین پێویستە خەڵکت هەبێ. بەلام خەلکیش گیــانلەبەرن و پیاو ناتوانێ هەمیشە پشتیان پێ ببەستێ. ڕەنگە هەموو کاتێك نهێنیت لێ ئاشکرا بکەن. ئاشکرابوونی نهێنیش هەموو ڕەنجت بەبا دەدا و کارەکە بە تاڵ دەبێ. باشە پیاو چۆن دەتوانێ خۆی بە چاکی لەم شتە بپارێزێ؟ بە هۆی ڕێکوپێکەییەوە. هیــچ کەس شتی ئەوانیتــر نازانێ. ئەگەر هاتوو تاکێکی ئەلقەی زنجیری خەفیەیی گیرا، دەبێ زنجیرەکە بەو پەڕی ڕادەی بڕوا پێ بوون پتەو بێ و دلنیاییت بداتێ. نابێ ئەو گیراوە بتوانێ زمان لە کەسانی تر بدا و بە گرتیان بدا، بە هۆی ئەوەی کەسیان نەناسێ. بێ گومان دەبێ یەکێك هەبێ هەمــوو ئەوانی تر بناسێ. بەلام نابێ ئەو کەسە خۆی بە دەستەوە بدات. بۆ ئەوەی نەبادا ئەم کەسەش بکەوێتە دەست، پێویستە بە بەلگە بێبەریبوونی خۆی بچەسپێنێ. بۆ باری ناچاریش، ئەگەر هاتوو زمانی لێ دراپێویستە ژەهری خۆکوشتنی هەبێ.

بەلام پەیداکردنی زانیاری تەنیا نیوەی تێکۆشانە، نیوەکەی تر ئەوەیە، دەبێ ئەو زانیارییە لە کاتی پێویست بدرێتە ئەو کەسانەی دەتوانن بە کاری بێنن. لەبەر ئەمە پێویستە خۆت بکەی بە لێزانێکی چاکی هونەری راگەیاندنی بە بێتەل و بتوانیت دەزگایەکی بچووکی ئالۆز بەکار بهێنی‌و بتوانیت ئاریێل دابمەزرێنی (کە زۆر جاران شتێکی ئاسان نییە)و بزانیت نامە بگۆریتە هێماو، هێماشی بکەیتەوە. هەروا دەبێ شارەزای شتی وەك مەرەکەبی نهێنی‌و هەزاراو یەك شتی دیکە بیت کە کەسێکی ئاسایی سەری لێیان دەرناچێ.

هەروەها دەبێ پردو هێلی شەمەندەفەر هەڵ بتەکێندرێن و، کارگەی بەرهەمهێنانی کەرەستەی شەر ئاگـریـان تێ بەربدرێ‌و، لە هەموو لایەکەوە هەڵمەت ببرێتە سەر دوژمن بۆ ئەوەی توانای شەرکردنی شەل و گۆج بکرێ. وێرانەکاری هونەرێکە بە پلەی یەکەم پشت بە کۆکردنەوەی زانیاری و پاشـان پشت بە رێکوپێکی دەبەستێ. پێویستە وەلامی ژمارەیەکی زۆرو زەوەندی پرسیاران بزانیت. چۆن بە توانای خۆت کەرەستەی کاریگەری ئاگر هەڵگیرساندن بەرهەم دەهێنیت؟ چۆن تەقێنەوە پەیدا دەکەیت؟ چۆن بە کەمترین بری تەقێنەرە بۆ زۆرترین ماوە وێرانەکاری دروست دەکەیت؟ چۆن کەشتییەك ژێرئاو دەکەیت؟ چۆن بە بەڵگەر بیانووی پێ سەلمێن بێبەرییوونی خۆت لە تاوانێك دەچەسپێنی؟ چۆن سەگی پاسەوان دەمرکوێت دەکەیت؟ چۆن خۆت لە چنگی شوێن هەڵگر دەرباز دەکەیت؟ چۆن چەکی بێگانان بەکار دەهێنیت؟

پاش ئەوەی یەکەمین گروپم پێکەوە نا، سەرێکمان لەو فێرگەیەدا تەنیا بۆ ئەوەی مەشقێك لە بابەت (تەقێنەوە) بکەین. پاشان زۆر بە پەلە بەرلین مان بەجێ هێشت و رووبمان لە دەربەندی چیایەك کرد بۆ ئەوەی مەشقێکی تەواوی خۆمان ـ لەژێر سەرکردایەتیی خۆمەوە، بدەین.

لە بەرلین بێز بوو بووم، نەك تەنیا بە هۆی هەڵمەتی گەورە گەورەی فرۆکەوە بگرە بە هۆی ئەوەی بەردەوام لە پەیدا کردنی شتومەکی پێویست و تایبەت بە نێر دەکەم تووشی لە مپەرو بەرگر دەهاتم. دەبوو خۆم خەمی پەیداکردنی هەموو شتێك بخۆم وچەندین رۆژ وهەفتە (هەفتەی گرنگ) لە پەیدا کردنی بەرگ و خۆراك و تەقێنەوەو دەزگای بێتەل وشتی تردا بە فیرۆ بدەم.

کارەکەیان هێندە ئالۆز کردبوو دەبوو بۆ کرینی چەند دەنکە قولابەیەك، مۆڵەتێکی رەسمی وەربگرم. کاتێ بۆم دەرکەوت شەرەجەنگی بیرۆکراتیەتی سەرکردایەتیی بالای سوپا کارێکی چەند سەختە، هەستام یەکسەر پێوەندیم بە هانز کریستۆفی دۆستمەوە کرد.

بۆم نووسی، (تۆم بەپەلە پێ دەوێ. تۆ تەنیا کەسێکی بتوانی ئەم فەرمانبەرە دردۆنگانە لە پەنجە تووتەی خۆت بئالێنی، کەی دەتوانی بێی؟)

وەلامی دامەوە: «پێ دەچێ بیرێکی سەیرت دەربارەی شێوەی کار هەڵسوراندنەوە هەبێ. خۆت دەزانی شتی ئاوهـایی زۆرن: کەنـاڵی تایبەت، سەرتیپ وسەرهەنگ. هەر لە پێناوی تۆ ئێستا لە فەرماندەرەکانم دەخوازم جێگرێکی تایبەت لەسەر کارەکەم دابنێن و خۆمیش بەسواریی یەکەمین شەمەندەفەر بۆ بەرلین دەکەومە رێ. منیش حەز دەکەم جارێکی تر بێت بگەمەوە. بەلام ئەمەیان ئیتر لە دەست دەرچووەو لەم چەند رۆژانەدا دەمنێرنەوە بەرەی شەر لە ستالینگراد».

پێش ئەوەی ئەو (چـەند رۆژ)ە بەسەر بچن، برووسکەیەك گەیشتە دارستانی بۆهیمیا «فیسارە ئووتەنانت ـ ملازم ئەوەل، دەبێ دەسبەجێ بگوازرێتەوە بۆ سەرکردایەتیی بالای سوپا».

ئەفسەرەکانی تر ـ تەنانەت گەورەکانی خۆشی، هەموو گوتیان: «ئەمەت چۆن کرد؟ دەبێ پێوەندیی گرنگت هەبێ».
ئەمیش بزەی هاتێ: «ڕاست دەکەن پێوەندیم هەیە» ئیتر لە جیاتی ستالینگراد بارگەی خۆی بەرەو بەرلین لە کۆڵ نا.
بەکار هێنانی دەزگای بێتەل گرنگترین بەشی مەشقی خەفییە، بۆیە هەر لە سەرەتاوە هەموو ڕۆژ پیاوەکانی خۆمم دەنارده کۆگایەکی بچووکی سوپا بۆ ئەوەی ڕێنوێنی لە کابرایەکی زابت سەف شارەزاوە وەربگـرن، کاتێ بەرلینیشمان بەجێ هێشت کابرامان بۆ ماوەیەك لە گەڵ خۆمان بردە چیایەکان، بێ ئەوەی ڕێگا بدەین کابرا هیچ شتێك دەربارەی نەخشە ڕاستەقینەکانی ئێمەوە بزانێ.
لە مێژبوو پێوە بووم ئەو گرفتە چارەسەر بکەم: ئایا کێ بکەمە بەرپرسی ئەو نامانەی کە ئێمە لە کوردستانەوە دەماننارد، پێویست بوو ئەوەشم لە بەر چاو بێ کەوا ئێمە زۆربەی جار تەنیا لە هەلومەرجی فرمئالۆزدا دەتوانین نیشانە بنێرین و، لەوانەیە هەموو جارێکیش لە کاتی دیاریکراوی خۆی دانەبێ. کەواتە کێ بێ و بەردەوام چاوە چاوی ئەوەی بێ بەڵکو نامەی ئێمە وەربگرێت؟ باشە ئەگەر هاتوو ئێمە هێمای خۆمان وون کرد و ناچار بووین بە پێی هێمایەکی بە پەلە ئامادەکراو کار بکەین، دەبێ کێ هەبێ بەو جۆرە متمانەی پێ بکرێ هێندە بە نیشانەی نادیارەوە خۆی خەریك بکات تا ئەو کاتەی ماناکەی بۆ ڕوون دەبێتەوە؟ یان ئەگەر هاتوو نیشانەکانی ئێمە زۆر لاواز بوون پشت بەکێ ببەستین بۆ ئەوەی دان بەخۆیدا بگرێ، یان دەزگاکەی نەکوژێنێتەوەو وەرس نەبێ ونەڵێ: «لەگەڵ ئەمەدا هیچم بۆ ناکرێت.»؟
ئەو کاتە چارەسەرم بە دەست کەوت کە تاکە براکەی خۆمم لە بەرلین بەرێ دەکرد. (براکەی ترم هەر زوو لە شەڕدا کوژرا) شەمەندەفەر گەیشت، هێندە پڕ بوو مۆنجەی دەهات لەو سەربازانەی بەرەو ڕووسیا دەگەڕانەوە. (هانزل)م لە پەنجەرەوە پاڵ دایە ناو فارگۆنێکەوە. دەستم دابووە بەر پشتی. لە چەند ووردکەیەکدا شەمەندەفەر بەگڕ کەوت. بیرم لەوە دەکردەوە ئایا دەشێ جارێکی تر پێك بگەینەوە؟
بەغەمبارییەوە گوتم: «ئاخ، خۆزیا بەکارهێنی دەزگای بێتەل دەبوویت.» بەرتەکی دامەوە: «جا کێ دەڵێ من بەکار هێنی دەزگای بێتەل نیم؟»
لە هاوارم دا: «چی، (تۆ) بەکارهێنی بێتەلی؟ بەڵام چتۆیەکی؟ مەبەستم ئەوەیە بەکار هێنێکی زۆر چاکی؟»
فیکەکێشی شەمەندەفەر بەلوورە لوور کەوت و، شەمەندەفەریش وورده وورده کەوتە بزووتن، بەرەو ڕۆژ هەلات. مێشکم هارەی دەهات.
«نا، زۆر چاك نیم،» دەنگی لێوە هات، بەڕادەیەك ئێستاش لە گوێمدا دەزرنگێتەوە، «بەڵام مەیلەو باشم.»
سەری براکـەم لە نێـو ژمـارەیەکی زۆر وزەوەند سەری تردا، لە پەنجەرەی شەمەندەفەرەوە بۆ دەرەوەی هەڵدەروانی. ئێستـاش ڕەنگورووی ئاشناو، ژیکەڵەو، خەمباری ئەوم هەر لەبەر چاوە. جارێکی تریش کڵاوەکـەی بۆ هەڵشـەقاندم، ئیدی شەمەندەفەر لە پێچێکدا وون بوو. ڕەوشتی تایبەتی هانزل ئەوە بوو جێی متمانە بوو، زێدەڕۆیی ی نەبوو.

به خۆمم گوت: «بایەخی پێ دەدەم، لە ماوەیەکی‌کەمدا لە بەکار هێنێکی مەیلەو باشەوە دەتوانم بیکەمە باشترین بەکار هێنی بێتەل.

بیرۆکـراتەکان، شادان و خەندان لەسەر کورسییان دادەنیشتن، باشە ئەمانە چییان دەربارەی کەمیی ئاگردوو و، تەنگانەو، پێویستییەکانی سوپامان، بۆ ئەوەی لە بەرەی شەردا لە تەنگانە دەرباز بێ، دەزانی. سەرەرای هەموو ئەو گرفتانەی ئەوان بۆیان نامەوە، رۆژی دوواتر فەرمانێك گەیشتە تیپەکەی هاترل.

«نایب عەریف یۆهانز میوولەر یەکسەر بۆ فیسارە کەرت لە سەرکرد ایەتیی بالای سوپا بگوازێتەوە.»

بەلام ئایا ئەو کاتە تیپەکەی هانزل لە کوێ بوو؟ لەسەر رێگای بەرەو فرەنسا. ئەو تیپە لە شەرێکی دەستـەو یەخەدا کەوتبووە بەرپالەپەستۆی هێرشێکی توندو، ناچار بوو بوو پاشەکشە بکات بۆ ئەوەی لە رۆژ ئاوادا ووزەو گوری بێتەوە بەر.

ئەوە بوو هانزل چواردە رۆژان بەرەو رۆژهەلات رۆیشت. بەدووای هێزەکەی خۆیدا دەگەرا. بەلام بێ سوود بوو. وویستیان بۆ تیپێکی تری بگوازنەوە بەلام هەستێکی پێشبین هانیدا بەرگری لە خۆی بکـات و نەچێت. سەرەنجام شوێنی تیپەکەی خۆی زانیو وەرچەرخا، بۆماوەی سێ هەفتە بەرەو رۆژئاوای داکێشا.

تازە گەیشتبـووە مەلبەندی نوێی سەرکرد ایەتی کاتێ بانگی بارەگای مەلبەندیان کرد. بیری کردەوە «باشە ئێستا من چیم کردووە؟»

پێیان گوت دەبووایە پێش سێ هەفتە لەبەرلین بوویتایە. «نووستبووی یان چی؟ دەبێ هەر ئەم ئێوارەیە بەرێ بکەوێ. هابەم بۆنەیەوە چۆن دەتوانرێ یەکێك بۆ سەرکرد ایەتی بالا بگوازرێتەوە؟»

نابێت عەریف میوولەر دەسبەجێ لە هەوالەکە گەیشت. دووا جار گوتی «چارەنووس، گەورەم،».

نەیدەویست بلێ «پێوەندی». کابراکەی تر سەرنجێکی سەرتاپاگری دایە، وەك ئەوەی بلێت هانزل بەرژەوەندی خۆی چاك دەزانێ.

بەکـورتی، پاش ئەوەی هانـزلمان بەگەل کەوت، بەرەو چیایەکانی ئەوپەری رۆژئاوای نەمسا کەوتینە رێ. ئەو شوێنە لەبەرلینەوە زۆر دوور بوو. نەك لەترسی بیرۆکراتەکان، بەلکو لەبەر ئەوەی ئێمـە دەمـانویست لەدوورترین شوێنەوە ئەزموونی بەکارهێنانی بێتەل ـ لەگەل تیپێك لەبەرلین، ئەنجام بدەین.

بەهاری ١٩٤٣ بوو، هەرچەندە هێشتا بەفر بەچیایەکانەوە مابوو، بەلام لە دۆلەکاندا تواببووەوە. بەرگێکی تایبەتمان بۆتیپی کوردستان هەبوو. ئێستا دەمانویست لە کۆرەپانی کارێنتیانی خواروو ئەزموونی پێوە بکەین. ئەو بەرگە لەسەر شێوەی پالتۆی ئەفسەرانی فرەنسایی دوورا بوو، رەنگی زۆر چاك لەگـەل هەموو شوێنێك دەگونجا، بەتایبەتیش لەگەل ناوچەی کەژو کێوە رووتەنەکان. داوێنی پالتۆیەکە لەسەر شێوەی ئەلمانیایی هەلبرابوو. گیرفانی گەورە گەورەی هەبوو بۆ ئەوەی پارچەکانی بێتەلی تێدا هەلبگیرێ.

شەروالەکان لە شەروالی چەتر بازان دەچوون، بەلام درێژترو فشوفۆلتر بوون.

گیرفانی بەزریزمیان هەبوو، دەمانتوانی شمەك و وودەوالەی تری تێدا هەلبگرین. هەروەها لەبەر ئەوەی ئەو شەروالانە تەنیا بۆ بەچیادا هەلگەران نەبوون، بگرە بۆ سواریی ئەسپ و کەرو

ووشتـریش بوون، لەبەر ئەوە بەقایش ناوپۆش کرابوون چاکترین پۆستاڵی چەتر بازانمان لەپێ دەکردو چاکترین جۆرە کڵاوی عەریفی ئەفەریقیاییمان لەسەردەنا.

جگـە لە هانـزل دوو کەسی تریشمـان بەگەڵ کەوتن. یەکێکیان تایبەت سەر بەخۆمەوە بوو، مەشقکردوویکی زۆرچاکی بەکارهێنانی بێتەل بوو. پێشتر لە (داوو دەزگای بیانی) کاری کردبوو، بێ ئەوەی هیچ جارێك چووبێتە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست فارسییەکی پەتیی دەزانی.

هەر چەنـدە بروای تەواوم بەهەموو ئەندامانی تری تیپەکەم هەبوو بەڵام سەبارەت بەچەند شتێك ئەم کابرایەی دووایم زۆر بەدڵ نەبوو. هەرچەندە هیچ هۆیەکم بۆ ئەم نابەدڵییەشم نەبوو. گەنجێکی لێزان و لەبارو گورجوگۆڵ بوو، بەرووالەت بەخولیایەکی گەورەشەوە خۆی بۆ ئەو ئەرکە تەرخان کردبوو کەلە پێشماندا بوو.

دووەمیان، ئەو پیاوەی لەدەستەی (رۆمێل)موە هاتبوو. کابرایەکی ئەستێرەناس و زەوییپێوو بوو. باشـە من ئەستـێرەنـاسم بۆچی بوو؟ چونکـە ئەستـێرەناس لە رۆژهەڵات رۆڵی گرنگی دەگێرا. ئەستێرەناس پیاوی ژیرن. سێ پیاوی ژیر بەبێ ئەستێرەناس هیچ ناهێنن. ژیرێکی ئاوەهامان لەگەڵ بوایە پلەوپایەی چاکی بۆ دابین دەکردین.

هەروا کوردستان وولاتێکی چۆلەوانیو کاکی بەکاکی بوو و دانیشتوانێکی پەرژو بڵاوێ هەبوو، دەبوو ئێمە لەو گەشتە دوورو درێژخایەنەماندا خۆ لەو خەڵکە کەمەی ئەوێ ببوێرن. باشە کێ دەیتوانێ ببێتە بەڵەدو رێنیشاندەرمان؟ نەخشەیەکی رێك و پێك نەبوو. لە ئەستێرەناس بترازێ هیچی ترنـەبـوو. ئیتر بەهۆی ئەستێرەو ئامێری لەبارو نەخشەیەکی چاکەوە دەمانتوانی بزانین بەرمان بەکوێوەیە.

ئەستێرەناسەکە بۆی گێرامەوە: «ئەو کاتەی لەگەڵ رۆمێل لەبیابان بووم، کاتێ هەڵومستەیەکمان دەکرد، یەکەمین شت فیلد مارشال لێی دەپرسیم ئەوە بوو: «ئێمە لە کوێین؟» منیش کەرەستەو ئامێرم دەردەهێناو سەرنجی چەند ئەستێرەیەکم دەدا.. هێندێکم کێشانەو پێوانە دەکردو چاوێکم دەدایە نەخشەکەم، بەو شێوەیە دەمتوانی زۆر زوو رووکاری خۆمان بەووردی دیاری بکەم.

بۆ چی دەبوو ئەستێرەناسەکە لە هەمان کاتدا زەوییپێویش بێت! بۆ ئەمە پێویستە بگەرێمەوە سەر بنەکانی نەخشەکەم. ئەو نەخشەیەی من نەخشەیەکی دوورە دیمەن بوو.

بڕیار وابوو یەکەمین جار من و دوو یان سێ کەسی تر خۆمان بەچەتر هەڵدەین، بۆئەوەی نووکی پردێك ـ ئەگەر بشێوا بڵێین، دابمەزرێنین و، بە پارێزو ماتەماتە یەکەمین پێوەندی لەگەڵ کورداندا دروست بکەین. دەبوایە پاشماوەی تیپەکەشم لە ژێر دەستی هانزکریستۆفدا درێژەی بەمەشقی خۆی بدایە.

مەبەستی من ئەوە بوو ئەو پیاوانەی فارسیو عارەبی چاك دەزانن زوو بەزوو وەك چاوساغ و رێنیشـانـدەر بنێرمە لای سەرۆکە کوردەکان. ئینجا پاش تێپەڕینی سێمانگ بەسەر خۆ بەچەتر هەڵدانمان بابەتی وەرگرتنەوەی چاڵەنەوتەکان دەهاتە گۆرێ. خێڵە کوردەکان خۆیان پیاوەکانیمان دەپـاراست و سەرۆك خێڵەکـان خۆیـان بە پێشیـان دەکەوتن. هەر کاتێکیش حەزمان بکردایە دەمانتوانی دیمانەی یەکتر بکەین. بەڵام گرنگترین ئەرکی ئێمە ئەوە بوو کردەمەکە بەرێوە ببەین و بەچاکی ئاگادار بین چی هەیە وچی نییە.

شتێکی چاوەنۆڕکراو نەبوو کە بەریتانیا دەستەپاچە بوەستێ و دەرفەتی ڕوودانی شتێك بدات. بە پێچەوانەوە، هەر دەمودەست سەربازیانِ دەنارده سەر ناوچەی شۆڕش کردوو. هەرچۆنێك بێ، هاوکات لەگەڵ دەست بەسەرداگرتنی ئێمە بەسەر چاڵە نەوتەکاندا، شۆڕش لە ئێران و عێراق و فەلەستین و میسردا دژ بە دژی هەموو هێزەکانی ناو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەهاتە گرگرتن. ئێمە تەواو خۆمان بۆ ئەو ڕاپەڕینە دانووساندبوو و هەموو شتێکمان بۆی کۆك و تەیار کردبوو. لە هەموو بارتێکەوە بڕوامان بەسەرکەوتنی یەکجارەکیمان پتەو بوو.

بەڵام ئایا لە نێوانی هەموو ئەمانەدا زەوییپێو چ شوێنێکی دەگرت؟ ئەو کاتەی نەخشەی سوپایی تەواو سەری دەگرت و، سەربازی ئەڵمانیایی لە هەواوە هەڵدەدرانە سەر زەوی و هی تریش بەزەویدا دەهاتنە فریایان و، هەر دوو باسکی ماشەی ڕووسیا ـ میسر دەهاتنەوە یەك. ئینجا کاتی ئەوە دەهات هەمووله هەموو بۆ پەرەپێدانی ئاشتیانەی کوردستان بە کار بکەوین. لە پێناوی ئەمەدا تەواوی زنجیرەی پسپۆڕانی ئەڵمانیا پێویست دەبوو، هەر لە زەویناس، کشتوکاڵناس و، لێرەوار ناسەوە بگرە تا دەگاتە پسپۆڕانی ئاوەدێری و هتد. یەکەمینی ئەم زنجیرەیە زەوییپێوەکەی لەمەر خۆمانەوە بوو.

پرۆگرامی مەشقەکەی ئێمە تەواو پشتی بە لێوەشاوەیی لەش و ورەو توانای خۆراگری دەبەست. گەردو کۆڵی بەیانیان لەو چەمە چیاییەی بە پێش زنجەکەماندا رادەبوورد مەلەمان دەکرد. ئینجا پاش ئەوەی تاشتێکی چاکمان دەخوارد، دەردەکەوتین. سەرمان لە دووای یەکتر دەنا، یان بە تەلانێکی رژدو هەڵدێردا هەڵدە گەراین. دەمانویست تا دوا پشوو هەر تەکان بدەین و، خۆمان تەواو دڵنیا بکەین ئاخۆ توانای بەرگەگرتنی ئەو تەنگانە ئاستەم و دژوارانەمان هەیە کە لەوانەیە بێنە پێشمان. هەر زوو فێر بووین وەك بزن ـ سرك و بزیۆ بە چیایاندا هەڵگەڕێین و، خۆمان لە ڕێوبانی ئاشکراو ڕچەشکاو لادەین و، لە سەرنجی چاوان بە دوور بین. ئەمە ئەو هونەرە بوو کە دەبوو دوای خۆ هەڵدانمان جێ بەجێ بکەین: بە دزیی چاوانەوە سۆسەی هەموو شتێك بکەین.

مەشقی بێتەلمان گەیشتە ئەو پلەیەی بتوانین لەگەڵ بەرلیندا پێوەندی بکەین. هەمیشە لە کاتی خۆراهێنانـدا ئامێری بێتەلمان لەگەڵ خۆماندا هەڵدەگرت و دەمانویست لە ناهەموارترین هەلو مەرجی بۆ گونجاودا نامە بنێرین و نامە وەرگرین. بۆ نموونە: لە دۆڵی تەنگەبەرو، بنەبانی لێرەوارو نزیکی ڕووبار، یان لە ناو ڕەشەباو هەر هەلومەرجێکی ئەوتۆییدا کە پێوەندیکردن بە ئامێرێکی وەك ئەوەکەی ئێمەوە تا ئەو پەڕی ڕادە دژوار دەبوو.

ڕۆژێکیـان ڕەشــەبـایـەك هەڵی کرد. گوتمـان ئەمە هەلێکی چاکە بۆ ئەوەی لێزانینی خۆمان بئەزموونین. بە گورجی بە سینگەر بێڕگ دا هەڵگەڕاین. دەزگاکەمان لە کات و ساتی بڕیار لەسەر دراودا دامەزراندو ئاریەلمان هەڵدا، ویستمان پێوەندی بە بەرلینەوە بکەین. ئەو (کات)ەی لەگەڵ لایـەنـەکـەی تردا لەســەری ڕێك کەوتبووین خەریك بوو نزیك دەکەوتەوە. گەواڵەیەك هێنای و هەورێکی تاریك نیشتە سەرمان و ئاسمان بە برووسکە کەوت. هەموو شتێك رەش داگەڕا. کلیلەکە بە تکەتك لە یەکبینە مۆرسی morse ی نارد. نۆرەی (فریتز) بوو، سەرێرێکیم کردو پرسیم:

«هیچ پێوەندێك هەیە؟»

سەری بۆ لە قاندم و ئەو نامەیەی لێ وەرگرتم پێش ماوەیەك بەپەلە نووسیبووم و ئەوانیش هەر

ئەو کاتە گۆڕیبوویانە هێما. پاشان نۆرە هاتە سەر ئەوانیتر و هەموویان یەکە یەکە فێربوون چۆن لە کاتی خۆراهێنان لەگەڵ بارودۆخی نا هەمواردا، دان بە خۆدابگرن. بەکار هێنی بێتەل ئەگەر بشڵەژێ کاتی زۆر گرنگ بە فیڕۆ دەدا، لە نامە ناردن و نامە وەرگرتن هەڵە دەکات و بە ناچاری کارەکەی دووبارەو سێبارە دەکاتەوەو سەرەنجام هەموو شتێك پێنج هێندەی کات پێ دەوێ. پیاوەکانم هەروەکو ئامێر دێر دوای دێری نامەکەیان بە ووردی دەگوتەوە.

باران دایکرد، یەکە یەکە فەرمانم دا بوونێ: پاش ئەوەی نامە ناردن تەواو دەبێ، چی بکەن. لەوێ، هەریەکەو لە پەنایەك خۆی وا مەڵاس دابوو هەر دەتگوت لە وڵاتی دوژمنن. دەبوو هەر کەســە و پشت بە خۆی ببەستێ. بە هۆی تێك هەڵچوون و گرمەی گەواڵە و برووسك دەبوو لەشیکردنەوەی ئەو نامانەی لە بەرلینەوە وەرمان دەگرتن، زۆر رژدو ووریابین. باران ئازاری نەدەداین بەڵام بڕووسك تەنگی پێمان هەڵدەچنی‌و موچرکەی ترسی دەبردە دڵمانەوە. ئاریەلەکەمان بوو بووە گەیەنەری هەورە برووسکەو لەبەر ئەوەی خۆمان بە ئامێرەکانەوە هەڵپەساردبوو، لە سەرمانا ووشك هەڵاتبووم. سەرنجی برووسکم دەدا، هەر دەهات ویچووکترین‌راتەکین بەناو لەشی ئێمەوە گوزەری دەکرد. لەوێ هەڵتروشکا بووم، لەسەرمانا ووشك هەڵاتبووم. سەرنجی برووسکم دەدا، هەر دەهات و نزیکتر دەکەوتەوە. ها ئێستا کیلۆمەترێکە، ها ئێستا نیو کیلۆمەچتر دوورە. لە هەمان کات سەرنجی رەنگ و رووی بەکارهێنەکەم دەدا. بە دەستێك نامەکانی گرتبوو و، بەدەستەکەی تریشی تك تك دەیکوتان. هات بە بیرمدا: دەبێ زوو تەواوی بکات، ئەگەر نا دەبێ نامەردنەکە رابگرم چونکە ئێستا نا ئێستا برووسك لێ دەدا. پاشان ـ لە دووا چرکەدا، زەمینم دایێ چۆن هەربە پەلە دووا نیشانەی نامەکەی هەنارد. کاکی بەکارهێن کەڵەمبازێکی هەڵدا، بە خۆی و ئامـێری بن هەنگڵیەوە، چۆن فەرمانی درابوویێ هەر بەتەقڵە کوت لە تەلانەکەوە سەراولێژ بووەوە ئەوانی تریش دوا بە دوای ئەو، پاش ئەوەی ئاریەکەیان تەواو هەڵوەشاندەوە بە راکردن شۆر بوونەوەو هەر بە رێوە شتەکانیان گورزە بەست کرد. هێندەی نەبرد

دۆزەخمان لێ رابوو، باو بۆرانێك هەستا! نەبێتەوە! گرم و هۆری گەواڵەو برووسك، دەتگووت دنیا فرا دەبێ. سەرباری هەمووشی زریانێکی دەست و پێ تەزێن هەڵی کرد. هەر زوو زەوی یەکپارچە سپی هەڵگەرا.

کاتێ گەیشتینە پاوانەکان چۆنی بۆمان کرا لێیان دابەزین: بە پێیان و بەگاگۆلکێ‌و بە خۆخشاندن. لەژێرەوە هەڵوەستەیەکمان کرد. گوتم:

«هەی ئافەرین، بەراستی چاپوکن» پاشان بۆ ئەوەی بادەیەکی گەرم بنۆشین روومان لە خانێکی بچووکی ئەو ناوە کرد.

## رەمزی

که رەمزی گەیشتە لای ئێمە نەیدەزانی چیمان لێی دەوێ. پیاوانی ئەستەمووڵان ئەرکی خۆیان بەچاکی راپەراندبوو. بیری ئەویان خوێندبووەوە بێ‌ئەوەی بەئاشکرا باسی هیچ شتێکی لەگەڵ بکەن. ئەمە کلیلی کاری خەفیەیە: بێ ئەوەی هیچ شتێك بپرسیت، هیچ شتێك بڵێیت، لەهەمان

کاتـدا چیت پێـویست بێ لە کەسێکی دەربهێنی. لە ژیـانی ئاساییدا ئەم شتە کارێکی گرانە، لەسەردەمی شەڕو لە وڵاتی دوژمندا گرانتریشە، چونکە لەوێ ملی پیاو لەبەر چەقۆدایە. لەمەش بەولاوەتـر ئەگـەر هەردوو لا لەنیازی یەکتر بگەن ئەوا ڕووبەڕوو بوون زۆر گرانتریش دەبێت. بەکورتی، ووتوویژێکی برادەرانەی بێلایەن دێتە گۆرێ؛ بۆنموونە لەبارەی ئاوهەواوە دەدوێ ـ بەلاّم خەفیەیەکی چاك هەمیشە هەندێ شت لەم جۆرە دیدەنییانەوە وەردەگرێ. هەرچەندە ئەمە برێکی زۆر کەمی سەرجـەم ڕێبـازی کاری خەفیـەییـە. باشـە خەفیـە چۆن ئەم کارەی پێ هەڵدەسووڕێ؟ ئەمەیان هونەرێکە بۆخۆی. وەك چاپوکیی ڕەوت و بزاوتی تیاترۆی سەرتەناف وایە، خۆی بۆ لێکدانەوەی ئاسایی بەدەستەوە نادات. هەر پسپۆر دەزانێ چۆنی بکات و هونەرەکەشی لەم لێزانینەیەوە سەرچاوە هەڵدەگرێ.

ڕاپـۆرتی هەنـدێـك نوێنـەری ئەستـەمـووڵمان لەسەر ئەو بڕوایە بوون کە ڕەمزی کوردێکی دەمارکرژەو زۆر تامەزرۆی ئازادیو سەرفرازیی کوردستانە. لەڕێگای برادەرێکەوە کە ڕەمزی لە ڕۆژانی خوێنـدکـاریەتییەوە لەتورکیا ناسیبووی، بۆرە ئاماژەیەکی بۆکرابوو کەوا شتێکی چاکە ئەگەر بێو خۆی لە هەندێك داروپەستەکی ئەڵمانی نزیك بکاتەوە. هەروەها ئەو برادەرە کاغەزی بەدرۆی بۆ ڕێك خستبوو بۆ ئەوەی پەساپۆرتەکەی خۆی مۆری لە تورکیا دەرچوون یان چوونە ناو ئەڵمانیای پێوە نەنرێ. لەبارێکدا ئەگەر هاتوو کەڵکی ئێمەی نەدا یان خۆی حەزی نەکرد لەکارەکەی ئێمە بەشداربێ ئەوا بتوانێ بچێتەوە تورکیا بەبێ ئەوەی کەس پێ بزانێ. لە ڕاستیدا، ڕەمزی دەیتوانی بەزەویشدا بچێتەوە ووڵات و هەموو شتێك بۆ خۆبەچەتر هەڵدانی چاوەنۆرکراوی ئێمە ئامادە بکات.

ئەوەبـوو ڕەمزی لێرە لەگەڵ ئێمەدا بوو بێ ئەوەی هیچ شتێك دەربارەی نەخشەکانی ئێمەوە بزانێ. بیرم کردەوە: چەنـد گرنگە ئەگەر بۆ کارەکەی خۆمانی ڕاکێشین. کورد جەنگاوەری گیان لەسەر دەست و جەربەزەن. چەندێك ئەرك ئاڵۆزترو بەمەترسیتر بێت هێندەی تر ڕێزت لێ دەنێن و شەیدای خۆ بەگەڵدانی ئەو ئەرکە دەبن. منیش تەواو دڵنیای ئەوە بووم ئەگەر ڕەمزی ماوەیەك لەگـەڵ ئێمـەدا بژیـایە هێندەی نەدەبرد دۆستایەتیمان لەنێواندا دروست دەبوو و وەك شتێکی چاوەنـۆرکراویش بەگەڵمان دەکەوت. چۆنم دانابوو ئاوەها دەرچوو. هەر زوو هاتینە سەر ئەوەی ڕێـزی لێ بنێـین وەك چۆن ئەویش ڕێـزی لێ دەنـاین. ئەوە بوو لەمـاوەیـەکی زۆرکەمدا بڕواو متمانەیەکی هاوبەشمان لە نێواندا پەیدا بوو.

ڕەمزی، پاش ئەوەی گەیشتە لامان، دەسبەجێ لەگەڵ ئێمەدا بە (سینگەر بێرگ) دا هەڵگەڕاو بەچاوی خۆی زریانەکەی بینی. کاتێ سووك و بزێو وەك بزن لە چیایەکەوە دابەزین هێشتا ئەو سووکتـر و چاپـوکتـر بوو. لەکاتی هەرە پڕمەترسیو تەنگاوەدا، وەك وورچ بەهێزو خۆراگر بوو. کەفەرمانی بڵاوەکردنیشمان دا، ڕەمزی وەك مامز گورج و لەشسووك بوو. ئێستا بارێکی گرانم لەسەر مێشك لاچوو. ئەو کاتەی لە کوردستان دادەبەزیین هەموو شت زۆر ئاسانتر دەبوو.

گوتی: «باوکم سەرۆك خێڵەو لە هەولێر دادەنیشێ. خێڵەکەشی لە چیایان دەژین.» چووە نزیك نەخشەگەورەکەی کوردستان، کە بەدیوارەوە هەڵواسرابوو. پەنجەی ڕاکێشاو گوتی: «هالێرە.»
پرسیم: «ڕەمزی خێزانەکەتان لە کوێوە هاتووە؟»

گوتی: «دایکم له خێڵێکی تره. بەداخەوە ئێستاکە مردووه. خێڵەکەی دایکم لەبەری ڕۆژهەڵاتی خێڵەکەی ئێمەوە دەژین. هەمیشە لەوێش ڕێزم لێ دەگیرێ.»

هەموو ئەو شتانەی ڕەمزی بۆی باس کردم، بەووردی تاوتوێم کردن. ئەو شتانە بۆ ئەو کاتەی دەهاتینە سەر نەخشەکێشانی هەموو وورد ایەتییەکی خۆهەڵدان و کاری داهاتوومان، زۆر گرنگ دەبوون.

کەهەستی کرد من پێوەنیی خێڵەکییانەی ئەوم زۆر بەدڵە، کەیفی هاتێ. درێژەی دایێو گوتی: «بـروێنێ، چاکتـرین برادەرم لەم گوندە بچووکەدا دەژی، ئامۆزامە. بە (خوێنبرا) بانگی یەکتر دەکەین. باوکی سەرۆکی خێڵێکی بچووکەو زەویوزارێکی کەمی لەژێر دەستە، بەڵام لەبەر ئەوەی کەوتوونەتە بناری چیایان، دەرامەتێکی چاکی لە چاندنی دانەوێڵەوە پێ دەبڕێ. بۆیە دەیتوانی خەرجیی خوێنـدنی کورە گەورەکەی لە خوێندنگای بەرز لەبەغدا دابین بکات. من و ئامۆزاکەم چەندین ساڵ لەبەغدا پێکەوە بووین و، گەلێك جار نەخشەمان بۆ ئازادیی کوردستان دەکێشا.»

بێگومان، زۆرم پێ خۆش بوو کە دەمبیست بەو شێوەیە دەدوا. وابێ دەچوو هەموو شتێك ڕوو لە باشە بێت.

(بۆدێنتەل) کەوتبووە نێوانی چیا بەرزەکانی سەرسنووری هەردوو ناوچەی ئەڵمانیو سلاڤی زمـانــەوە. هەنـدێ لە جووتیارانی ناوچەکە سلاڤی بوون و دوژمنداریی ئێمەیان دەکرد. بەڵام جووتیـارانی بەرەگــەز ئەڵمان بە خوایشتی خۆیان نان و شیریان بۆ دەناردین. سلاڤەکان تەنیا سەرنجی ترشاو و دوژمنانەیان دەدایێ. ناوبەناو دەمانبیستەوە کەتاڵانکەرانی سلاڤ پەلاماری نیشتمـانییەکانی ئەڵمانیان دەدا. ئەوە بوو ئێمەش خۆمان ووشت ووریادار کرد. چەند ڕۆژێکی پێشووتر دەستە چەتەیەکی پرچەك و دەمامکدار بەزەبری هێز چوو بوونە ناو سینەمایەکی ئەوناوە. یەکێکیـان هێنـابووە دەرەوە، دابوویانە بەر دەسرێژو کوشتبوویان. پاشان بزر بوو بوون. زۆر کەسیان لەو نزیکانە هەبوون بۆ ئەوەی بیانشێرنەوە.

ڕۆژێکیان لەمەشقی ڕێڕۆیشتن ڕووەمان دایە گوندێکی بچووك، گوندەکە ناوی( گلاکین فۆرتەر هۆلدینـگ) بوو. دووای هەفتـەیـەك ئەو گوندە لەلایەن چەتەکانی سلاڤەوە ئاگری بەردرایێ، تا کلۆکۆی دامرکایەوە سووتا. پاش ئەوەی ئێمە ڕۆیشتین پیرە جووتیارێکی ڕووخۆش و نان بدە هەر زوو زەوییە کرێگرتەکەی لەدەست چوو چونکە نەدەبوو میوانداریی ئێمەی بەچاکی بکردایە.

بەونیازەی بێ ئەوەی پێویست بکات سلاڤەکان توورە نەکەین، خۆمان هەمیشە وا دەنواند کە ئێمــە پتـر سەرگــەرمی کۆچکـردنـێن نەك چالاکی کردن و، هەروەهــا لە شاردنــەوەی چالاکییە هەرەچڕەکەی خۆمانیشدا بەتەواوی سەرکەوتین. ئەگەر لێمانیان بپرسیایە ئێوە کێن بەخۆتان و ئەو دەستەبەرگە سەیرو سەمەرەیەی بەرتانەوە. یازایانە دەمانگوت:

«سەربەلیوای یەکەمی کەمێلی ڕۆژهەڵاتی ئەفەریقاین.»

بۆ ئەوەی وەك سەربــازی بێبــەرێو حەز لە کۆچکـردن خۆ هەڵخەین، هەمیشە دەمانچەمان بەکــەلەکــەمـانــەوە شۆڕ دەکـردەوەو بێتــەل و شتی ترمـان لەناو کۆڵەپشتەکانمان هەڵدەگرت. لەزنجەکەماندا، بەردەوام چەند تفەنگێکی ئامادەو نزیکە دەستمان هەبوونەبادا شەوێك بەسەرماندا بدرێو ناچـاربـین داکـۆکی لەخۆمان بکەین. لەڕاستیدا، ئەو بارودۆخەی خۆمان تێدا دەبینی،

لەلایەك بەدۆستەوە گەمارۆ درابووین و لەلایەکی تر بەدوژمنەوە، باشترین هەل بوو بۆ ئەو کردەوەیەی نەخشەمان بۆی دەکێشا. پێکەنینمان هات کاتێ رۆژێکیان ئەندامێکی پارتی سەری لێدابین. دەیویست بزانێ ئەم لیوای یەکەمی کەمێلی ئەفەریقایە چییەو لەم ناوە چی دەکات. بە ئۆتۆمۆبێل هات، بەرگێکی پارتییانەی لەبەردابوو، هاورێیەکی تفەنگ لەنێو دەست و ئامادەشی لەگەڵدابوو. خوا خوامان بوو دراوسێ سلاڤەکانمان سۆسەی ئەم سەردانەیان نەکردبێ.

ئێوارەکیان تازە تاریك داهاتبوو. بەتەنیایی بۆ پیاسە چوومە دەرەوە. لەخانووی ماڵە جووتیارەکاندا کە تەواوێك لەیەکترەوە دوور بوون، ئاگر دەسووتا. پیاو دەیتوانی بەچاکی سەرنج بدات چۆن کاری ناو گەوری مەرومالات تەواو دەبێو چۆن خێزانەکان لە ژووری دانیشتن کۆدەبنەوە بۆ شیوی ئێوارە. شیوەکەیان شۆربایەکی خەستی شیرە یان ووردکە گەنمەشامییە. پاشان دەخزێنە ناو نوێنەکانیانەوە. لەنێوانی ئەم تێرامانە بەشێنەییەوە، شتێکی لەناکاو وای لێکردم لە شوێنی خۆم رۆبنیشم و لەو پەری ئامادەییدا دابم. ترووسکەی رووناکییەکم کەوتە بەرچاو. نەمتوانی بریار بدەم ئەمە مۆرس بوو یان چی بوو. بەووردی سەرنجم راگرت بزانم ئاخۆ نیشانەی تر پەیدا دەبن یان نا. لەوانەیە نیشانەیەکیان لە نێوانی خۆیان دا هەبێو بتوانن لە یەکتر بگەن. یان رەنگە یەکێکی تر لە شوێنێکەوە وەلام بداتەوە. یان دەشێ یەکێك بێ حەزمان پێبکاو بیەوێ بەم شەوە بگاتە لامان؟ کاتێ لە خەرەندەکە وورد بوومەوە پیلێکی تیشکدەری گیرفان لە پشتمەوە داگیرسا. کورت ـ درێژ ـ کورت ـ درێژ ـ کورت ـ ووچانێك ـ درێژ ـ کورت ـ تەواو بوو. ئەو لایەتەی من سەیرم دەکرد بە (درێژ وەلامی دایەوە. ئەمە وا دەگەیێنێ نامەکە گەیشت. ئالوگۆرەکە تەواو بوو. بەم جۆرە ئەوشتەی بۆم روون بووەوە ئەوە بوو ئەو دوو ماڵە سلاڤییە سەرچاوەی مەترسی بوون بۆ ئێمە.

بیرم کردەوە «ئاگادار بن، برادەرینە، زۆر خۆتان گەوج مەکەن و هێندەمان لێ نزیك مەکەونەوە.»

بە هەراکردن گەرامەوە لای زنجەکەمان. باسەکەم بۆ پیاوەکانم گێرایەوە. زۆرم کەیف هات لەوەی هیچ باکیان پێ نەبوو.

«وازیان لێ بێنە»، گوتیان، «باهەولێ شتێك بدەن.»

ئێمە تەواو خۆمان بە نێردەکەی خۆمانەوە خەریك کردبوو گوایە چاڵە نەوتەکانی کوردستان داگیر دەکەین و هەرگیز بیرمان لەوە نەکردبووەوە چەتەی بۆ دێنتەل بەسەرماندا زاڵ دەبن. بێ گومان ئەگەر بەرەنگاری یەکتر بوایەین ئەوا ئێمە ئەوانمان لەناو دەبرد نەك شتێکی تر.

هەرچۆنێك بێت، ئەو شەوەمان بەبێ رووداو بەرێ کرد و بۆ بەیانیش وەکو جاران دەستمان کردەوە بەگەشتی دوورو درێژ و بەهەورازدا هەڵگەران و مەشقی مۆرس ناردن.

پێویستە سەرۆکی نێردە بیر لە هەموو شتێك بکاتەوە. لە کوردستان، ددانساز نەبوو. کورد منداڵی سروشتن و ئەم جۆرە شتانەیان پێ ناوێ. ددانیان وەك ددانی گورگ ساغ و پتەون. بەلام ئەدی ئێمە، ئێمەی شارستانی بەستەزمانی ئەوروپایی؟ ئەگەر یەکێکمان ددانی ئێشا چیی بەسەردەهات؟ ددان ئێشە بەجۆرێك ئازاری مرۆ دەدا پەکی دەکەوێنی. لەبەرئەوە دەبوو پێش ئەوەی روومان لە کوردستان بکردایە، ددانی هەمووومان بپشکنرێ. سەرەرای ئەمەش ددانسازی تیپەکەی خۆمان تاخمی ووردەواڵەی کارەکەی خۆی کۆکردبووەو ئێمەش بریارمان دا تواناو

لێزانینی ئەو بئەزموونین.

بڕیارم دا خۆم بکەم بەیەکەمین قوربانیی (شمیدتی بچکۆل).

«فەرموو کاپتن، سەرکەوە،» لە بانیژەکەی سەرەوەرا کە شتومەکەکانی خۆی لەوێ دانابوو، بانگی کردم. بەپێلیکانەدا سەرکەوتم. هەلوەستەیەکم کردو دەرزیلەی دەمانچەکەمم دەرهێنا. کورسییەکی گەورە لەبەرامبەری پەنجەرەکەدا داندرا بوو بۆ ئەوەی بەتەواوی ڕووناکیی بگاتێ.

شمیدتی بچکۆل تێمەوە ڕاما.

«دەتەوێ چی بکەی، کاپتن؟ لەکاتی ئیشی من دەتەوێ چۆلەکان بکوژی؟ شتی وانابێ. پێویستە بەبێ جوولە دابنیشێ.»

بەڕوو درژییەوە گوتم: «شمیدت تۆم زۆر خۆش دەوێ، بەهیوام تەمەنێکی دوورو درێژ بژیت. بەلام بەگەر ژیانی خۆت بەلاوە بەنرخە، ئاگادار بە،» لەسەر کورسییەکە دانیشتم «ئاگادار بە ئەو کاتەی (درێل ـ drill )ەکەت بەکار دێنی، هەست بە هیچ ئێشێك نەکەم.»

جا بەڕاستیش هەر ئاوەها بوو. دەست و پلی چاپوکی ئەو درێلەکەی کردە مایەی نیوچە ڕابواردنێك. بەدرێژایی ژیانم هیچ جارێك ددانسازی ئاوەهاو، هەروەها هیچ جارێکیش کورتە بالای وەك شمیدتی بچکۆلم نەدیبوو.

ئەو ڕۆژەمان بە گالتەو گەپەوە بەسەر برد. کەس توورە نەدەبوو. کاتێ یەکێك نوختەیەکی وەردەگرت هەمووومان دەمانکردە بەزم و پێکەنین.

بەلام سەبارەت بە ئابڕووی پیشەزانییەوە، شمیدتی بچکۆلم توورە کرد. چونکە ئەو کاتەی بەمنەوە خەریك بوو و درێلەکەی دەهێناو دەبردو ئەوانی تریش لە ژێرەوە لە چاوەنۆری دانیشتبوون، من دەستم کردە هەراو نالە. تەنانەت کاتێ تەواویش بووم هەر نالە نالم بوو.

گوتی: «کاپتن، کاپتن، بێدەنگ بە، بێدەنگ بە. ئێستا ئەوانی تر پێیان وا دەبێ بەڕاستی ژان دەکات. واتێ دەگەن من کاری خۆم بەباشی نازانم.»

لە پێکەنینم دا. وازم لێی هێنا بەکاری خۆیەوە خەریك بێت، بێ ئەوەی چیتر بە دەم ژانەوە نرکەو نالەم لێ هەستی و دەمانچە هەلکێشم. ئەوانیتر لە ژێرەوە هەر خەریکی گالتەو پێکەنین بوون.

ئەو کاتە ڕەمزی بوو بووە یەکێك لە ئێمە. نەخشەکەی خۆمانم بۆی باس کرد. بەلام بێ ئەوەی لێی بپرسم داخوا بە گەلمان دەکەوێت یان نا. دەمویست تا پێم دەکرێ پرسیارەکە دوواتر بخەم بۆ ئەوەی خۆم لە وەلامی ناخۆشی (نەخێر) بە دوور بگرم. پێم وابوو چەندی دۆستایەتیمان پتەوتر بێ و چەندی پتر متمانە بە تواناکان و نەخشەکەمان بکات، هێندەی تر (بەلێ) یەکەی نێرانەتر و بە جۆشتر دەبێ. دەرفەتێکی لە بارم بە هەل زانی، بانگی هانز کریستۆف و ڕەمزیم کرد بۆ ئەوەی پیاسەیەکیان لەگەلدا بکەن. دیمەنێکی دلرفێنی کەژو کێوان کەو تبووە دەورو پشتمانەوە.

«ڕەمزی من وولاتی خۆمم خۆشدەوێ» گوتم

«پێت بروا دەکەم» وەلامی دامەوە.

«ڕەمزی، من کوردستانیشم خۆشدەوێ» گوتم

«تۆ کەژو کێوە سەختەکانت خۆشدەوێ» بۆی زیاد کرد.

«وولاتی تۆ وولاتی منە» گوتم

«خوابکا وابێ، کاپتن»
«رەمزی، تۆ لێرە لە ئەڵمانیا دڵخۆشی؟» پرسیارم لێی کرد.
«دڵخۆش؟ بەڵێ، چونکە دەتوانم لەگەڵ تۆبم.»
«نەخێر، رەمزی ئەگەر خوا حەز بکات دەبێ بەم نزیکانە بچم لە خوێندگاکەی تۆ فێری زانست ببم» وەڵامیم دایەوە.
«من لەگەڵ زانستدا تەبانیم، بەڵام تۆ حەزی لێ دەکەی» گوتی:
«زانست بەلای منەوە تاکە شتێکە ـ کارە» گوتم.
«کاتێ پیاو شتێکی راست دەکات، ئەوە زانستە» گوتی.تاوێکی تر بێدەنگ بووین.
«جارێکیان دوو هەڵۆ هەبوون،» دەستم پێ کرد.
«خوێنبرای یەکتر بوون،» تەواوی کرد.
«پێکەوە بەرەو رۆژ فرین و شێرێکیان بینی،» درێژەم دایێ «لە سەرووی دیجلەو فوراتەوە،» وەڵامی دامەوە.
«پێکەوە دابەزینە سەر شێرەکە» بەردەوام بووم.
«نێچیرکەیان لە بن دەستی دەرهێنا» رەمزی چیرۆکەکەی تەواو کرد.
ووچانێکی تر بەسەر چوو. لە یەکترمان نۆری.
«زۆر باشە کاپتن،» گوتی «من قایلم»
«بە پیاوەکانم گوت:
«رەمزی لە گەڵمان دێت،»
یەکێك لە پیاوەکانم هیچ متمانەم پێی نەبوو. پرسیاری کرد «رەمزی؟» ئاوازی دەنگی تەواو نالەبار بوو. دوو رۆژ دوواتر هانز کریستۆف هاتە لام گوتی: شتێکی گرنگ هەیە دەمەوێ پێتی رابگەینم. سەرنجێکی بە گومانەوەم بۆی هەڵبری.
گوتی: پێم وایە تیپەکەمان یەکێکی تێدایە بە کەڵك نایەت. کەسێکی گونجاو نییە»
پرسیم: «مەبەست (س)ە؟»
گوتی «بەڵێ،»
پرسیم: «چی کردووە؟»
«هەمیشە خەریکی ئەوەیە پیاوەکان لە دژی تۆ بووەستێنێ.»
پرسیم: «ها، ئینجا کێ گوێی لێ دەگرێت؟»
«پێم وایە کەس،»
«لە دژی نێرەکەش قسان دەکات؟»
«ئەمەیان نازانم.» هانز کریستۆف وەڵامی دامەوە.
یەکێك لە پیاوەکانم بردە لایەکەوەو دەربارەی (س) پرسیارم لێ کرد.
وەڵامی دامەوە: «ئەمە دۆستی تۆ نییە کاپتن.»
پرسیم: «بیرو باوەری پیاوەکان دەربارەی ئەو چۆنە؟»
«دەم شڕێکی بڕوا پێ نەکراو»

«چی لێ بکەم باشە؟»
«بیکوژە. دەسەڵاتت بە دەستە. ئەو کاتە ناتوانێ هیچ شتێك ئاشکرا بکات.»
گوتم: «باوەڕ ناکەم غایەن بێت» بیرم بۆ ئەوە چوو دەبێ تا ئەم ڕادەیە بەرگریی لێ بکەم. «پێم وایە کەیفی بە من نایەت. بەڵام هەر چۆنێك بێت پۆیستە بڕوا.»
ئەو پیاوەی لەگەڵی دەدووام تەنیا شانێکی هەڵتەکاندو هیچی تری نەگوت.
ئەو ئێوارەیە لەگەڵ هەموویان دووام و یەکە یەکە هەمان پرسیارم لێ کردن. هەموویان سووڕ بوون لە سەر ئەوەی کابرای ناوبراو لە ناو ئێمەدا لایدەیە. ئەو پیاوە بە ڕووالەت وای خۆ دەنواند کە تا ئەوپەڕی شێلگیری لەگەڵ من و کارەکەمدایە بەڵام لە پاش ملە دژی خۆم و نێرەکەم بوو. پاشان کابرام بانگ کردە لایەکەوە و ڕوو بەڕوو پرسیارم لێی کرد بۆچی وا دەکا و چی بە دەستەوەیە. دەستی بە هات و هاوارو پاکـانـەی خۆ کردن کرد، کەوتـە گازاندەو گلەیی ئەوەی ئەوانیتر ئەو شتانەیان لە دژی ئەو هەڵبەستووە. دەمودەست ڕەوانەی بەرلینم کرد. بارەگای مەڵبەندم ئاگادار کردەوە ئیتر ئەو کابرایە کەڵکی من ناگرێت. هەروا دەبێ کابرا سوێند بخوات نهێنی نەخشەکەی ئێمـە بپـارێـزێت و هەروا ووریـا بێت بچووکترین لە دەم دەرچوونی هەر شتێك غایەنەتییەکی گەورەیەو دەیخاتە بەردەم سزای مردنەوە.
دوو ڕۆژ دوواتر، برووسکەیەك لە بەرلینەوە هات. برووسکەکە هەراو بەزمێکی گەورەی نایەوە. نووسیبووی «سەرکردایەتی بەرزی سوپا کردەوەی مامۆنت دەست لە کار هەڵبگرێ و دەسبەجێ بگەڕێتەوە بەرلین.»
جارێکی تریش خوێندمەوە. دەبێ سپی هەڵگەڕابم، چونکە کەس نەیوێرا زاری لێك بکاتەوەو بپرسێ چیی تێدایە. لە کۆتاییدا هانز کریستۆف هاتە قسە:
«هیچ شتێك ڕوویداوە؟»
هەواڵەکەم دایە دەستی. هەموویان بێدەنگ وەستا بوون. تەواو شڵەژا بوون. بە وورتە وورتێکەوە لە بەر خۆمەوە گوتم «ئەمە هەر نابێ، هەر نابێ!» هەموویان دەستیان بە دەربڕینی بێزاری کرد «دەبێ ئەمە هەڵە بێت، کاپتن!» «دەبێ هەڵەبێت.» وەڵامم دانەوە.
ڕووم کردە نزیکترین دایەرەی پۆستە و تەلیفۆنێکی بەپەلەم یادداشت کرد. گرنگ نەبوو چەندی تێ دەچێ، دەبوو بزانم چی ڕوویداوە. تەلیفۆنێکی بەپەلەم کرد. یەکێکی دەسەڵاتداری لە بارم چنـگ نەکـەوت. بەڵام-تێ گەیشتم نامـەکـە بە هەڵە نییـە و دەبێ یەکسەر بچینەوە بەرلین بەو مەبـەستـەی دەست لە کردەوەکـە هەڵگرین. تەلەفۆنەکەم دانایەوە، تەواو شڵەژابووم. هیچ تێ نەدەگەیشتم چۆن فەرمانی وەستاندنی کارێکی ئاوەها گرنگ دەدرێت، ئێمە نەوتی کوردمان پێ دەوێت. لە هەموو شوێنێکی بەرەی شەڕ ئاگردوو کەم بووە، نەوت کەم بووە. شتێکی ئەو تۆ لە گۆڕێ نییە ئەم وورە بەزینە بخوازێ. ئەوا منیش لێرەم، لەگەڵ پیاوەکانم، ئامادەی ئەرك و فەرمانین.
پیاوی جەربەزەو بە وورە و مەشقکردووم لەگەڵدایە. لە نێوانی ئەوانیش دا کوردێکی دراوسێی چاڵە نەوتەکانمان هەیەو هیواو ئامانجی تەواو لەگەڵ هیواو ئامانجی ئێمەدا کۆکە. هەموو ئەم شتانە دەستیان لێ هەڵبگیرێ؟ هیچ مەبەستێکی ڕەوام تێدا نەدەبینی. بە لارەملی ئامێرەکانمان کۆکردەوە. گالیسکەیەکمان داوا کردو کەلوپەلمان بردە خوارەوەو لە شەمەندەفەرمان بار کردن.

لە بەرلین، هەر بە پەلە خۆم گەیاندە کەرتی دژە خەفیەیی سەرکردایەتیی بەرزی سوپا. سەرۆکی بەشەکە لەوێ نەبوو، بەڵام جێگرەکەی بە گەرمییەوە ـ بەو پەڕی گەرمییەوە، وەری گرتمەوە.

بەداخەوە ناتوانم زانیاریی ترت پێ بڵێم. فیسارە فەرماندەر بەر پرسی دەرکردنی فەرمانی دەست لێ هەڵگرتنی کارەکەیە. ڕەنگە بیانووی بەجێی هەبێت.» ئەمە زۆر بوو بۆ من.

«کۆلۆنیل! فیلد مارشاڵ کەیتل خۆی فەرمانی ئامادەکردن و جێ بەجێ کردنی کارەکەی داوە. من خۆم لە بارەگای مەڵبەند بووم و لەگەڵ ئەفسەرەکانی ژێر فەرماندەی ئەو قسەم کردوەو تکایان لێ کردم زوو جێ بەجێی بکەم. چونکە ڕاپۆرتی بڕواپێکراوی لە باکووری عێراق و، ڕۆژئاوای ئێران و، ڕۆژهەڵاتی تورکیاوە هاتوو، نیشانی ئەوە دەدەن کەوا خەریکە پەرەگرتنی نوێ لە هەمان ئەو ناوچەیەدا ڕوو دەدا کە کارەکەی منی پێوە بەندە.»

کۆلۆنیلەکـە دانیشتبـوو سەیری دەکردم. بە تووڕەیی جگەرەی دەکێشا. وام دەزانی ئێستا دۆزەخم لێ هەڵدەستێ: «خـۆت بەچی تێ دەگـەی؟ پێت وایـە دەتـوانی دژی فەرمـانـدەری سەرکردایەتیی بەرزی سوپا بووەستێ؟ تۆ شێتی؟» ئەمە وەڵامێکی ئاسایی بوو ئەگەر بیرت لەگەڵ بیری فەرماندەرەکەت ڕێك نەکەوێت. بەڵام وەڵامەکە تەواو جودا بوو. لە جاران نەرمترو بە تۆرەتر هاتە دوو.

«جارێکی تر دەچمەوە سەر بناوانی مەسەلەکەو پێی دەکەوم. پاش چەند ڕۆژێکی تر ئەنجامەکەت دەدەمەوە دەست.»

گوتم: «سەیرکە گەورەم. سووتەنی بۆ ئێمە چەند گرنگە، وانییە؟ چەند گرنگە ئەم سووتەنییە بۆ سوپامان مسۆگەر بکەم؟ من ئەمەم بۆ دەکرێ. تەنیا دوو سێ هەفتەی ترم پێ دەوێ وئامادە دەبـ لە ڕاستیدا ئەگەر حەزیش دەکەن، سبەی یان دوو سبەی بە فڕۆکە بەڕێ دەکەوم. بەڵام ئەگەر فەرمانی وەستاندنی هەموو شتێك وەك خۆی بمێنێتەوە، ئەوا حەز دەکەم فەرمانەکە لەلایەن فیلد مارشاڵ کەیتل خۆیەوە بدرێت.».

گوتی: «ڕاستە کاپتن میوولەر، چرکەیەك بووەستە. با هەوڵێکی تر بدەم بەڵکو فەرماندەرەکەم ببینم. بێ گومان تۆ زۆر لەسەر هەقی. منیش تا بۆم بکرێ هەوڵ دەدەم شتەکە ڕوون بکەمەوە. ئەوەی ڕاستی بێ لەوانەیە تێك نەگەیشتنێك ڕووی دابێ‌و ویستبیان کارێکی تر بوەستێنن نەك ئەوەکەی تۆ.»

چووە ژوورێکی تەنیشتەوەو پاش دوو دەقیقە گەڕایەوە.

گوتی: «کاپتن میوولەر، زۆرم پێ ناخۆشە گیرۆدەی ئەم گرفتە بوویت. بێ گومان هەڵەیەك بووەو دەبوو کارێکی تر بووەستێ ناوی لەناو کارەکەی تۆدەچێت. دەبێ هەر ئێستا بچیتەوە سەر بنکەی مەشقکردنەکەت و، هەرکاتێ پێڕۆی کارەکەت تەواو بوو یەکسەر بۆ ئێرە بنووسیت.»

هەمـان ڕۆژ بەرەو بۆ دێنتەل گەڕاینەوە. کەمێك وەڕس بووین، بەڵام هێشتا بە سەرەنجامی کارەکە کەیف خۆش بووین.

پێش ئەوەی بەڕێ بکـەوین، چووم پرسیـاری فڕۆکەیەم کرد بۆ ئەو جۆرە کردەوانەی وەك کردەوەکەی ئێمە تەرخان بوون. ئەو فڕۆکەیە دەیتوانی بۆ ماوەی چەندین هەزار کیلۆمەتر لە ئاسمان بمێنێتەوە. لە بەرزایی ٨٠٠٠ مەترەوە دەفڕی و خشکۆکێك (سلایدێك)ی لە بن هەبوو، بۆ ئەوەی

خەڵك و شتومەك پێكەوە هەڵ بداو دەرفەتی پێكەوە بەزەوی گەیشتنیان هەبێ، سلایدەكە لە شوێنی خۆی دەترازا. ئەگەر بهاتایەو ئەو فڕۆكەیە ئامادەبایە ئەوا بەبێ هیچ تەنگاو بوونێك دووا دەست پێدا هێنانی مەشقەكەمان تەواو دەكردو بەڕێ دەكەوتین. بەڵام لەوێ نەبوو. بە ئەرك نێردرابوو.

«كەی ئامادە دەبێ؟»

وەڵامیان دامەوە: «دووای دوو تا سێ هەفتەی تر»

«باشە، لە ماوەی دوو تا سێ هەفتەی تر چاوەنۆڕمان بن. ئاگاتان لێ بێت كەسی تر پێشی ئێمە دەستی بەسەردا نەگرێت.»

وەڵامیان دامەوە: «باشە، با بزانین. دوو تا سێ هەفتە ـ كردەوەی مامۆنت.» ئەوكاتەی كردەوەیەكی گەورەی تایبەت دێتە پێشەوە، عەریفێكی چەتربازی چاودێر بۆ ئاسمان بەگەڵ فڕۆكەكە دەكەوێ. ئەركی ئەو چاودێرە ئەوەیە چەترەكان بپشكنێ، ئایا بە چاكی بەستراون و پەتەكانی توند و پتەون. (چەترەكان خۆ بزێو بوون و لەكاتی خۆ لە فڕۆكە هەڵدان دا لە خۆوە دەكرانەوە) باز هەڵدانەكە بە سووكی دەكرا. من و پیاوەكانم متمانەی تەواومان بەو مەشقدەرە كردو لەگەڵ خۆماندا بردمانە بۆ دێنتەل بۆ ئەوەی ڕێو شوونی راستی كارەكەمان فێر بكات. هەروا دەمانویست ئەزموونێكی خۆ هەڵدانیشی لەگەڵدا بكەین، دووای ڕووداوی بە دوواناردنە بە هەڵە دەرچووەكەی بەرلین، ڕەنجێكی چاكترمان دا بۆ ئەوەی مەشقەكەمان بەپەلە تەواو بكەین وخۆمان باشتر ئامادە بكەین. هەمووەمان ئەم هەستەمان هەبوو «با زوو بەڕێ بكەوین هەتا پرو بووچی تر رووی نەداوەتەوە.» بە ڕۆژەوە خەریكی مەشقی فڕین بووین. سوودمان لە هەموو دەقیقەیەك دەبینی. تا درەنگانی شەو مەشقمان دەكرد. پاشی دە ڕۆژان ـ بێ ئەوەی چاوەنۆڕی مەشق پێدانی كەسی تربین، بە ڕژدی بە خۆكەوتین و چووینە (وێنەر نیو شتادت) بۆ ئەوەی ئەزموونی خۆ بە چەتر هەڵدانمان لەوێ بكەین. ئەوە بوو خۆمان هەڵدایە ناو كۆنە فڕۆكەیەكی (یونكەر ٥٢)و بەرەو ئاسمان فڕین. ڕۆژێكی خۆش بوو. لەپاشكۆی فڕۆكەكە پەرژینێكی لە پۆڵا دروستكراو هەبوو پەتی پەراشووتەكانی ئێمەی پێوە بەسترا بوو. دەرگای مەكینەكە كرایەوەو ئێمەش یەك لە دووای یەكتر بۆ خۆ هەڵدان وەستاین. حەزم بكردایە یان نا من یەكەمین كەسی ڕیزەكە بووم.

پیاوەكەی دوواوەم گوتی: «ها كاپتن ئەمە دەترسیت؟»

بەچرپەیەكەوە ووتم: «ئەگەر ڕاست دەوێ. دەبێ دانی پێدا بنێم كە ترسم هاتووەتێ.»

سەرم دەرهێناو سەیرێكی ژێرەوەم كرد.

«كاپتن، ئەمە چۆكت دەلەرزێ؟»

دانم پێدانا «ئەگەر ڕاستت دەوێ، دەلەرزێ.»

بێ گومان شتێك ڕووی نەدەدا، چونكە پەراشووتەكان هەزاران جار ئەزموونداربوون و تاقی كرابوونەوە. پەتەكە بەبێ هەڵەكردن پەراشووتەكەی هەڵ دەدا. ئەگەر نا دەبوو لە بیرت نەچێ بە دەست بیكەیتەوە. جاران پێش ئەوەی تێ هەڵدانی خۆبزێو دابهێنرێ، وایان دەكرد: بە چاوەدێریی پسپۆڕێك گۆزینگی خۆمان نەشل و نە توند پێچابووەوە، ئەژنۆشمان بە زرێیەك داپۆشیبوو. هەروەها كڵاو زرێی پۆڵامان لەسەر نابوو. كاتێ دەگەیشتینە نیشتگەی فڕۆكە airstrip دەبوو بە خێرایی خۆمان هەڵدەین.

۱۵۰ مەتر لەسەر زەوییەوە دەفرین، بە خێرایی ۲۵۰ کیلۆمەتر لە سەعاتێك. خێراییەکەمان بۆ ۱۵۰ کیلۆمەتر لە سەعاتێك کەم کرایەوە. مەشقدەرەکەمان ئاماژەی داو منیش بەرەو دەرگا هەنگاوم نا. ئاماژەیەکی تری کردو خۆم هەڵدایە ناو هەوا. سەرەو ژێر بووم و لنگم چووە ئاسمان. سەرەتا کەس هەستی ئەوە ناکات لنگەو قووچ دەبێتەوە،پێی وا دەبێ هەر بەقیتی دەوەستێ. دەتگوت کۆنە خولیای مرۆ بەدی هاتووە، یاسای راکێشان هەڵوەشاوەتەوەو پشت بە زەوی بەستان نەماوە. خۆشی و شادمانییەکی بێ ئەنداز مرۆ دەتەنێ و ئاوەها بۆ خۆی لەوێ دەوەستێ. دەتوانێ لە خۆشیانە هاوار بکات. لە راستیدا کاتێ ئێمەش خۆمان یەك لە دوای یەکتر هەڵدا کردمانە هاوار هاوار. زنجیرێکی لێژمان دروست کرد. دووریی نێوانمان ۳۰ مەترێك دەبوو. هاوارمان دەکردو لە خۆشیانە لنگەفرتێمان بوو.

لەپڕێکدا زەویمان لێ نزیك کەوتەوەو خەونی بە هەواکەوتن بە هێمنی دوایی هات. لنگم هەڵکێشاو لە ناکاو کەوتمە سەر زەوی. گوژمە بایەك ویستی پەراشووتەکە برفێنێ. بەڵام هەر زوو پشتێنەکەم داکەلاندو خۆم لە پەراشووتەکە رزگار کرد. بەپەلە هەڵم کردەوەو سەیرم کرد ئەندامانی تری تیپەکەم بەزەوی گەیشتن. یەکێکیان هەڵ نەستایەوە. چوومە فریای. بە خراپی گەیشتبووە سەر زەویو ئێسکی گۆزینگی لە جێ چوو بوو. یەکێکی تر خوێنی لە دەم دەهات، هێندەی نەما بوو زمانی خۆی لێ بکاتەوە. ئەوەی دووەم باش بوو بەڵام یەکەم دەبوو ببردرێتە تیمارگەو چەند هەفتەیەك بمێنێتەوە. ئەمەم هاتە بیر: ئەگەر لە بارێکی ئاسایی‌دا هێندەمان بریندار هەبێ، ئەدی ئەگەر کردەوەمان بەشەو بێت دەبێ چیمان بەسەر بێت؟

ئەو رۆژە هات، مەشقەکەمان تەواو بووو گەراینەوە بەرلین. فرۆکە تەرخانکراوەکەی پرۆژەکەمان بەم نزیکانە پەیدا دەبوو. هەر کەسەو چەند رۆژێك پشووەدانی هەبوو. کردەوەی مامۆنت بەرە بەرە دەستەیەك پیاوی ئەو تۆی کۆکردەوە هەموویان ئامادەی خۆبەخت کردن بوون لە پێناو پرۆژەکەدا. لە نێوان هەموو ئەوانەی هەڵم بژاردبوو سیانیان پاش ماوەیەك ویستیان دەربچن. منیش دەسبەجێ بەرەڵڵام کردن و هیوای چاکەم بۆ خواستن. کەیف شاد بووم بەرلەوەی زانیاری وورد دەربارەی نەخشەکەمان بزانن لە کۆڵم ببنەوە.

لەو ماوەیەی پیاوەکانم سەربەست بوون چی دەکەن بیکەن، (ئێواران هەموومان لە یەك شوێن کۆدەبووینەوە بۆ ئاهەنگ و بەزم گێران. بەڵام هەراو زەنامان دروست نەدەکرد.) منیش لەگەڵ هانز کریستۆف بە گەرمی خەریکی پەیدا کردنی ئەو پێویستییانە بووین هێشتا بە دەستمان نەکەوتبوون. لە چاو ئێرە کاتێکی چەند خۆشمان لە بۆ دێنتەل رابوارد. هەڵسوکەوت لەگەڵ داو دەزگای میری و ئەو فەرمانبەرە بێزەوەرانەیان، شتێکی چەند نەستەم و دژوار بوو. هەندێك جاران وام هەست دەکرد کە تەنیا مەبەستیان لە ژیان ئەوەیە تەگەرە بۆ من بنێنەوە. کۆلۆنێلێك هەبوو لایەنگرم بوو. گفتی دامێ یارمەتیم بدات بەڵام بە داخەوە دوو هەفتە دوواتر خانەنشین کرا.

رۆژ لە دووای رۆژ بەسەر چوون. ئەوە بوو هەموو گرفتە رۆتینەکان لە ناو چوون و هەر پێویستێکی کردەوەکەمان هەبوو، هەموویمان پەیدا کرد. دوو ئەندامی هەرە ئازای تیپەکەمم هەڵبژارد بۆ ئەوەی لەگەڵ رەمزی بەرەو ناوچەی ئامانج بەرێ بکەوین و نووکی پردێك دابمەزرێنین. ئەوانی تر لە ژێر رابەرایەتیی هانز کریستۆف لە بنکەدا مانەوە بۆ ئەوەی مەشقی پتر وەربگرن و

هەروەها هانز کریستۆف تیپەکە فراوانتر بکات لە ڕێگای تێومخستی پسپۆڕی زیاترەوە. بۆ نموونە تەکنیك ـ کارێکی کارخانەی نەوتمان پێ دەویست بۆ ئەوەی ئەگەر لە کاتی شەڕدا وێرانەکاری بەرپا بوو، بتوانێ چارەسەر بدۆزێتەوە. خۆم لێکۆڵینەوەیەکی چاکم دەربارەی دەرهێنان و پاڵاوتە کردنی نەوتەوە کردبوو؛ بەڵام دەمویست لە کوردستان تەرخان بم بۆ ئەوەی چاوم لەسەر هەموو کردەوە کە بێت.

چواردە ڕۆژ پاش بەجێ هێشتنی بۆ دێنتەل، ئێمە هێشتا چاوەنۆڕی دەرفەتی بەگر کەوتنی فڕۆکـەکـەمان بووین. هەموو ڕۆژ گفتی نوێیان دەدایێ. ئەمە ئەزموونێکی توندو تیژی مێشك گوشین بوو بۆ ئێمە.

چەند جارێکی تر نەخشەکەمم هێنایەوە بیرم بۆ ئەوەی دڵنیابم ئایا ڕەچاوی هەموو ڕووداوێکی کتوپڕم کردووە! یەکەمین شت دەبوو لەگەڵ ڕەمزی و دوو ئەندامی بژاردەی تیپەکە، ئەوانەی تەواو متمانەم پێ هەبوو، ڕووەو ناوچە چۆڵەکەی کوردستان ـ لە چیایەکانی بەری ڕۆژئاوای گۆلی وورمێ، بفـرین. ڕەمزی لەوێوە پێوەندیی لەگەڵ خزم و دۆستانی دەکرد. لەوانەیە یەکەم جار بچێتە لای خوێنبراکەی و ماوەیەك خۆی لەوێ بشارێتەوە تا خوێنبراکەی ئەو زانیاریانەی بۆ کۆدەکاتەوە کە سەرکردایەتیی باڵای سوپا بەپەلە دەیویستن.

ئەو زانیارییانەی پێویست بوون: ژمارەی سەربازانی بەریتانیایی و عێراقی لە عێراق دا؛ تەبایی ئەو یەکـە سوپـاییـانـە، شوێنیـان لە کوێیە؛ چی دەکەن؛ چەکیان چۆنە؛ وورەیان چۆنە؛ هێڵی شەمەندەفەرو ڕێگاوبان لە کوێ دامەزراون؛ فڕۆکەخانە لە کوێن؛ فڕۆکەخانەکان چەند سەربازیان تێدایە، جۆری ئەو هاوکارییەی لە نێوان هێزی سوپایی بەریتانیا و عێراق دا هەیە چۆنە.

وام دانابوو بەلای زۆرەوە بە چوار هەفتە وەڵامی ئەم پرسیارانەم دێنە دەست. ڕەمزی دەیزانی زۆر گرنگە زانیاریی ڕاست و ڕەوانی دەست بکەوێ و بە هەموو شێوەیەك تێ دەکۆشا خۆی لەو زێـدەڕۆییـەی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا باوە، بە دوور بگرێ. تا ڕادەی بۆ گونجان، دەیتوانێ زانیاری لە دوو یان سێ سەرچاوەوە وەربگرێ بۆ ئەوەی بتوانێ بەراوردیان بکات، ئینجا لە ڕێگای پێناوێکی بڕواپێکراوەوە ڕاپۆرتی دەستبژێرکراومان بۆ بنێرێ و ئێمەش هەر بەپەلە بۆسەرکردایەتیی باڵای سوپای ڕەوانە بکەین بۆ ئەوەی وێنەیەکی ڕوونی بارو دۆخەکەیان لەلای دروست ببێ.

هەر لەو کاتەدا، ڕەمزی دەیتوانی زانیاریی پێویستمان بۆکۆبکاتەوە بۆ ئەوەی لە پێناو ئامانجی سەرەکیمان بکەوینە جووڵە کە داگیرکردنی چاڵە نەوتەکان بوو لەلایەن خێڵە کوردەکانەوە.

لێرە پێـویستە هەڵویستی شێخە کوردەکان لەبەرامبەر عارەب و ئینگلیزو ئەڵمانیاو ڕووسیادا بزانین؛ ئایا دەتوانن چەند پیاو بۆ لەشکر بانگ بکەن؛ چۆن چەکدار دەکرێن؛ پێوەندیی شێخەکان و خێلەکـان چۆنـە. بیرو باوەڕی شێخـە متمانە پێکراوەکان سەبارەت بە نەخشەکەی ئێمەوە بۆ داگیرکردنی چاڵە نەوتەکان لەلایەن خێلەکانیان یان سەربازی ئەڵمانیاوە چۆنە؛ چییان پێویستە بۆ یارمـەتیو کۆمەکی نێوان خۆیان؛ ژمارەی سەربازانی بەریتانیاییو عێراقی لە چاڵە نەوتەکان و هەروا بەنیوەتیرەی ١٠٠ کیلۆمەتر لە چواردەوریاندا؛ چۆن چەکدار کراون؛ ژمارەی ئەو کەسانەی لە چاڵەنەوتەکاندا خراونەتەکارو سەر بە چ نەتەوەیەکن؛ چەندیان کوردن و لە چ خێڵێکن؛ چەند

لەمانە دەشێ ببنە خەفیەی ئێمە؛ چەند لەم خەفیانە دەشێ متمانەیان پێ بکرێ بۆ ئەوەی شوێنی خۆشاردنەوەی خەفیەی تر دابین بکەن بۆ نموونە بۆ خەفیەی تیپەکەمان؛ کێ لەنێوانی فەرمانبەرە کاربەدەستەکان بەتایبەتی لە نێوانی تەکنیك کارەکان دا دەشێ وەك لایەنگری ئەڵمان سەرنجی لێ بدرێو، رادەی بەرهەمی ئێستای بیرمەوتەکان چەندە.

رەمــزی زیــرەکترین ووتوویژکەربوو تا ئێستا بینیبێتم. بۆ لەیەکتر جوداکردنەوەی دۆست و دوژمن شەش هەستی هەبوو. زانیاریی چاکی دەربارەی ئەو شێخانە کە لەگەڵ ئێمەدا دەبوون و، ئەو شێخــانــەی بەپارەو بەڵێن دەگیران و، ئەوانەی هەرگیز نەدەبوو خۆمانیان لێ بدەین، هەبوو. بەهۆی پایەی باوکی لەناو ووڵات و گەشتی خۆی لەناوچەی خێڵەکاندا، تێکرای سەرۆك خێڵە کوردەکانی دەناسی. گەلێك جار گوێی لە ووتوویژی نێوان باوکیو ئەو سەرۆك خێلانەی دەهاتنە لای بوو بوو. رێگای لەباری بۆ خۆڵێ نزیك کردنەوەی هەموویان دەزانێ. سەرەرای ئەمەش، زیت و ووریاو، فێڵبازو، لەچەواشەبوون بەدوور بوو. ئێستا هەلی تەمەنی بۆ هەڵکەوتبوو بۆ ئەوەی ببێتە سەرۆکی کوردو ئازادیو سەرفرازی بۆ ووڵاتەکەی بێنێتەدی. دڵنیابووم رەمزی خۆی لە هەموو ئەو شتــانــە دەبــوارد کە خۆیو نەخشــەکەیان دەخستە بەر مەترسییەوە. وەك یاریکەری بەتوانای شەرترەنج، دەیتوانی سارد، لەسەرەخۆ، یەك لەدووای‌یەکیان بگێرێ. شتێك نەبوو ترسی وەبەرنێ. دەمزانی رەمزی هەموو شتێك بەو پەری ووریایی دەخاتە جووڵەوە.

رەمــزی لێــوەشاوەترین کەس بوو بۆ ئەم کردەوەیە هەڵکەوتبێ. جێ برواو جێ متمانەم بوو. گەورەترین رێزو دۆستایەتیم بۆی هەبوو. هەستم دەکرد ئەویش هەمان هەڵوێستی هەیەو تەواو بروای پێمە.

بەبیرەوە چووم: «رەمزی گیان، دۆستەکەم، ئومێدبروات ناکەم. من تۆڵەی دڵسۆزی بە دڵسۆزی دەدەمەوە. تۆ دەبی بەفەرمانرەوای کێوەکانی کوردستان. کەی کاتی هات، چ بە بەڵێن و دیاری چ بەزەبــری کوتــەك شێخــە کوردەکان لەژێر دەسەڵات و فەرمانرەوایی تۆدایەك دەخەم. پێویستە کوردستان سەرفراز و خۆش گوزەران بێ. بەلای منەوە، هیچ شتێك هێندەی ئەوەم شاد ناکا لەتەکتا بووەستم و بەرهەچی شتێك لە ووزەو توانام دا بێ کۆمەك و پشتیوانیت بکەم.»

وامــان دانــا بوو خۆ هەڵدانمان لە کوردستان دوو یان سێ مانگ بکەوێتە پێش ئەوەی خێڵە کوردەکان بۆ باری راپەرین ئامادەبکەین. لەو ماوەیەدا دەمانتوانی لەسەر گردێکی بەرزی نەدیوو و کەس نەزان شوێنێك بۆ نیشتنەوەی فرۆکەکەمان ئامادەو خۆش بکەین. دەبێ شوێنێکی هێندە رێك و پان و پۆر بێ بەچاکی بەشی نیشتنەوەی فرۆکە بکا. لەنێو ئەو ئامێرانەی دامان نابوو لەگەڵ خۆمانی ببەین، دەزگایەکی نوێیاوی بچکۆڵەی بەپیل ئیشکەر بوو کەدەیتوانی نیشانەکانمان بۆ فرۆکەیەکی نزیك بنێرێ.

فرۆکەکەمان، فرۆکەیەکی دوو مەکینەیی، دەستکاری فەرەنسا بوو. لەفرۆکەخانەیەکی دەرەوەی بەرلین ئامادە وەستا بوو. گەورە نەبوو، بەڵام دەیتوانی لەبەرزایی ٥٠٠٠ مەتردا بفرێ. هەرکاتێ زەوییەکەی بۆ ئامادەکرا ئەوا دەیتوانی گرووپی دووەمی تیپەکەمان بێنێو بە پراوپری شتومەکی وەك چەك و کەرەستــەی شەرو تەقەمەنییەوە بێت و بنێشێتەوە. دەبوو پێشەکی سووتەنی بۆی ئامادە بکرادایە. پاش ئەوەی پرمان لە سووتــەنی دەکرد. دەبوو فرۆکەکە شەوی پاشتر بگەرێتەوە.

قۆناغی بەرێ کەوتنی دوورگەی (قرم) بوو.

لە ئامادەکردنی راپەریندا، دەبوو کورد بەباشی بەچەك و تەقەمەنی چەکدار بکرایەن، نەك تەنیا تفەنگ بگرە هەروەها دەمانچەی ئۆتۆماتیك و تفەنگی مێ نیکیو چەکی دژە تانك و تفەنگی سووکی تەیارەشکێنیش. دەبوو لە بنەبانی ناوچە چۆلەوانیو تەپانی بنەوەی چیایەکاندا هەڵبژاردەی تایبەتی پیاوە خێلەکییەکان لەلایەن ئەندامانی تیپەکەمانەوە مەشق بدرایەن.

دەبوو هەمووشتێك سووك و ئاسان بهاتایەتەجێ، تەنیا بەختمان یاربوایە، هەرچەندە ئێمە بروامان بەبەخت باشیی خۆمان هەبوو. ئەدی ئەوە نەبوو لە هەڵبژاردنی تیپێکی زۆر لێوەشاوەو، جەنگاوەرو، زمانزان و خۆبەختکەر لە پێناو پرۆژەکەمدا سەرکەوتبووم؟ ئەدی بەختمان یار نەبوو رەمزیمان لەو هەلە چاکەدا بۆ هەڵکەوتبوو؟ ئەدی برای خۆم و چاکترین دۆستم پێوەندییان لە گەڵ نەبەستاین بۆ ئەوەی لە نیشتمانەوە بەبێتەل ئاگایان لێمان بێت؟ پیاوی لەمانە چاکترو جێ برواترم لەکوێ پێ پەیدا دەبوون! هەروەها ئەدی نەمانتوانێ بەسەر هەموو گیرگرفتێکدا زاڵ ببین تەنانەت فرۆکەیش؟

لەئەستۆگرتنی هەموو ئەو ئەرکانەی چارەنووسی نیشتمانیان لە نەبەردییەکی هەرە ئازایەتی هەرە قارەمانێتیدا پێوە بەندە کە سەرەنجام بریاری یەکجارەکیی بردنەوەی شەڕ بدات و سەرکەوتن بێنێتە دی: چ شتێکی لەمە گرنگتر هەیەکە لە سەربازێك بویسترێ؟

پیاو بیرلەوە دەکاتەوە: سوپای ئەڵمانیا ئەوکاتە لەقەفقاس لە شوێنی خۆی وەستا بوو، بەڵام ئەمە جێی سەرسامی نەبوو ئەگەر خێرایی پێشکەوتنی ئەو سوپایەو دووریی رێگاوبانی پێداناردنی کۆمەك و یارمەتی رەچاو بکرایە. سەرەتا دەبوو ئەو رێگاو بانانە یەك بخرێن ئینجا پەرە بە پێشکەوتن بدرێ. بەڵام من بروایەکی پتەوم هەبوو کە لەمەولا سەرکەوتنی برووسە ئاسا نامێنێت. بگرە خەباتێکی رژدو لەسەرخۆ دێتە پێشەوە. ئێستا پێویست بوو کۆمەك لەلایەکی ترەوە بهاتایە ئەگەر شەڕ بەناچاری درێژەی بکێشایە یان بەولاوەتر ئەگەر سەرەنجام بە سەرکەوتنی ـ بێ گومان خۆمان، بەئاکام بگەیشتایە.

رێگای بەدەست هێنانی ئەم سەرەنجامە لەدەستی مندابوو. بۆمن هیچ شتێك لەم شتە روونتر نەبوو. کێ شەرمان بۆ دەباتەوە؟ تیپەکەی من. چۆن؟ بەهەڵکردنی ئاگری شۆرشێکی گەورەی ئەوتۆ یەکپارچە رۆژهەڵاتی ناوەراست لەگەڵ خۆی رابماڵێ. دەمزانی لەوێ رك و کینەیەکی بەرفراوان بۆ ئینگلیز و خۆشەویستییەکی گەورەش بۆ ئەڵمانیا هەیە. دانیشتوان چاوەنۆربوون هەر هێندە سوپای ئەڵمانیا کەمێك نزیك بکەوێتەوە. هەر هێندە راپەرین لەیەك شوێن گری بگرتایە، ئیدی وەك ئاگرێکی باوەشێنە کراو دای دەگرت. دەمزانی پیاوانی خۆمان لە هەموو شوێنێك جێگیر بوو بوون و خەباتی ژێر زەمینییان بۆ ئامادەکردنی ئەو راپەرینە دەکرد، بەتایبەتی لە ئێران.

بەڵام گرمکە لە کوردستان کڵپەی دەکرد. لە هەمان کاتدا خێڵە کوردەکان ئامادەی داگیرکردنی چاڵە نەوتەکان دەبوون. شۆرشێکی نەخشەی بە ووردی بۆ کێشراو سەرتاسەر عێراقی دەگرتەوە. رێگاو بان دەگیرا. کۆگاکانی نەوت ئاگریان تێ بەردەدرا. فرۆکە دەتەقاندرانەوە. چەو دەخرایە نێو سەندووقی چەورکردنی فارگۆنی شەمەندەفەرەوە بۆ ئەوەی هێڵی هاتو چۆ بوەستێ. لە هەمۆو هەڵێك پەلاماری پارتیزانی دەکرایە سەر ئینگلیز. داگیرکردنی چاڵە نەوتەکان وای لێ دەکردین برێك

ویرانەکاری دروست بکەین بێ گومان ئەمەش هێرشێکی دەسبەجێی سەربازانی بەریتانیا و عێراقی بە دوودا دەهات. بەڵام لەسەرچاوەی خەفیەییمانەوە دەمانزانی کەوا دەبێ چاوەنۆڕبین بەشێکی سوپای عێراق بەگەڵ ئێمە بکەوێ.

لە هەمان کاتدا لێشاوی بەردەوامی سەربازی بە فرۆکە هاتووی ئەڵمان لە قەفقاسەوە دەهات. فرۆکە بە باری سووتەنییەوە لە گەشتەکەی دەگەڕایەوە. ئەمەش بە دەوری خۆی هانێکی گەورەی دەدایە وورەی سەربازی شەکەت و ماندوومان لە قەفقاس و دنەی دەدان بەرەو پێش تەکان بدەن، رووەو ئەو هاورێیانەی ئێستا لە باشور دەجەنگان. سەرباری هەمووی، دەیانتوانی درێژە بە پێشکەوتنیان بدەن چونکە هەموو ئەو سووتەنییەی دەیانویست هەیان بوو و دەیانتوانی لە ئەنجام دا ئەو چاڵە نەوتانەی باکۆ داگیر بکەن کە ئەوەتا کە لووە بەرزەکانیان بەچاکی لێوە دیار بوون. لە راستیدا ئەو سووتەنییەی بۆیان دەچوو، بە چاکی بەشی ئەوەی دەکردن بتوانن بەرەو پێش تەکان بدەن رووەو ئەو هەرێمە دەوڵەمەندەی نەوت.

ئێمە وامان دانا بوو سوپای ئێران دێتە هانایان. ئینگلیز هێشتا سوپای ئێرانی بەدەستەوە بوو، سەرکردە سیاسییەکانی سوپای ئێران لە گیرفانی ئەواندا بوون. بەڵام ئێمە دڵنیا بووین کە بارستایی سوپا بەلای ئێمە دایە. هەموو شتێك بۆ کارکردن لە ئێران ئامادە بوو. جەنەراڵی تر شوێنی ئەوانەیان دەگرتەوە کە لەژێر فەرمانی ئینگلیزدا بوون و سوپا بۆ یارمەتی‌و پشتیوانی سەربازی ئەڵمانیا بەرەو باکوور دەکشا. لە ژێرەوەش خۆ ئامادەکردن بۆ حکومەتێکی نوێ لە ئێران لە گۆڕیدابوو. بۆ ئەوەی ئەو حکوومەتە لە نوختەی یەکلا بوونەوەدا دەسەڵات بگرێتە دەست، هەمان چیرۆك لە عێراق دا خۆی دووبارە دەکردەوە.

پێ دەچێ ئەڵمانیا لە نێو وولاتانی ئەورووپادا هەڵبژاردنێکی ژیرانە بێ بۆ خەڵکێ رۆژهەڵاتی ناوەراست بۆ ئەوەی متمانەی خۆیانی‌بدەنێ. باوی بەریتانیا روو لە کەمی بوو، کەس متمانەی بە رووسیای کۆمۆنیست نەبوو. ئەمەریکا زۆر دوور بوو. بەپێی سۆسەکردنی خۆمان، ئەڵمانیا چاکترین دەرفەتی هەبوو بۆ ئەوەی وەك دۆستێکی راستەقینە بۆ بازرگانی و وەك باژێرێکی نەوت، رێزی لێ بگیرێ. ئێمە وەك داگیرکەرو چەوسێنەوە نەدەهاتین بگرە وەك دۆست و رێ پیشاندەر. لە هەمووی گرنگتر، پێوەندیی پتەومان لە دووای خۆمانەوە بەجێ دەهێشت.

کاتێ سەربازی ئێمە دەگەیشتنە سەر زەوی و دەسەڵاتیان دەگرتە دەست. من و تیپەکەم لەگەڵ رەمزی لە کاری سەربازی دەکشاینەوە وخۆمان بۆ پەرە. پێدانی ئاشتییانەی کوردستان تەرخان دەکرد. ئێران دەبوو بەشی پیاوانی ئێمە و لەوێ بە خۆدەکەتین، عێراقیش دەبوو بەشی ئەوانەی سەر بە جیهانی عارەب بوون.

یەکەمین ئەرکمان ئەوەبوو کوردستان ئاوەدان بکەینەوە. ئەمەش بە دامەزراندنی رێگاوبان و هێلی شەمەندەفەرو نۆکەند، لە هەمان کات بە وەستاندنی دوژمنایەتی‌و کێشەی بێ پسانەوەی خێلایەتی هەنگاومان بۆ هێورکردنەوەی وولات دەنا، مەڵبەندی پۆلیسمان دادەمەزراند بۆ دابین کردنی ئاشتی و هێمنی لە سەرتاسەری وولات و، لەو شوێنانەی سەرچاوەی بشێوەنەو ئاژاوەی نێوان کوردان دەنیشتنەوە گوند و دێهات دروست دەکران. پارەی هەموو ئەم شتانە لە چاڵە نەوتەکانەوە دەهات. سامانی نەوت بە شێوەیەکی زیرەکانە لەگەڵ عێراقییەکان دابەش دەکرا. ئەوە

بوو هەر لایەو بەشی خۆی دەبرد. ئەڵمانیاش تا ئەو کاتە نەوتی بە ڕێژەیەکی زۆرچاك دەبرد. ئاواتم بوو ڕۆڵێك لەو ووتووێژانە بینم بۆ ئەوەی مسۆگەری بکەم هەموو بڕیارێك بە داد پەروەرییەوە دەدرێت.

پێویست بوو، لەلایەکەوە وولات بەسەر پڕۆیەکی درێژخایەنی دارودەون ناشتن برۆیشتایەو، لەلایەکی تریشەوە سامانی کانزایی دەربهێنرایەو بەبەرهەم بهاتایە. ووزەی گێراتی پیشەسازیش بە ڕۆنانی بەنداو و بەسوڵاو کردنی چەم و ڕوو باری چیایان بە دەست دەکەوت.

بۆ جێبەجێ کردنی ئەم پرۆگرامە بەر فراوانە، پارە زۆر گرنگ نەبوو. گرنتر ئەوە بوو پاڵپشتی خۆ تەرخانکەر هەبێت. هیوایەکی بەرزمان هەبوو بتوانین ژمارەیەکی زۆر تیپی خۆبەختکەر لەسەر پێودانگی یەکەی خزمەتگوزاری ئەڵمانی دروست بکەین. پرۆگرامەکەی ئێمە بیرێکی ئاوەها ئازایانەو دووره دیمەن بوو. بێ گومان، ووتووێژ لەگەڵ ئەو پێنج وولاتەی ئێستا کوردستانیان لە ژێر دەستە زۆر گران دەبوو. بەڵام لەبەر ئەوەی من دڵنیام بووم ڕاستی بەلای منداوە هەموو وولاتێکیش دادی خەڵك لە بارەی مافی چارەی خۆنووسین و ئازادییەوە دەپرسێ، لەو بڕوایە بووم گرفتەکان بە هەر ڕێگایەك بێ چارەسەر دەبن.

بەڵام با بگەڕێمەوە سەر بارودۆخەکەی خۆمان. ئەو فرۆکەیەی چاوەنۆری بووین هێشتا ئامادە نەبوو بوو. پێیان گوتم لە چاککردنەوە هاتوومەتەوە بەڵام بۆ کارێکی بەپەلەتر ویستراوە. تێ نەدەگەیشتم چۆن دەبێ کارێك هەبێ لە کردەوەی ماموٚنت بە پەلەتر و گرنگتر بێت. بەڵام دەبوو جارێکی تریش چواردە ڕۆژ دواکەوتن دان بە خۆمدا بگرن.

بۆ ئەوەی چیتر لە بەرلین چاوەنۆر نەبم، بڕیارم دا تیپەکەم ببەمە هامبۆرگ کە شارێکی بچووکی دڵرفێنی نزیك کاسێلە. کەوتووەتە بناری سکلۆسبێرگ و بە دارستان دەورە دراوە. لێسێلی پوورم داوەتێکی چاکی کردین و، ئێمەش لە کاتی پێویست گەیشتین، فەرماندەی نازیی ناوچەکە زۆری ڕك لە پوورم هەبوو، داوایەکی لەسەر پوورم دابوو بە دادگا. ئێمەش هەموومان چووینە دادگا بۆ ئەوەی پشتیوانی لە پوورم بکەین. ئامادەبوونی ئێمە کاری خۆی کردو پوورم بێتاوان دەرچوو.

بڕیارمان دا، چاکترین چارەسەر بۆ بەسەر بردنی ئەم ماوە چاوەنۆرییە بەسەردا سەپاوەو بۆ ئەوەی نەبادا تەمەڵ ببین، ئەوەیە بە کەیف وسەفا ڕابوێرین. سنوودێکی چاکمان لە خانووە جزیرییەکەی پوورە لێسێل وەرگرت کە کەوتبووە سەر لێواری مێرگێکی بەر هەتاوەوە. پاشی ئەو هەموو هەفتەو مانگە پڕ لە مەشقە گرانانە، پشوودان و دڵنیایی تابلێی خۆش بوون. لە بەر هەتاو پاڵ دەکەوتین. لە زمتمان لە ویزەویزی مێشەنگ و پێشکە و ئاوازی دڵرفێنی چریکەی تەیرو تواڵ وەردەگرت. داوەتی چاك چاکی پوورە لێسێل مان دەخوارد. ئەو ڕۆژە بە کەیف و شادییانەی ڕامانبوارد تا ئێستاش بە چاکی پێکەوەمان دەبەستنەوە. ئیتر ئاوەها بوو، کاتەکەمان بە چاکی بەسەر برد. دەمانزانی جارێکی تر لەم زووانە پشووی ئاوەهامان لێ هەڵناکەوێتەوە.

پاش داوەتێکی ماڵئاوایی چاك لە سەر نشێوەکانی سکولسبیرگ لە هامبۆرگرا، بەرەو بەرلین گەڕاینەوە. دە ڕۆژەکە تەواو بوو بوو. دەبوو ئێستا فرۆکەکەمان بۆ ئامادە بوو بێ.

# ئێستا یان هەرگیز

دوا ئەوەی گەیشتینە جێ، یەکراست چوومە فرۆکەخانە بۆ ئەوەی لەگەڵ کابرای فڕکەوان بدوێم.
«ئایا فڕۆکەکە هاتووەتەوە؟» لێم پرسی.
«هەرئێستا لەو فڕینەی هاتۆتەوە کە پێشتر پێم گوتی.» وەڵامی دامەوە.
«کەواتە کەی دەتوانین بەرێ کەوین؟» لێم پرسی. شانی نەزانینی هەڵتەکاند.
گوتم: «ئێستا تۆ سەیرێکی من کە، دەمەوێ چیتر دوا نەخرێین و بەرەو شوێنی کردەوەکەمان بەرێ کەوین. ئەدی من چەندین جارم پێ نە گوتووی کە ئەم کردەوەیەی ئێمە کردەوەیەکی زۆر گرنگە! چەند یەکلا کەرەوەی شەڕە؟ باشە ئێستاکە ئێمە کەی دەتوانین بەرێ کەوین»
گوتی: «پرسیارت بۆ دەکەم و، بەیانی وەڵامت دەدەمەوە. تکایە تۆ بەیانی سەر لەزوو تەلەفۆنێکم بۆ بکە.»
گوتم: «نەخێر، بەیانی خۆم سەرت لێ دەدەمەوە.»
ڕۆژی دواتر چوومەوە لای: «ها، فڕۆکەکەی ئێمە چیی بەسەر هات؟»
گوتی: «هەر ئێستا فەرمانیان پێ دام کە باربوو و ئازووخەی لێ باربکەم و بۆ لای ئەو تیپەی بنێرم کە بەخێڵەکانی باشووری ئێرانەوە خەریکە.»
«باشە، دەزانی کەی دەگەڕێتەوە؟»
«بەڵام من پێشی ئێوە سواری دەبم.»
«بۆ کوێ دەڕۆی؟»
«هێشتا پێیان نەگوتووم.»
ئەوەندە تووڕە بوو بووم خەریك بوو پەلاماری کابرا بدەم و ئەنجن ئەنجی بکەم. بەڵام خۆم زەوت کردو نەمهێشت هەستم پێ بکا.
«چۆن هێشتا پێیان نەگوتووی؟»
«لە بەر ئەوەی هێشتا ڕێگایان نەداوەمێ بەسەر تورکیادا بفڕم.»
«کێ ئەم ڕێگایە دەدا؟»
«فوهرەر خۆی.»
«پێت وایە کەی ئەم ڕێگایە دەدا؟»
«هەر ڕۆژێك بێ.»
ئیدی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ چاوەنۆڕی بڕیاری سەرکردایەتیی میری بووین. ئەو بڕیارە بۆ کردەوەکەی ئێمە شتێکی بنچینەیی بوو. هەموو ئەو ماوەیە فڕۆکەکەی لەمەڕ ئێمە ئامادەو تەیار لەوێ وەستا بوو.
هەفتەیەك بەسەر چوو، پاشان هەفتەیەکی تریش. ئەو کاتەش هەوای باشوور پێدا پێدا گەرمتر دەبوو. ئەو هەوایە بۆ توانای بەرگرتەنیی ووزەی ئەوروپاییانەی ئێمە لە کێش بەدەر بوو. پاشی ئەوە هەواڵی ستالینگرادمان بۆ هات. سوپای ئەڵمانیا دەیویست لە قەفقاس بکێشێتەوە. ئیتر یان ئێستا یان هەرگیز. یان دەبوو شەڕ بدۆڕێنین یان لە دووا ترووکەدا هەلومەرجەکە ڕاست کەینەوە. هێشتا

کاتی ئەوە مابوو بتوانین شتەکان بخەینەوە سەرباری ڕاستی. ئەو کارە یەکلا کەرەوەیەی بڕیاری بارگۆڕینی ڕووکاری شتەکانیشی دەدا بە ئێمەو بە کردەوەی مامۆنتەوە بەند بوو. بەڵام ئەو پرسیارەی ئێستا دەستم کرد لە خۆمی بپرسم ئەوە بوو ئایا کردەوەکە بە چاوی ئاساییەوە هێشتا لەبارە؟ ئایا بۆ ئێمە ئاوو هەوا زۆر گەرم دانەهاتووە و بارو مەرجەکە زۆر ئاستەم نەبووە؟

ئایا ئێمە دەتوانین بەرگەی کاریگەرێتی لە کێش بەدەری گۆڕانی ئاوو هەوا بگرین؟ مانگی نیسان ئەو مانگەی ئێمەی تێدا ئامادەی ڕۆیشتن دەبووین، کوردستان تەواو گەرم بوو بوو، مایس گەرمتریش بوو. بەڵام لە مانگی حوزەیران تەنیا گەوج و گەلۆر دەتوانن خۆیان لە گەرمای گڕگرتووی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بدەن. بە کورتی، ئارامم لێ هەڵگیرا.

«بابە کەیفی تۆ بێ،» گوتم. «بەڵام لە ماوەی دوو سێ هەفتەی تر دەبێ ئێمە بەرێ کەوین.» فرۆکەوانەکە سەرنجێکی پڕ لە سەرسوڕمانی دامێ.

«ئەگەر ئێستا نەڕۆین،» گوتم، «دەبێ هەموو شتێ بووەستێنین، باری سەرکەوتن ڕۆژ بە ڕۆژ پتر دەئاڵۆزێ. پێویستە ئێمە بەرێ کەوین،»

تیێ هەڵکردە بروبیانوو هێنانەوە: «بەڵام...»

«بیبڕەوە،» گوتم، «ئەم بروبیانووە هیچ و پووچانەی سەبارەت بە بڕیاری سەرکردایەتیی میرییەوە جارس وەرسیان کردم. ئێمە ئێستا دەڕۆین و هیچ گوێش نادەمێ فرۆکەکە چ جۆرێکە.»

کەوتە گرژو مۆنی و شان و باڵی بێزاری هەڵتەکاندن.

گوتم «خۆم ڕاستەوخۆ پێوەندی بە سەرکردایەتیی سوپاوە دەکەم و داوا لە مارشال کەیتل دەکەم خۆی بە هانامانەوە بێت و بەڕێمان بکا.»

دەمودەست هەڵسوکەوتی کابرای فرۆکەوان گۆڕاو دەستی کردە خۆشکە خۆشکەیی، «دۆزیمەوە، بەداخەوە پێشتر بیرم بۆی نەچوو بوو، فرۆکەیەکی دوور ڕۆی تر لەبەر دەستە: کۆندۆرە!»

بە بێزارییەوە گوتم: «ئەدی بۆ لە ئەوەڵەوە وا ناڵێی؟»

گوتی: «دەتوانی سەیرێکی بکەی. هەرچۆنێك بێت پێویستە پێت بڵێم ئەمەیان سلایدی بازدانی نییە. یەکسەر لە دەرگاوە دەردەچن.»

گوتم: «هەر ئەوەندە؟ بەلای منەوە گرنگ ئەوەیە بەرێ بکەوین.»

چەند ڕۆژێك دواتر، لەسەر زەریای ڕەش و لە ناو پڕە کۆندۆر بەرەو ژوانگەمان بەرێوە بووین. حوزەیرانی ١٩٤٣ بوو. برای خۆمم لەوێ بە هیوا کردبوو بۆ ئەوەی بە بێتەل پێوەندیمان لەگەڵ بکا. کەسیتر نەبوو لەوم پتر متمانە پێ هەبێت بۆ ئەوەی لە یەکبینە چاوەنۆڕی نیشانەناردنی ئێمە بێت. نوێترین و بەهێزترین دەزگای وەرگری پێ بوو، ئەرکی وی ئەوە بوو نامەکانی ئێمە بە دەزگا بۆ هانز کریستۆف بنێرێتە بەرلین. ئەویش لەلای خۆیەوە دەیدانە (دەستەی گشتی) لە (سەرکردایەتی)و، (هێزی ئاسمانی) و پاشان ڕینوێنیەتی ئەوانی بۆم دەناردەوە.

بۆ کردەوەی مامنت من پلەی (مێجەر ـ ڕائد)م پێ درا بوو و دوو هاوڕێ ئەڵمانەکەشم پلەی (ملازم اول). لە بارێکدا ئەگەر هاتوو نیشتنەوەیەکی کتوپڕمان لە تورکیا یان لە هەر جێگایەکی تر تووش هات ئەوا ڕەمزی دەمودەست بەرگی سوپایی دەپۆشی و پێناسەی چاوەشێکی ئەڵمانی بە ناوی

(مایەر) هەڵدەگرت. زۆر کەیف شاد بووم کەوا هانزل و هانز کریستۆف پشتیوانم بن بۆ ئەوەی ئاگایان لە جێبەجێ کردنی پێویستییەکانم بێ لە بارەی پەیدا کردنی پیاوو کەلوپەلەوە. کەسی تر نەبوو بە هەمان پلەی متمانەوە پشتی پێ ببەستم بۆ ئەوەی داواکارییەکانم بە زوویی رابپەڕێنن. فرۆکەوانەکەش، ئەو پیاوەی هەموو ئەو مادەیە مامەڵەم لەگەڵی دەکرد، گفتوگۆیەکی بە وردیم لە بارەی شوێنی خۆ هەڵدانەکەمانەوە لەگەڵ کرد بۆ ئەوەی خۆمان لەشیمانەی چەوتی و تێ نەگەیشتن بپوێرین. لە بارێك ئەگەر هاتوو سەبارەت بە هەر هۆیەك بە شوێنی خۆ هەڵدانەکەمان نەکەوتین و، لەبەر ئەوەی کاتی ئەوەشمان نەبوو هێندە خۆمان بەم لاو ئەو لاوە خەریك بکەین، بۆیە لەسەر ئەوە

رێك کەوتین، دەسبەجێ فرۆکەکە بەرەونیکە بگەڕێتەوەو پاشی هەفتەیەکی تر دیسانەوە هەوڵ بدرێ بۆ ئەوەی جێ مەبەستمان بدۆزیتەوە. فرۆکەوانەکە وای دەنواند کە زۆر حەز دەکا مرەو شوێنی. ئەم خۆڵدانەمان لەگەڵ ئێمە بێت.

کەمێـك پێش ئەوەی دورگــەی قرم بەجێ بێڵین، جارێکی تریش لەگەڵ فرۆکەوانەکە چاومان بەســەر هەمــوو شتێك گێڕایەوە، جارێکیان خەریك بوو لە ناوەندی ئاسمان رێبازی فرینمان لێ بشێوێ. پاشکۆی فرۆکەکە پری بوو لە تانکی گەورە گەورەی بەنزین و ئەو باوڵانەی کەلوپەلەکانی ئێمــەیــان تێــدا هەڵگــیرا بوو. خۆمــان لە گۆشــەیــەکی بچووك پەستابوو، بە ئاستەم دەرفەتی بزووتنەوەمان هەبوو.

ئەوکـاتـەی دەگەیشتینە شوێنی خۆ هەڵدان، فیکەی بە ئاگاهێن دەیکێشاو، پێشەکی دەبوو باوڵەکان هەڵبدرێنە دەرەوەو، پاشی ئەوە دەسبەجێ ئێمە خۆمان هەڵدەین.

دەبــوو فرۆکــەکــە کەمێـك پێش تاریکی کەوتن بەرێ بکــەوێ بۆ ئەوەی شەو بەرێگاوە بین. فرۆکەکەمان مەکینەیەکی ئەوتۆی هەبوو دەیتوانی هێندە بەرزببێتەوە لە نیگای چاوی دوژمن و ئاگردەرەکانیان بە دوور بێ، ئیدی لەوێوە لەو پەری بەرزی و بەو پەری خێراییەوە بەرەو ناوچەی دوژمن بکوتێ. بە داخەوە نەماندەتوانی خۆمان لە تێپەڕبوون بەسەر تورکیا دا ببوێرین. یەکجار زۆرمان پێ ناخۆش بوو لەوێندەر بکەوینە بەرچاوان.

هەرچۆنێك بێ ئیتر لە بڕوبیانووی لەمەڕ ئیزنی تایبەتیی (سەرکردایەتی فوهرەر)ەوە رزگار بووین.

دەبوو لەیەك پشوو باڵۆین تا دەگەیشتینە زەریاچە ١٣٠ کیلۆمەتر درێژەکەی ورمێ لە بەری رۆژئاوای ئێران. تەنانەت لە شەوەزەنگی ئەنگوست لەچاویش دا دەتوانرا لە ئاسمانەوە ئەو پانتاییە ئاوە بناسرێتەوە کە تریفەی کزی رۆشنایی شەو بەس بوو بۆ ئەوەی بدرەوشێتەوە. بەڵام بەختمان لەبــار بوو. مانگــە شەو بوو ئەمــان مانگــە شەو، نووکی ژێــرەوەی زەریاچەکە بەسانایی جوێ دەکــرایــەوە، چونکــە لەم نوختــەیەیدا رووبارێکی تێوە دەرژا، دەبوو ئێمە بناوانی ئەو رووبارە هەڵگرین تا دەگەیشتینە ئەوەی پێچێکی توندی دەکردەوەو، ئیدی لەوێوە رووەو باکووری رۆژئاوا وەر دەســوراین. پێنــج دەقیقــە فرین لە رووبــارەکەوە دەمانبیردە هەرێمی لوتکەی گەردنکەشی کێوەکانی کوردستان. لێرە وورچ و گورگ و توورگ هەبوون بەڵام مرۆگەلێکی کەمی تێدا دەژیان.

ئەوانی یەکەم هەر ئەوەندە بوو ترسناك بوون و دەبوو خۆمان لە ڕێیان لا بدەین بەڵام ئەوانی دوایی دەبوو وەك دەردو بەڵا خۆمانیان لێ بپارێزین.

کاتێکی فڕۆکەکەمان دەگەیشتە چیایان، دەبوو زوو شوێنی دۆڵێك هەڵبگرین و ٢٠٠ مەترێك بە نزمی لەسەر زەوییەوە بفڕین. دەبوو خێراییەکەشمان بەرادەیەك کەم بکرێتەوە کە بتوانین خۆمان هەڵدەین. سەرەتا، باوڵەکان هەڵدەدران و ئەوجا من و سێ هاوڕێیەکەم شۆڕ دەبووینەوە. پاشان فڕۆکەکە بەو پەڕی خێراییو لە کورتترین ڕێگاوە بەرەو وڵات دایدەقلاشت. پاش چەند سەعاتێك لەلایەن بێتەلی ئەڵمانیاوە وەردەگیرایەوەو بۆ فڕۆکەخانەیەکی نزیکە دەست دەنێردرا. برای خۆم و هانز کریستۆف وتێکڕای تیپەکە چەند شاگە شکە دەبوون کاتێ دەیانزانی دەستە پیاوی یەکەم بەسەرکەوتوویی گەیشتوونەتە جێ! ئیدی هانزل دەسبەجێ دەچووە لای دەزگا وەرگرەکەی و خۆی بۆ یەکەمین ئاماژەی من مەڵاس دەدا. پاش ئەوەی دەگەیشتینە سەر زەوی بەناو دۆڵەکەدا دەگەڕاین و دەسووڕاین هەتا هەر چوار باوڵەکەمان دەدۆزیەوەو سەرەتا لە شوێنێکی کە سنەزانمان دەشێردنەوە. ئەوجا یەکراست هەوڵم دەدا بە بێتەل پێوەندی لەگەڵ هانزل بکەم. بۆ پاشتر کاتی تایبەتمان هەبوو بۆ نامەناردن بەڵام نەماندەتوانی هەمیشە هەمان بەڵێن بپارێزین چونکە ڕەنگ بوو هەندێك مەرجی وەك: پاراستنی نهێنی و ڕووکار گۆڕین و نەساغی یان هەندێك جار تێکچوونی دەزگاکەمان، لە کارمان بخەن.

وامان دانابوو ـ لە بارێکدا ئەگەر دابەزینمان بکەوتایە بەرچاوان، سەرەتا خۆمان لە شوێنێکی چۆڵ و نەدیوو بشێرینەوە. بەڵام ڕەمزی وەك کوردێکی ڕەسەن بە زوویی خۆی دەگەیاندە ئامۆزایەکەی (خوێنبرایەکەی) بۆ ئەوەی زانیاریمان بۆ کۆبکاتەوەو پێوەندیمان لەگەڵ شێخە کوردەکان بۆ ببەستێ.

مەکینەکە لە چاوەنۆڕیی بەرێ کەوتن وەستابوو. ماتۆڕەکانی گەرم دادەهاتن. هەرچەندە بەرگی سوپاییمان لەبەر بوو بەڵام جلکی کوردیمان لە ناو لنگی شەرواڵەکانمان شێردبۆوە، بریار وا بوو دوای بە زەوی گەیشتنمان لە بەریان هەڵکێشین. سەرو بەچەکمان تەواو کوردانە بوو، هەرکەسەو کاکۆڵێکی تراشاو و ڕدێنێکی کتومت کوردانەمان هەبوو. ئێمە یەکسەر جلکی کوردیمان لەبەر نەکردبوو چونکە ئەگەر بهاتایەو فڕۆکەکەمان ناچار بوایە کتوپڕ لە تورکیا یان لەهەر ناوچەیەکی دوژمن بنیشێتەوەو، ئەگەر لە کاتی بەدیل گیرانمان جلی سوپاییمان لەبەر بوایە ئەوا وەك گیراوی ئاسایی سەرو بەندی شەڕ بەند دەکراین بەڵام ئەگەر بە بەرگی شارستانییەوە بگیرابنایە ئەوا خراپمان بەسەر دەهات.

سێ هاوڕییەکەم و هانزلم بردە لایەکەوە پێم گوتن:

« هەرشتێ پێوەندیی بە مرۆوە هەبێ جێبەجێ کراوە؟ بۆ ئەوەی دڵنیابین هەموو شتێك بە سووك و سانایی دەڕوات بەڕێوە بەڵام ئایا لە بارەی هێمای بێتەل و کاتی ناردنیەوە دڵنیاین؟»

هانزل سەری بۆ ڕاڵەقاندم.

«هانزل، ئیدی هەر نامەیەکت لە ئێمەوە بە شەپۆلە درێژی وەرگرت و بۆت نەکرا هێماکانی شی بکەینەوە، هیزە بە هیمەت بێ یان بە قیمەت هەوڵێك لەگەڵ هێمای کتوپڕ بدە. هەموومان هێمای کتوپڕمان بە چاکی ئەزبەرە (ئەرێ سووزانە شووم پێ ناکەیت.) لەوانەیە شتێك ڕوو بدات و

سەرلەبەری دەستاویژەکانمان لە دەست بدەین.»
ئیدی ئەوە بوو سواری (کۆندۆر) بووین.

## بەریگاوە

ئەو کاتەی هەتاو بە بلێسەیەکی درەوشە دارەوە سەرەو لێژ بووەوەو ئاسمان مالئاواییەکی رەنگاو رەنگی گەرمی لێ کردین، بە بێدەنگی سەرم بۆ لای نیشتمان وەرگێرا و لە بنەبانی دلەوە هیوام بۆی هەلکێشا، هیوای ئەوەی بۆمان بکرێ یارمەتی و دەسگرۆیی بۆ وولات و رۆلەکانی وولات دابین بکەین پێش ئەوەی زۆر درەنگمان بەسە ردا بێت. دەرگایەکە لە پشتمانەوە پێوەدراو مەکینەکان بە نەرو هۆر کەوتن. جگە لە دەستەی فرۆکە کە بریتی بوو لە کاپتن و دوو یارمەتیدەر، ئێمە ـ بە کاربەری بێتەل و فرۆکەوانێك و پاسەوانێك و کۆنە هاورێ جێ بروایەکەی مەشقدەری چەتر بازیو پسپۆرێکی دژەخەفیەییشمان لەگەلدا بوو.
هەروارتـر و هەروارتـر بەرەو ناو تاریکی و ئەتمۆسفیری سەهۆلاوی هەلکێشاین. هەر زوو ۱۰۰۰مەتر بۆ سەر زەریای رەش بەرز بووینەوە داوای بەروانکەی رزگاریم کرد. گوتیان بۆ ئێمە نییە، تەنیا بۆ دەستەی فرۆکەیە. کەفوکولی توورەیی خۆمم بەرزەوەت کرد.
کاتی توورەییو رکەبەری نەبوو. کردەوەیەك ۱۰۰۰ کیلۆمەتر لە پشت دوژمنەوە بێت ئەوپەری وریـایی و دان بە خۆداگـرتنی پێوستە. هێشتا بەرزتر هەلکشـاین. هێندە ی نەبرد گەیشتینە ۴۰۰۰ مەتـری سەر رێکـاری زەریا. چاوێکم بەوناوەدا گێرا بەلکو دەمەوانەیئۆکسجینمدەست کەوێ، چونکە بۆ ئەوەی بەسەر چیای ئەراراتدا تێپەرین کە یەکراست کەوتبووە پێشمانەوە هێشتا سێ چوار هەزار مەتری تریش بەرز دەبووینەوە. هەروەها بۆ ئەوەش نەبادا روو بەرووی فرۆکەی دوژمن ببینەوە دەبوو زۆر لە بەرزییەوە بفرین.
ئاماژەی پیاوێکی سەر بە دەستەی فرۆکەوانم دا بۆ ئەوەی بێتە لامەوە. پرسیم: «کوا دەماکی ئۆکسجین؟»
بەو پەری سەرسورمانەوە گوتی: «هیچی لێ نییە.»
«چی؟ دەمامکی ئۆکسجین نییە؟» گوتم.
وەلامی نەدامەوە.
گوتم: «گالتەم لەگەل مەکە. ئێمە بۆ بەرزتر لە ۷۰۰۰ مەتر هەلدەکشێین. وانییە؟»
جارێکی تریش سەری سەلماندنی بۆ لە قاندمەوە..
«ئیدی کوان دەمەوانەکان و لە کوێوەی بەکارەیا دەگەینین؟»
گوتی: «ئێمە هیچ ئامێرێکمان بۆ ئێوە نەهێناوە.»
بە گژی داهاتم و گوتم: «بەلام دەستەی فرۆکەوان هەیانە!»
گوتی: «بەلێ.»
هیوابرا بووم: ئایا ئەم پیاوە گێژو گەوجە یان شێتە؟ ئەگەر بمتوانیایە ببزووم ئەوا دەچوومە پێشەوە بۆ ئەوەی کاپتن ببینم.

ئەمە هەر راست نەبوو! دەستەی فرۆکە (دەمامکی ئۆکسجینیان) هەبوو دەیانتوانی لەو پەڕی بەرزیدا بژین بەڵام ئێمە کە گەشتەکەمان بۆ ڕێکخرا بوو لەم سووچە تەنگەبەرە بە کوڵەواری لە نێو دەچووین. لە دڵی خۆمدا گوتم شتی وا هەر نابێت. هەوڵم دا ئەو بیرە لە مێشکم وەدەر نێم.

گوتم: «تکایە بە کاپتن بڵێ دەمەوێ ببینم.»

کابرا وون بوو و کاپتن هەر نەهات.

لەو کاتەدا کابرای مەشقدەری چەتربازی کە لە بۆ دێنتەل لەگەڵمان بوو بە دەنگ هات و گوتی:

«تێناگەم شتی وا چۆن ڕوو دەدا. بەڵام تەنگاو مەبە. من ئۆکسجینەکەی خۆمت لەگەڵ بەش دەکەم. ئەم دەست و ئەو دەست بە لوولەکە دەکەین و ئیدی هەریەکە و دەتوانێ چەند پشوویێك لە دەمەوانەکەوە وەربگرێ بەڵام تکایە زۆر نا، دەنا بەشی ئەوەم ناکا بگەمەوە وڵات.»

هەستم بە دڵنیـاییـیـەکی خۆش کرد کەوا ئەمجـارەش هەموو شتێك ڕێکوپێك بووەوە. بەڵام نەمدەتوانی خۆم لە چنگی ئەو بیرە ئازادەرە ڕاپسکێنم کەوا هەندێك شتی نەبان و نامۆ لە گۆڕێدا هەن. ئایا چ شتێکی چەوت و چەوێڵ بەگەڵ هەناردنی (کردەوەی مامۆنت) کەوتبوو؟ نەمدەویست دان بەم شیمانەیەدا بهێنم. نەدەبوو خۆم بکەمە نێچیری ترس و دڵەڕاوکە ـ هەرچەندەکە ترس و دڵەڕاوکـەشم هەبـوون. لە ناوەندی کێشەو بەرەی نێوان وورەی سەرکەوتن و، گومان و ترسدا، هەستم بە سەرمایەکی بەتین و تاو کرد. دەستەی فرۆکە پۆشەنیو بەرگی گونجاویان لە بەردا بوو، بەڵام ئێمە بە خۆمان و بەرگی سوپایی و ئامێرو ئامادەیی خۆهاوێشتنەوە، لە گۆشەیەك هەڵکونجا بووین. چەترو ئامێر شوێنەکەیان لێمان تەنگ کردبووەوە، نەماندەتوانی جووڵە بکەین، لەبەر ئەوە لە شوێنی خۆمان گورمیلە بوو بووین، لەسەرمانە موچرکەو لەرزە لەرزمان پێ کەوتبوو. چاوەنۆڕ بووین خۆمان بۆ ناو بۆشایی و شەوە زەنگ هەڵدەین. تەنیا لە پەنجەرە بچووکەکەی پشتمانەوە دەمـانتوانی سەرەتاتکەیەکی دەرەوە بکەین، هێشتا مانگ هەڵنەهاتبوو، هەستی پڕ لە دڵەکوتە و مەترسی بەرە بەرە پتری هەڵچنیم. بۆ؟ هیچ جاری تر ئاوەها نەشڵەژابووم. دەمویست بە سەریدا زاڵ ببم. بە خۆمم گوت ئەمە ئاکامێکی ئاسایی لە سەرما ڕچین و کاری وورە پێ بەزینی نەبوونی کەوڵی ڕزگاریو دەمامکی ئۆکسجینە بەڵام نەمتوانی بەسەریدا زاڵ ببم. تا ئەو ساتە بڕوای تەواوم بەسەرکەوتنی گیانبازییەکەمان هەبوو. ئەرێ ئێستا چ هۆیەك هەبوو ببێتە مایەی دڵ لە دڵ دان؟ ئایا بە هۆی ئەو شتەی پێشمانەوە بوو؟

ئەو دەمـەی کردەوەکەم ئامادە دەکرد چەندین جار هەوڵم دەدا بەراستی و بە دڵسۆزی ئەم پرسیارە بەرەو ڕووی خۆم بکەمەوە: چ شتێك هانت دەدا؟ شانازییە؟ خولیای گیانبازییە؟ خولیای دەسەڵاتدارییە؟ ئایا بەراستی خولیای ئەوەیە یاریدەی هاونیشتمانانت بدەی؟

هەموو ئەو هۆیانە بەسەریەکەوە بوو بوونە وەڵام؛ لە ئاواتێکی ڕووت و پەتییەوە بۆ هیوایەکی ڕاستینەی خزمەتکردنی نیشتمان. بەڵام بۆ من پتەوترین هۆ، هەستێکی نادیارو بەناچاری بوو نەمدەتوانی ڕوونی بکەمەوە. ها بەو شێوەیە (بڕوایەکی گرنگ) هەڵی گرتم و ڕێی نیشاندام تا بگەمە ئەو دەمەی لە (کۆندۆر)دا کابنیشم، چۆقەی ددانم بێ و لە سەرمانە هەڵبلەرزم.

جارێکی تریش لە بیری خۆمـدا بەسـەر ئامادەکارییەکانمدا چوومەوە. ئایا چ شتێکم لە بیر کردووە؟ چ شتێکی چەوتم کردووە؟ چەندی بیرم دەکردەوە هیچ دەروویەکی ترم نەبوو چ لە باری

مەشقکردن و چ لە ڕووی پێکهاتی تیپەکەوە تاوەکو کردەوەی مامۆنتی پێ چڕو پڕتر بکەم. بەڵام چەنـدی کنەی ئەوەم دەکرد بەسەریدا زاڵ ببم، دڵەراوکەی تاین بەری نەدەدام. ڕاستت دەوێ چەندی پتر دەمکردو دەمکۆشا لە بیرە خۆمی ببەمەوە پتر تێم دەئالایەوە. سەرەنجام خۆم بۆی شل کرد. هەتا لەم کونجەی (کۆندۆر) و ئاوەها بێ ئومێد و بێ سەرەدەر و لەسەرما ڕچیوو کرووشکەم کردبێ هیچم لەدەست نایە. بە کورتی دەبوو سەر بهێنمە بەر ئەو چارەنووسەی ئاوەها دووری هەڵگرتبووم و خۆی بۆم لە پارێز نابوو.

پاشـان دەستم بەشتێـك کرد بۆ ئەوەی ئەو دۆشدامانە کەمێك برەوێنمەوە: دامە دووی نزا خوێنـدن. چەنـد ووشەیەکی سروودێکی ئایینیم وەبیر هاتەوە، لە سەردەمی منداڵییەوە ئەزبەرم کردبـوون: «دەستم بگـرەو ڕێم پیشاندە» پێدا پێدا دووربارەو سێبارەم دەکردەوە تا هەست و هۆشێکی دڵنیـایی دایگـرتم و ئیـدی لەو دەمەوە دڵنیا بووم هەرچییەکی بەسەرم بێت و نەیەت سەرەنجام و چارەنووس هەر لە مستی خودایە.

★ ★ ★ ★

ئایـا ئەم فرۆکەوانە شێتە، چییە. لەسەر ئەو زەویە چی دەکات؟ فرۆکەیەکی چوار مەکینەیی ئەڵمانی، بەم سەعات یەکی شەوە لەبەرزیی سێ تا پێنج هەزار مەتر و لە ناوەندی ئاسمان، لەبەر تیشکی ڕوونـاکی مانگەشەو، لە سەر شارێکی پڕ لە چراو چراخان سووڕی دەدا. لە پەنجەرە بچووکەکەوە شارەکەم لێوە دیار بوو. دەستم بە هات و هاوار و پرسیار کرد. یەکێك لە بناگوێمەوە دەنگی هەڵبڕی:

«ڕێگامان بزر کردووە. هەوڵدەدەین بزانین لە کوێین:»

بەڵام ئەگەر وا بێت بەچی بیانووێك لەم بەرزییە و بەسەر شارێکەوە گردەخۆین و دڵنیاشین وولاتی دوژمنانە. لە باری ئاوەهادا پێویستە یەکراست بەرەو نیشتمان هەیپێی لێ بکەین و پشتی هەفتەیەك هەوڵێکی تر بدەینەوە.

ئێمە لە سەرەتاوە لەسەر ئەمە ڕێك کەوتبووین. شوێن تەنگەبەریو نەرە نەری مەکینە هیچ دەرفـەتی ئەوەیـان نەدامێ دوو قسـان لەگـەڵ کابـرای فرۆکەوان بکەم. ئەوان بۆ خۆیان لێی دانیشتبوون و چارەنووسی ئێمەشیان بە تەواوی لە دەستدا بوو.

هێندەی پێ نەچوو نزمتر بووینەوە. بیرم کردەوە لەوانەیە ئێستا هەموو شتێك ڕێکوڕەوان بێ. بێ گومان دەبێ تەواو بێ ئەدی فرۆکەوانەکە کابرایەکی ئەزموونديتە نەبوو و چەندین نێردەی بە سەرکەوتوویی بەرێ نەکردبوو؟ دیارەکاری خۆی دەزانی.

ئەوە بوو ئامـاژەیان بۆ کردین: ئامادەی خۆهەڵدان بین! ئیدی دەرفەتی گومان و دڵەراوکە بە دەستەوە نەما. هەستاینەوە سەر پێیان، جارێکی تریش چەترەکان و پەتەکانیان پشکنییەوە. هەموو شتێك ڕێك ولێك بوون. دەرگاکە کەوتە سەر گازی پشت و دوو پیاو هاتن یاریدەی مەشقدەرمکەمان بدەن و باوڵەکانیان یەك لە دوای یەك دانا. پاشان ئاماژەیەکی تر هات و یەکەمین باوڵ هەڵدرایە ناو تاریکایی؛ پاشان دووەم؛ ئەوجا سێیەم و چوارەم. پاشان نۆرەی من هات. لەبەر دەرگاکە وەستام و ویستم چۆن مەشقم کرد بوو ئاوەها باز هەڵدەم. بەڵام گوژمەبایەك ناچاری کردم خۆم بدەمە لایەکی دەرگایەکە، تاوێك نەمتوانی ببزوێم. پاشان سەرە ساڵدرمەیەکی نارەوای یەکێك لە پشتەوە

هەڵی دامە ناو بۆشایی. تاوێك لە هەوا خولامەوە، سەرم هەڵبڕی زەینم دا چەترەكە كراوەتەوە. پاش نەرەو هەرای مەكینە بێدەنگییەكی سەیرو نامۆ باڵی كێشا. دەمتوانی كوندوڕ بینم بە رێگای خۆیەوە دەڕۆیشت. ئەی ئەوانەی تر لە كوێن؟ لە خۆمم پرسی! لە ژوور خۆمەوە، لەلایەك، توانیم دوو پاشان سێ چەتر لە ریزێكی رێكوپێكدا ببینم. سەرنجێكی بەپەلەی ژێرەوەم دا. باوڵەكان لە كوێ بوون؟ زەینی شەوگارم دا، ئایا باوڵەكان گەیشتوونەتە زەوی؟ زەویمان چەند لێوە نزیك بوو؟ ئێستا نا ئێستا بە زەوی دەكەوتم. لە راستیدا لەوانە بوو وەك چۆنی بۆ دەچووم ئاوەها بكەومە سەر زەوی. شتێكم لەژێرەوەدا هاتە بەرچاو، بە نەرمی لە هەوادا دەهەژایەوە: ئەو شتە چەتری باوڵێك بوو. بەڵام زۆر لە ژێرەوە بو. ئایا ئێمە لە كوێ دەكەوتینەوە؟

لەناكاو موچركەی ترسێكم هاتێ و دڵم راچڵەكی. رووبارێكم لە ژێرەوە هاتە بەر نیگای چاو. رووبارێكی بەرین، یەكراست لە بنەوەم بوو. دەبوو هێشتا هەزار مەتری تر شۆڕببینەوە. لەوانە بوو تەوژمی بایەك لە رووبارەكەمان لا بدات. بارمان هێندە گران بوو مینای پلووكە بەرد سەرەوژێر دەبووینەوەو تەنانەت ئەگەر خۆشمان لە چەترەكانمان بەربدایە هیچ ئومێدی دەربازبوونمان نەبوو

شەرواڵە فشوفۆڵ و دەلینگ تەسك و تریسكەكانمان پڕ بوون لە چەك و ئازووخەو توێشەبەرەی لە قوتــوو پەستــراو. وێرای ئەمەش دەزگای بێتەلم لە كەمەرم شەتەك دابوو. بیرم كردەوە: خوا فریارەسمان بێت.

سەیرم كرد بزانم هاوەڵەكانم چییان بەسەر هاتووە. هێندەی نەمابوو بروا بە چاوی خۆم نەكەم. دەتگوت لێم تێك چووە؟ یەكێكیان هەرگیز پێ نەدەچوو شۆڕببێتەوە بگرە هەوراز تر هەڵدەكشا. هەموو ئەوانی تر بە سەرلێ شێواوی وگێژو وێژی بەم لاو بەولادا دەهاتن ودەچوون تەنیا ئەوەیان نەبێ پێ دەچوو سەر هەوراز بەرز بێتەوەو بەناو تاریكییەوە وون ببێ.

پێم وابوو تارمایی زەویم لێ وەدەركەوت. لنگم هەڵبڕی، چاونوقاو بووم بەر زەوی بكەوم. بەڵام مەتــرسییــەكەم راست نەبوو. كەوتمە ناو چینێكی ئەستووری هەور و هێڵەوە. هێندەی نەمابوو مێشكم لە ژێر تینی پاڵەپەستۆدا هەرەس بێنێ.

وا ئێستا جارێكی تریش بریسك و باسكی زووی درەوشاوەی رووبارەكەم لێ وەدەركەوتەوە. بەڵام بەختمان یار بوو تەوژمی با بۆ بەرێكی رووبارەكەی بردبووین. كاتێ لە زەوی نزیك كەوتمەوە بە ئاستەم دەرفەتی ئەوەم چنگ كەوت خۆم بۆ بەزەوی كەوتن ئامادە بكەم. گلۆر بوومەوە، پێش ئەوەی چەترەكە بەسەر زەویمدا رابكێشێ خۆم لێی رەها كرد. باش بوو كاتی خۆی زۆر جارانم ئەو مەشقە كردبوو! زوو هەستامەوە سەر پێیان. چەترەكەم راكێشاو كۆم كردەوە سەرێك. بۆ یەكەمین جار هەستم بەو گەرمییە ترسناكە كرد

هەنكە هەنكم بوو، گەرووم گیرابوو. پشووم پێ نەدەدرا. بە هیچ كلوبابەتێك نەمدەتوانی بەرگەی شاڵاوی ئەو پێشكانە بگرم كە تێوەم وورو كابوون. هەستی راپەراندنی ئەركێك هاتە فریامەوەو هانی دام خۆم گورج بكەمەوە. پێویستە هاورێیەكانم بدۆزمەوەو بە هانایانەوە بچم. بەڵام ئەوان لە كوێ بوون؟ ئایا دەمتوانی لە ناو تاریكیدا بە دوایاندا بگەرێم؟ ئەوەی راستی بێت دەكرا سوود لە تریفەی مانگ وەربگرم. بەڵام من لە شوێنێكی هەڵەت و پڕ لە هەڵدێرو گەوە كەوتبوومەوەو بەسەر هەر ملەیەك دەكەوتم تەنیا دیمەنێكی بچووكم لێوە دیار دەبوو.

چەند خۆشە لەم بارو دۆخەدا یەکێك لە هاوەڵەکانم بدۆزمەوە. وەکو براو برادەرێك ئامێزی تێ وەربێنم و بەسنگەوەی بگوشم! ئەوە بوو یەکێکیانم دۆزیەوە. ها لەوێ لە بەر چاوم بوو، دەیویست خۆی لە چەترەکەی رەها بکاو کۆی ـ بکاتەوە باڵ یەك. ئەویش هانکە هانکی بوو و مێشوولە تەنگیان پێ هەڵچنیبوو.

هەردووکمان پێکەوە بە شوێن ئەوانی تردا ئەم لاو ئەولا گەراین بەڵام بێ سوود بوو. دواجار دەنگی سەگوەرێکمان هاتە گوێ. ئەمە مانای وا بوو ئاوەدانی لەو نزیکانە هەیە. هێندەی نەمابوو شێت و شوور ببم. ئەو شتـەی ئێمـە دەمـانویست خۆمانی لێ ببوێرین ئەوا هاتە پێشمان. لە شوێنێکی زۆر نزیك لە ئاوەدانی کەوتبووینەوە. گرفتێکی تریش وەك بڵێی بە دەستێ مەبەست ئەمە کرابێت، لەناو پەرێزێك کەوتبووینەوە. تووڵەرێمان لێوە دیار بوون لە گوندێکەوە دەچوونە گوندێکی تر، دەبوو بە پەلەپرووزێ لێرە دوور بکەوینەوەو سەری خۆمان بەرەو چیایان هەڵگرین و خۆمان لەوێ بشێرینەوە. بەڵام کوا چیا لە کوێ بوو؟ بەئاستەم تارمایی چیایانمان لە ئاسۆوە لێ دیار بوون. زۆر دوور بوون. بۆچی لەشوێنێ ئاوها هەڵدراین؟ ئەگەر هیچ شتێك روون نەبێت ئەوا هەر تاکە شتێك روون و ئاشکرایە، نەدەبوو لە نزیکی رووبار فرێ بدرێین لەبەرئەوەی لە کوێ ئاو هەبێ ئاوەدانیش لەوێ هەیە، لە کوێش ئاوەدانی هەبێت شیمانەی ئاشکرابوونی ئێمە پترە. دەبوو بە پەلە لێرە وەدورکەوین.

کوا ئەوانیتر، کوانێ باوڵەکان؟ رووناکی هەڵکردن، فیکەکێشان یان هاوارکردن هەر نەدەکرا. ئەدی لە کوێـوە دەست پێ بکەین؟ لەوانەیە ئێمە لە بەرزیی دوو هەزار مەترەوە فرێ دراببین و، سەرەرای ئەمانەش دەبوو بەرەنگاری ئەو هەمووگردو هەڵەتانە ببینەوە. هیچ شوێنێکی گونجاومان دەست نەدەکەوت بۆ ئەوەی سەیری دەوروپشتمانی لێوە بکەین.

کورت و کرمانجی دەبوو ئەو پەری توانامان بەکار خەین و پێش ئەوەی بەیان یەکەمین گزنگی بدا، لێرە برۆین. چونکە خەڵك لەگەڵ گەردوگۆڵی بەیانیان روو لە کێڵگەو ئیش و کاریان دەکەن پێش ئەوەی رۆژ رابشکێ و هەڵاتنی هەتاو دنیا لەگەرمان بپیشێنێ.

سەرەنجام، ئەو شتەی لە سەرەتادا واپێ دەچوو لە ووزەو توانا بەدەر بێت، تێیدا سەرکەوتین. پاشی چەند سەعاتێك گەران و سووران و سۆسەکردنی ئەم لاو ئەولاو گوێ هەڵخستن و پشکنین، هەموومان گردوکۆ بووینەوە. رەمزی هەڵەتی بۆ هێنام. لەرك تووڕەییانە چاوی دەرپەری بوو. «سەرۆك، ئێمە لە کوێین؟» چاوی بەرژدی لە دور چاوم بری. منیش بە ساردی وەڵامیم دایەوە: «لەشوێنێکی چەوت فرێ دراوین.» گوتم.

ئاشکـرابـوونی شکست هێنانی کردەوەی مامۆنت وەك ئەوە وابوو دەنکە حەبێکی تاڵ قووت بدەین، زۆر ئاستـەم بوو تەنانەت یەکێك لە چوار باوڵەکەشمان پێ دەرباز بکرێ. دەوروبەرێکی هەڵەتاوی بوو، سەدان گردو نەوری وەك یەکی تێدا بوو. هەروەها ناوچەیەکی ئاوەدانیش بوو وئەو ـحەش بەرە بەری بەیان بەردان بوو و دوای تاوێك خەڵك بە دووای کاروباری خۆیان دەکەوتن و هەر نەیا پاشی سەعاتێك یەکێك لە باوڵەکانیان دەدۆزیەوە. ئەمەش هەراو جاوە جاوێکی گەورەی ـهنـایـەوە. واتەوات و دەمگویەکی سەیر لەم گوندەوە بۆ گوند پەرتەی دەکردو، پۆلیس و هێزی داگیرکەر زوو بەزوو زانیارییان دەگەیشتێ هاتە هات و هاوار هەڵدەستاو لە ماوەی تاکە رۆژێك

دەسگیر دەکراین.

بەڵام سەرەرای ئەو بارە پڕ نەهامەتییەی کە خۆمان تێدا دەبینێ، کە فوکولی سەرریژی توورەییم نیشتەوە. پاش ئەو هەموو پەریشانییەی ئەو چەند سەعاتەی دوایی، مێشکم بەرە بەرە هێور بووەوە. هەرچەندە هەموو هۆیەکی قەڵەمی دەست وپێ شکانم هەبوون بەلام بەشێوەیەکی سەرنج راکێش هەستی هیوا براوی تەنگاوی نەکردم. دەمزانی گرفتی زۆروزەوەندمان لە پێشدایە، بەڵام هەستم دەکرد دەنگێك بە بناگوێمدا دەچرپێنی و دەڵێ ئەو شتە راست بوو و پێویست بوو هەر واش بوایە و، پێویستە منیش هێور ببمەوە تا رادەیەکی زۆر لە منداڵێك دەچووم مەشقی کارێکی ئاڵۆز بکات. ئەو منداڵە سوور دەزانێ کارەکە شتێکی پێویستەو ناچارە ملی لەبەر بنێ، بەڵام چەندی پێ خۆشە ئەگەر بتوانێ هەست بە سۆزی دڵنەوایی و خۆشەویستیو میهرەبانیی دەستی دایکی بکات.

## هەڵاتنی بەرەو چیایان

دەم تێك نانێکی لەکورتی براوە لەگەڵ هاوەڵەکانم تەنیا دادی ئەوەی دا بۆیان بسەلێنم کەوا ئەو هەمـوو زیت و زرنگیـەی لە کردەوەی مامـۆنت بەخـەرج درابـوو(ئەو کردەوەیەی کە سەرکردە پایـەبەرزەکانمان هێندەیان تەما پێ بوو) لەبارچوو. رەمزی پێشنیازی ئەوەی کرد دەبێ بەرگی سوپاییمان بگۆرین بەو بەرگە کوردییانەی لەگەڵ خۆمانمان هێنابوو و هەتا شەوە بۆی دەرچین. ئێمـەش قایـل بووین. چەترەکانمان لوول کردە سەر یەك و لەگەڵ بەرگی سوپاییو بەشەکانی ئامـێرەکـان تا بۆمـان کرا بە چاکیمـان شێردنـەوە. کڵاو و جەمەدانیی کوردیمان لێنا، کورتە و شەرواڵـان لەبەرکردو کەوشمان لەپی هەڵکێشا. پێناسەی سوپاییمان بۆ کاتی تەنگانە لەگیرفان هاوێشت هەرچـەنـدە بەکـەڵکی هیچیش نەدەهـاتن. چونکـە لەهـەر سەرێکەوە بگرتبا ئێمە لە وولاتی‌یەکێك کەوتبووینەکە سەری مەیدانی شەرمان لەگەڵی گرتبوو.

پیاو بە بەرگی شارستانی و لە وولاتی دوژمن لە هەموو پاسێکی یاسای نێو وولاتان دەسبرایەوە و ئەگـەر بێـو بکـەوێتـە دەست، بەبێ سێودوو دەدرێتە بەر دەستریژ یان بە نزیکترین دارەوە هەڵدەواسرێ. لاریمـان لەمـە نەبـوو. بەلام نەمان دەویست بکەوینە دەست. هەر هێندەی پێ دەویست دوژمن شتومەك و ئامێرەکانی ئێمەی بدۆزیبایەوە، ئیدی لە نیازی ئێمە دەگەیشت .ئەگەر هەر یەکێکیش لە ئێمـەی دەسگـیر بکـردایـە، چەندو چۆنی تێدا نەبوو هەرچی بیویستایە لێی دەردەهێنـا. کەس هێندە بێ مێشك نییە پێی وا بێت لەبەرامبەر شێوازی زەبروزەنگی ئەمرۆدا دەتوانێ بەرگە بگرێو هەموو نهێنی یەك ئاشکرا ناکات .ئەو سەردەمی قارەمانێتیە بەسەر چوو کاتێ یەکێك تا مردن جەزرەبەو ئەشکەنجە دەدرا بێ ئەوەی وورتەیەکی لەزار دەربچێ. لەبەر ئەمە ئامانجمان وا بوو بەڵکو بۆمان بکرێ سەرمان بەرەو شوێنێکی دوور لە دەسەڵاتی دوژمن هەڵگرین. لە ماوەی چەند دەقیقەیەك خۆمان ئامادەی رۆیشتن کرد. بەڵام ئەو پرسیارەی هێشتا دەمانویست وەڵام بدرێتـەوە ئەمـە بوو: ئێمـە لە کوێین؟ تورکیا؟ عێراق؟ئێران؟سووریا؟ رووسیا؟ بەگوێرەی

دیمەنی دەوروبەر وابێ دەرچوو لە یەکێك لەو وولاتانە بین. بەلام ئەگەر لەبەشە کوردستانی عێراق نەبووینایە جلوبەرگەکەمان بەکەڵك نەدەهات. جلوبەرگی نائاسایی وا لە ڕۆژهەلاتیایی دەکات هەر بەزگماك چاوەچاوی خۆ تێکەڵ کردن و هەموو شت زانین بێت. ئیدی دەست بە پرسیاران دەکات، تۆ کێی، لە کوێوە هاتووی ، بۆ کێندەر دەچیت. لە چ خێلێکی، چکارەی. ئەگەر نەتوانی بەزمان و دیالەکتی خۆی‌و بەڕەوانی وەلامی بدەیتەوە ئەواکابرا لێت بەگومان دەکەوێ‌و هەرچییەکی لەدەست بێت دەیکا بۆ ئەوەی پشتت لە زەوی بدات.

لێرەوە چیرۆکی ئەمـەکدارییەکی لەبن نەهاتوو دەست پێ‌دەکات  ئەمەکداریی ڕەمزی نافع ڕەشید، ئەو ئەمەکدارییەی لە تەنگاوەترین کات و تەنانەت تا ئەمڕۆکەش کە چەندین ساڵ بەسەر ئەو کارەسـاتـەدا تێپەڕیووە هێشتا گەرمی‌و فەراموشی بەگیانم دەبەخشێ. ئێستاش کاتێ بیر لە جوامێریەتی‌و ئازایەتیی ڕەمزی دەکەمەوە هەست و سۆزێکی بێ بن دامدەگرێ. ئەو پیاوە بەبێ ئەوەی سەبارەت بە هیچ هۆیەك ناچاری کردنی ئەو کارە کرابێت لە تەکمان وەستاو بە بوێری و مەردایەتییەکی لە بەزین نەهاتووەوە بە پێشمان کەوت.

لەو ساوە؛ ڕۆڵی من وەکو سەرۆکی نێردە بە کۆتایی هات و ڕەمزی ئەرکی گرتە ئەست. بۆ ئەوەی هەوڵ بدەین و بزانین لە چ شوێنێکین، بەپانەدزە و ماتەماتە وەدەرکەوتین تاوەکو ناوچەکە سۆسە بکـەین. یەکـەمین شتێك هاتە ڕێمان مارێکی سەوزی ژەهردار بوو لەسەر ڕێچکۆڵەکە پەیکەی کردبوو. کاتێ سەری بەرز کردەوەو سەرنجێکی ناحەزانەی پڕ لە کینەی داینێ، من سەرسام نەبووم.

نزیکەی دوو کیلۆمەتر چووبووینە پێش کاتێ لەسەر گردۆڵکەیەکی بچووکەوە ڕووبارەکەمان لێ وەدەرکـەوت. لە تەنیشتی ڕووبـارەکەوە گوندێکی نزیکەی پەنجاماڵی هەبوو لەگەڵ مۆڵگەیەکی گەورەی پۆلیس لە سەرپەرگەیدا. هاوار بەماڵم! لەدەرەوەی‌گوند پیرەمێردێك بەتەنیا لە کێڵگە کاری دەکرد، کەتانێکی بەتووکی لەبەر بوو ، لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست ئەمە باوەو لە جیاتی کراس لەبەر دەکرێ. ئێمە خۆمان لە پەنایەك مات دا. ڕەمزیش لەڕێگایەکە پەڕیەوەو کارەکەی لە ئەستۆ گرت. بێ گومـان نەیـدەتـوانی ڕاستـەو ڕاست پێی بڵێ «بەیانیت  باش»و لێی بپرسی ئێمە لە کوێین. نەیدەتوانی ئەمە بڵێ بەهۆی تاکە شتێك، ئاخۆ پیرە جوتیار بە تورکی دەدوا یان فارسی یان عارەبی. جگە لەمەش ئەگەر ڕێك و ڕەوان بە دیالەکتی کابرا قسەی نەکردایە ئەوا گومان و حەز لە پرسیار کردنی بەزگماکی پیرە جوتیار پەلکێشی ناو ووتووێژێکی درێژەکێشی ئەوتۆی دەکرد کە هەرگیز هیوای خۆ لێ دەربـازکـردنی نەدەبـوو، تا ئەوەی کابرا تەواو پێ دەکەوت ئەم کێیەو، لەکوێوە هاتووەو، بەرەوکوێ دەچێ‌و چی دەکاو سەر بە چ بنەماڵەیەکە.

ڕەمزی تەمای وابوو بەتەنیشت کابراوە تێپەڕێ و، سلاوێکی ئاسایی لێ بکات بەوەی دەست بخاتە سەر نێوچەوان و سنگی و لەهەمان کات چەند ووشەیەکی وەك «سەلام» یان «سەیدا» بچرپێنی. ئیدی لە وەلامی کابراوە تێ دەگەیشت بەچی زمان و دیالەکت بدوێ. ئەوجا دەیتوانی بەپەلە بۆی ڕێك بخا لە چ تیرەو خێلێکەو پاشی ئەمە دەیتوانی بەدیالەکتی گونجاوی تورکی، کوردی عارەبی یان فارسی وەلامی بداتەوەو بەم شێوەیە هیچ گومانێك سەری هەڵنەدەدا. ووتووێژێکی ئاسایی دەهاتە گۆڕێ. ڕەمـزی لەخـۆیـەوە چیرۆکێـك هەڵدەبەستێ (هێزی خەیاڵی ڕۆژهەلات ناوەڕاستی هیچ

سنـووریـك نازانیٚ)و لەمـاوەیـەکی کورت هەرچیـەکی بیـەویٚ دەیزانیٚت. ئیوچە ڕووناکبیریکی ڕۆژهـەلاٚت ناوەراستی سەرپاك زمان و دیالەکتی ناوچەکەی خۆی دەزانیٚ. کەچی شوانیٚك یان جوتیاریٚکی سادە تەنیا لە دیالەکتی خۆی دەگات. دیالەکت لە کوردستان لەبەریکی ڕووبارەوە بۆ بەرەکەی تری جودایەو جودایی نیٚوانیشیان زۆرە.

خۆشییەکی گەورە بوو بۆ ئیٚمە کاتیٚ ڕەمزی سپ و ساغ، یەکراست و بە هەنگاوی گورج و گۆلەوە گەرایـەوە لامـان ئامـاژەی داین بەرەو گوند وەدوای کەوین. ئەو بوو بووە ئاغامان و ئیٚمەش خۆلامکـارەی گویٚ لە مست و دەست لەسـەر سنگ. بەخۆمان و جلو بەرگی کوردیی بەرمانەوە سەرمان لە دوای ئەو نابوو. ئەگەر هاتباو تووشی هەر کەسیٚك بووینایە ئەوا تەنیا ئاغامان دەدوا: نەریت وایە پاکار و دەست و پیٚ کرو بیٚدەنگ بن.

کاتیٚ بەپیٚش گوند و مەلٚبەندی پۆلیس دا تیٚپەڕین، ڕەمزی شتەکەی بۆ ڕوون کردینەوە. توانیبووی بیٚ ئەوەی گومـان دروست بکـات، لە کابـرای پیرە جوتیاری دەربییٚنیٚ ئیٚمە لە عیٚراقین لە نزیك سنووری تورکیا.

« ها بەم بۆنـەیـەوە،» ڕەمـزی پرسیـاری کرد، «ئـافرەتەکەتان بینی بە سواریی کەر تیٚپەڕیٚ؟» سەیریٚکی ئەم ئافرەتە بەس بوو بۆ ئەوەی هەلٚی بیٚنی ئیٚمە لە کویٚین:

ئەو ئافـرەتـە کوردی (نـەستـووری) بوو. ڕەمـزی ئەو شتەی بە هیٚلەرەنگاو رەنگاکانی جلکی ئافرەتەکەوە ناسیبووەوە. ئەم تیرە دیٚرینەی کوردی دیانی نەستووری لە عیٚراق، لە ژووری دیجلەو لە سەر سنووری تورکیا دەژین.

بەداخـەوە، نەپرد نە بەلەم نەبوون لە ڕووبارەکەمان بپەڕیٚننەوە. پەرینەوەی بە مەلە شتیٚکی لە توانابەدەر بوو. چونکە لیٚرە باو نییە پیاو مەلە بکەن و ئەگەر بمانویستایە بەمەلە بپەرینەوە ئەوا تیٚك و تیٚکرای گوند دەهاتنە سەیرانمان . هەروەها نەشمان دەتوانی بەوناوەدا بسووریٚینەوە تا تاریکان دادەهات. ڕیٚژەنی ڕووبارەکەش زۆر لەوە توندتر بوو ئیٚمە بتوانین خۆمانی لیٚ بدەین و بە سەلامەتی دەربچین.

تاکە یەك چارەسەرمان هەبوو، ئەویش ئەوە بوو بەو پەڕی خیٚرایی لیٚرە دوور بکەوینەوە. بەپیٚیان بیٚ، بەسواریی گویٚدریٚژ بیٚ یان هەر شتیٚکی تری بۆمان هەلٚ بکەویٚ نەدەبوو کات بە فیٚرۆ بدەین. پاشی سەعاتیٚك، بەهۆی گەرما کەس بەسـەر ڕیٚگاو بانانەوە نامیٚنیٚ. هەموو خەلٚك لەبەر سیٚبەر پشوو دەدەن، لەمالٚ یان لە سیٚبەری دارو درەخت سەرخەو دەشکیٚنن. ئەمە باشترین هەلٚی دەرباز بوونی ئیٚمە بوو. لە ماوەی یەك تاکە ڕۆژدا بەندوباو وەك ئاگری بەپووشەوە نووساو بلاٚو دەبووەوە ، تیٚکرای دانیشتوان بەگومانەوە سەرتاپای هەموو ڕیٚوینگ و ڕیٚبواریٚکیان بەنیگای چاوان دادەبیٚژت.

چیـایـەکـانمان لەوبەری ڕووبارەکەوە لیٚوە دیار بوون. ڕەنگە هەر بیست سی کیلۆمەتریك دوور دەبوون. بەلای منەوە چیا هیٚشتا مانای هیٚمنیو سەلامەتییان دەداو ئاواتم بوو دەستم پیٚیان رابگا بەلاٚم چیا لەو دیوی ڕووبارەوە بوون و ئیٚستا دەستی ئیٚمەیان نەدەگەیشتیٚ. جا بەڕاستی چیا چەند دادی ئیٚمەی دەدا؟ تەنیا چیای ووشکیٚن و برینگیٚن و چۆلٚ و بیٚ ئاوەدانی بەکەلٚکت دیٚن ـ کاتیٚ دەچیتە سایەی ئەشکەوتیٚك ، بەومەرجەی خۆراك و ئاوات بە رادەی پیٚویست لەبەر دەست

هەبێت
مووسڵ سیچل کیلۆمەترێك دوور دەبوو. لە مووسڵ پرد هەبوو و بریارمان دا بە ئاشکرایی‌و چاونەترسی لەوێ بپەڕینەوەو پاشان بەرەو خێڵەکەی رەمزی ـ کە ١٥٠ کیلۆمەترێك لەولاوە تری بوو بەرەو باکوور لە رۆژهەڵاتی چیایەکان، هەیپای لێ بکەین. ئەو شوێنە چاکترین شوێنی چاوەنۆر کراوی دوورە بەلایی بوو.
هەرچەندە سەعات هەشتی سەر لەبەیانیش بوو بەلام گرفتی هەرە گەورەمان ئەو هەتاوە بە تیشکە بوو کە بێ بەزەییانە تیشکی بەتینی دەهاوێشتە سەرمان. نەك تەنیا هەردوو هاوڕێ ئەڵمانەکەم بەدەست گرەی گەرماوی لەووزە بەدەر دادە دادیان بوو بگرە رەمزیش کە ئێمەو پێمان وا بوو تا رادەیەك لەگەڵ ئەم گەرمایە هەڵ دەکا.
هەروەها بۆ منیش هەرچەندە چەند ساڵێك لەوەپێش لەهەمان ئەم کاتەی ساڵدا سەردانی کوردستانم کردبوو، گەرمایەکی تا بڵێی دژوارو لەبەرگەگرتن بەدەربوو.
سەرباری ئەمەش، کاتێ جلەکانم گۆڕیبوو ئەوەم لەبیر چوو بوو ئەو کڵاوە لبادینەی هەردوو هەورییەکەی تێوە دەپێچرا، لەسەرم نێم. لەبەر ئەمە من لە هەموان پتر دەکەوتمە بەر تیشکی راستەوخۆی هەتاوەوە.
رێگاکەمان کەوتبووە ناوەندی زەوییەکی رووتەن و لەبەر هەتاو هەڵقرچاو. پەرێزەکەمان زۆر لە دواوە بەجێ هێشتبوو، کێڵگەکانیش لەبەرامبەر هەتاودا دەسووتان و دەبرژان. لێرەو لەوێ تاکوتەرا دارو دەوەن هەبوون بەلام ئێمە لەبەر ئەوەی نەدەوێراین کات بەفیڕۆ بدەین، هیچ سوودمان لە سێبەرو سایە فێنکەکانیان وەرنەدەگرت. هەر چۆنێك بێت سێبەری ئەو دارو دەوەنانە هێندەیان فێنێك نەدەکردینەوە چونکە هەواکە تا بڵێی ووشك و برینگ بوو. پاشی سەعاتێك گوندێکمان لێ بەدەرکەوت ئیدی توانستی بەرگەگرتنی تێنوویێتیمان نەمابوو. گوێمان بەهیچ مەترسییان نەداو لەنزیکترین ماڵ داوای‌ساردا وی خۆوڵاتیمان کرد، دۆیان بۆ هێنایین بەلام تابڵێی بێزەوەرو بێزەبەستێن بوو. هەرچەندە زۆریش تێنوو بووین بەلام دوای هەر بێنێك پشوویێکمان دەدا بۆ ئەوەی بۆنە بێزەوەرەکەی کەم بکەینەوە.
دواجار گەیشتینە شوێنێك رووبارەکە پێچێکی توندی تێدا دەکردەوە. ئیدی یەك راست وبەربەیار بەرەو مووسڵ داکشاین. هەتاو هەورازتر هەڵکشاو چەندی چارەکە سەعاتێك رادەبرد بێزاریمان پتر دەبوو. دوو جار جۆگەی ئاومان دیتەوەو رامان کردە سەری‌و تێرمان لێ خواردنەوە. ئیدی کەس بێزار نەدەبوو ئایا تامی چۆنە یان ئایا پاکە.
ئەوەی ئێمە دەمانویست ئاو خواردنەوە بوو. هەرچەندە ئاو خواردنەوەی بێ ئەندازیش لەژێر گەرمای بەتینی هەتاودا شتێکی بە مەترسییەو ئەگر یەکێك زۆر ئاو بخواتەوە ئارەقە دەکاو تەنکە خوناوێکی سارد دەردا بۆ ئەوەی لەش لە گەرمای دەوروبەر بپارێزێ. ئەنجامیش ئەوەیە ئاوی لەش راستەوخۆ لە کورتی‌دەدا و تێنوویێتیش پتر دەبێ. ئیدی هەر ئاو دەخواتەوەو هەر ئارەقە دەکا تا دواجار لە ئەنجامی کەمبوونی خوێ برستی لەبەر دەبرێ‌و هەرەس دێنێ.
دوای تاوێك رۆیشتن هەڵوەستاین بۆئەوەی سەیرێکی چاکتری دەوروپشتمان بکەین.
ئێمە تاکە بیرێك گرتبوومانی: بگەینە مووسڵ، بەپردەکە بپەڕینەوەو بەرەو سایەو داڵدەی چیاو

چۆڵان بۆی دەرچین . چەند شووره و فرۆکەخانەیەکمان بڕی. شوانێك قسەی لەگەڵمان کرد، پاشان بۆ ئەوەی کەمتر بکەوینە بەرچاوان. دابەشی دوو کۆمەڵ بووین دەمەدەمی نیوەڕۆ هەستم کرد وا بڕستم لەبەر دەبڕێ و ئیدی هەنگاوم لەدووم نایەن.

بەئاستەم دەمتوانی بیربکەمەوە، ئەژنۆم دەلەرزی و خۆم لەسەر پێیان نەدەگرت . بیرو خەیاڵێك هەراسانی کردبووم. بیری ئەوەی ئیدی ناتوانم ڕێ بکەم. هاوڕێیانم ناتوانن پێمەوە ماندوو بن و لەگەڵ خۆیانم هەڵ بگرن. لەوانەیە چاوەخانوویێك لە ماڵێکی گوندێك بدۆزنەوەو لەوێم بەجێ بێڵن پێش ئەوەی کار لە کار بترازێ‌و کاتی گرنگ و پڕ بایەخیان لەدەست بچێ.

لەدواوە بەجێ مابـووم. کەس ئاگـای لەدەردەسەری و پەرێشانیم نەبوو. هەنگاوم بەئاستەم بۆ هەڵدەهات. دەمانچەکەم توند لەناو چنگم گرت. چڕە دەوەنێکی درکاوی لەو نزیکانە هەبوو. هات بەبـیرما: خۆزیا دەگەیشتمە لای ئەو دەوەنە. هەر هێندە سووکە دەنگێك لەوێ ترپەی دەهات و ئازارو ئەشکـەنجەی منیش کۆتا دەبوو. هاوڕێکانم دەتاسان. بەڵام دەیانتوانی لەپەنا دەوەنەکە بمنێژن و بەجێم بێڵن و هەر بەپەلە بەرەو پەناگەی چیایان بۆی دەرچن.

بەئاستەم دەمتوانی بیرێکی ڕووناك پێکەوە بنێم. تێ ڕادەمام پاشان ئەوانیتر چییان بەسەر دەهات. دەوەنە درکاوییەکە لە پشتمەوە بەجێ‌ماو هێزی پێم نەبوو بگەڕێمەوە سەری. بەلادا لەنگیم وکەڕو کوند چاوێکم بە دەورو بەردا گێڕا بۆ ئەوەی شوێنێکی نوێ بدۆزمەوەو

خۆمی بۆ پەلکێش بکەم و کۆتاییەك بەم ژیانە دژوارەم بێنم. بەڵام هیچم نەدۆزیەوە.

تەواو لە هاوڕێکـانم دابـڕابـووم. ئەوان لە پێشمەوە دیار بوون بەڵام بەیەکجاری ماڵئاواییم لێ کردبـوون. ئەگـەر ئەوان نەوەستانایەو سەیری دواوەیان نەکردایەو چاوەنۆڕم نەبوونایە، منیش تەکـانێکی ئازاردەرم نەدەدا بۆ ئەوەی بەخـۆدا بێمەوەو هەنگاو هەڵێنم. لەبەرچی بوو. لەوانەیە فریشتەیەکی چاك لە دوا ترووکە لە خۆکوشتنی دەرباز کردبم. یان تکاو بیرم بۆ ئەو دەستە پارێزەرە دەچێ کە ئەوەنـدە بەڕوونی لەنـاو فرۆکـەدا بە ئەزموونی خۆم بۆم دەرکەوتبوو. ئەدی ئەو کاتە نەپاڕامەوە «دەستم بگرەو ڕێم پیشاندە.»؟ ئێستا من فریای هەمان ئەو (هێز)ەم هەیە، هەرچەندە لە بارودۆخێکی جودا لەو بارودۆخەی کە جاری پێشوو چاوەنۆڕی بووم.

هەلی تریش لە ژیـانم هەڵکـەوتـووەو بە ئەزمـوون بۆم دەرکـەوتـووەو دەتوانم بەهێزو هۆکاری فریارەسیاز دابنێم. هەرچەندە هەنگینێ وێڵی دوای ئەو پرسیارە نەدەبووم ئایامانای ئەمە چییە.

ئەو جارەی ئەستـەمووڵ چۆن بوو؟ هەفتەیەکی بەشیێنەییم لەوێ لەگەڵ برادەرێك بەسەر بردو دەمانویست هێشتا گەلێك دیمەنی تری شارەکە ببینین . ئێوارەی پێنجشەم بوو، بلیتم بڕی بۆ ئەوەی هەینیی هەفتەی داهاتوو بە سواریی (ئینەبۆلوو) بچینە (سمیرنا). ئەو کەشتیە هەفتەی جارێك سەری لەوێ دەداو دەگەڕایەوە. نەخشەکەی خۆمم بە کەسوکاریشم لەماڵەوە ڕاگەیاند. لەناکاو سەبارەت بە هۆیەکی نادیار هەستێکی نالەبار دایگرتم و داوام لە برادەرەکەم کرد سبەینێ بەیانی لەگەڵم بێتە (سمیرنا). برادەرەکەم سەیرێکی کردم وەك ئەوەی بەشێتم تێ بگا. چونکە هەر چەنـدە بەڕاستی ئینەبۆلوو بەیانی بەڕێ دەردەکەوت بەڵام بلیتەکانی ئێمە بو هەفتەی داهاتوو برابوون و هەروەها هێشتا گەلێ شتی‌تر لە ئەستەمووڵ مابوون و دەمانویست بیان بینین. قسەی برادەرەکەمم سەلماندو هەستام چووم نووستم. بەڵام بەیانی زوو لەخەو ڕابووم و گوتم سەرەڕای

هەموو شتێك هەر دەبێ ئەمڕۆ بڕۆم.
بۆ ئەوەی دۆستـایەتیمان نەپچڕێت ، دۆستەکەم سەری هێنایە بەر. کاتێ گەیشتینە لەنگەر، بێ ئەژمـار گرفتمـان لەبارەی گۆڕینی بلیتەکانەوە بۆدروست بوو و کاتێ سەیرمان کرد زنجیرەکانی لەنگەر وا بەتەواوی کرانەوە بۆمان دەرکەوت تەنگەوتاویمان بێ سوودە. ئێمەیان بینی کە دەمانەوێ لە گەڵیان بڕۆین کەشتییەکە وەستاو چاوەنۆڕمان بوو تا سەرکەوتن. دوو ڕۆژ دواتر گەیشتینە سمیرنا. بەسەر زەوییەوە سەرمان لە ئیفیسووس و پێگراموس دا. کاتێ گەڕاینەوە سمیرنا برادەران پێیان گوتین کەوا ئینەبۆلوو لە گشتی هەینیی پاشتردا لە ۲۰۰ مەتر دووری لەنگەرگاوە ژێرو ئاو بووەو تەنیا ڕێبوارێك و دوو کەشتیوان دەرباز بوونە.
دەبێ لە فریشتە فریارەسەکەم بترازێ کێی‌تر ئەو ئێوارەیە دنەی دابم بۆ ئەوەی بەیانی زوو کۆچ بکـەم؟ بێ گومـان دایکـە کلۆڵەکـەشم لەماڵەوە هەواڵی ژێر ئاو کەوتی ئینەبۆلوو لە هەمان ئەو گەشتەیدا دەخوێنێتەوە کە من دامنابوو لەگەڵی بڕۆم و ئیدی لەو ساوەش چەندین هەفتەیە نامەی منی پێ نەگەیشتووە بۆیە یەکسەر وا زەند دەبات دەق ڕاستە من لە ئاودا خنکاوم و هەموو تکاو نزای ئەویش بۆ سەلامەتیی من بەبا ڕۆیشتووە.
ملی ڕێگام گرتبووە بەر. پەڵە هەورێکم بینی. بۆ ئێمەی ئەورووپایی ئەمە شتێکی نائاسایی تێدا نییـە. بەڵام لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا وەرزی هاوینان تاچاو برکات ئاسمانێکی پرشنگداری شینە. دیمەنی هەور وا لە پیاو دەکات لەخۆوە باران و ئاوی بێتە بیر. بێ گومان نەیدەکرد باران، بەڵام بیری «هـەور»، «باران» «سەرما» لە مێشکی ئێمەدا بە ختووکە کەوت و، دنەی داین پێدا پێداتەکانی بەرەو پێشتر بدەین.
تووشی هیچ ئاوێك نەهاتین. ئەوەندە نەمابوو گەرما پیاو شێت و شوور بکات ، بەڵام هەوری تاین هەر لەوێ لەشوێنی خۆی بوو و چاوی هیوای ئێمەی تێ گیرابوو.
پاشی نیوەڕۆ خۆمان لەسەر ڕێگای بەرەو مووسڵ دۆزیەوە. دوای تاوێك پاسێك گەیشتە لامان. پڕە پاس بەخـۆیەو پەنجـەرەی تێکشکاویەوە لەترێ‌دەداو گرمەو ناڵەی لێ هەڵدەستا. هێندە پڕ بوو مۆنجـەی دەهات. خەڵك خۆیان بەسەر لیسەکانی ئەم دیوو و ئەو دیووەوە هەڵپەساردبوو. سەر پشتیشی پڕ بوو لەو سەبـەتەو پرێسکانەی دەیانبردنە شار. بەڵام بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هیچ پاسێك ئەوەندە پڕ نییە ڕێبوارێکی زێدە نەتوانێ خۆی تێوە بترنجێنێ. دەستمان بۆی هەڵشەقاند. پاسە بۆر وەستاو ئێمەش پێیدا هەڵگەڕاینە سەرەوەی. پاسەکە دەچووە مووسڵ بەڵام نیازی ئێمە ئەوە بوو پێش ئەوەی بگاتە مووسڵ دابەزین.
لەخۆشیانە شاگەشگە بووین کاتێ سەبەتەیەکی پڕاوپڕ هەڵووژەی تەڕو ئاودارمان لە تەنیشتی خۆماندا بینی. سەرەتا هەریەکەو هەڵووژیەکمان هەڵگرت. پاشان یەکێکی ترو یەکێکی تر، تا ئەوەی ئەو سەبەتە گەورەو گرانە چەند دانەمیوەیەکی کەمی لەبندا مایەوە. بریا چەند پارچە زێڕێکمان لەو سەبەتەیە بەجێ بهێشتایە! خودا ئاگادارە پارەمان زۆر بوو. تا ئەمڕۆش دڵم نارەحەتە سەبارەت بەو پارەی نەدانەمان. شنەبایەکی فێنێك لەسەر پشتی پاسەکە لێی دەداین و، کەیفمان زۆر لەمگێز بوو ئەگەر ئەو گەشتە ۳۰ کیلۆمەترییە وازوو تەواو نەبوایە. ئێمە بۆ وەستانی پاسەکە لەسەر ئاگر بووین. لەسەر ئەو لوتکەیە، دەستە پارچەو بێ دەستەڵات هەڵکورمابووین تا چەند کەسێك هاتن

ئێمەیان داگرتە خوارەوە.
ئەوە بوو پاسەکە لەبەر ئەو پردەی سەر دیجلەدا وەستا کە دەچووە ناو مووسڵەوە. ڕێك لەبەردەم مەڵبەندێکی پۆلیس. هەموو ڕێبوارێکی نوێهاتوویان لەوێ دەپشکنی. نەدەتوانرا خۆ لە پشکنین بدزینەوە، چونکە ڕێبوارەکان یەکە یەکە بەجودا دەپشکنران. بەڵام ڕەمزی ئیسپاتی کرد کە دەتوانێ لەگەڵ ئەم هەلومەرجەشدا خۆ بنوێنێ. چاوی لە پۆلیسك داگرت و سەرنجێکی فێڵبازانەی دایێ. پۆلیسەکە پاش ئەوەی ڕێبوارەکانی تری بەرێ کرد یەکسەر هاتە لای ڕەمزی. لە ڕۆژهەڵاتی ناوەراست شتێکی ئاساییە پۆلیس بێتە لاتەوە ئەگەر سەرنجێکی بە مەبەستی بدەیتێ. پۆلیسی ئەوێ بەلەنگازن و دەیانەوێ بژین.

پێویستی زۆر گەورەیان بە چەند قرۆشێکی لە لاوە هاتوو هەیە. ئیدی ئەوە بوو بە بەرتیل ـ کە شتێکی نارەوای هەموو جۆرە کۆمەڵێکە، دەزباز بووین. بەڵام لە ڕۆژهەڵات بەرتیل وەرگرتن بە عەیب ناگیرێ. ڕێگایەکی عادەتیانەی ڕاییکردنی کاروبارەو بەشتێکی خواسایی دادەنرێ و بێ گومان ڕەمزیش چۆن غەمی خۆی بوو ئاوەهاش غەمی ئێمەی بوو.
بە پەلە لە هەمان بەری پردەکە و لەسووچێکی قاوەخانەیەك بەبێ چاوەچاو کردن و خۆ دەرخستن دانیشتین. هاتوچوکەر زۆر بوون بەڵام سەرنجی هیچ کەسیان نەدەدا. ڕەمزی فێڵبازێکی زمانلووس بوو و پێش تاوێك پۆلیسێکی تەفرە دابوو. بێ گومان نەدەکرا ڕەهوراست پێی بڵێ ئێمە کێین، لەبەر ئەوە چیرۆکێکی بۆ خۆی هەڵبەستا بوو. گوتبووی ئێمە خوڵامکارەی ئەوین و، ڕەمزی ئێمەی لە سنووری ئێران بە شێوەیەکی نایاسایی و بەبێ ئەوەی ڕوخسەتی کۆچکردنمانی هەبوو بێ ئاودیوو کردووە. پۆلیسە کە بەرتیلی خۆی وەرگرت ڕێگەی ڕۆیشتنی داین.
هەرزوو ئێوارە داهات و، بێ گومان ئێمەش زۆر کەشەنگ و ماندوو بووین. جارێکی تریش لە قاوەخانەیەك دانیشتینەوەو پیاڵە لەسەر پیاڵە چامان خواردەوە. چا فەرامۆشیدەر بوو و گیانمانی دەبووژاندەوە. کاتێ بەرەبەرە چرا دەرکەوتن و شەو داهات ئێمە بیرمان لەباری ناهەمواری خۆمان کردەوە. ئەمە ئەو شارەبوو دوێنێ شەو کۆندۆرەکەمان سووری لەسەر دەدا. ئێستاش وا لێرە لەناو کوردان وەکو کورد دانیشتووین و دەتوانین تاوێك باری ناهەمواری خۆمان لەبیر ببەینەوە.
بنکەیەکی پشکنینی پۆلیس لە ناوەراستی پردەکە هەبوو و هەر کەسێکی نیازی چوونە ناو شاری هەبووایە پێناسەی لێ وەردەگیراو پرسیاری لێ دەکرا. ئێمە پێناسەمان هەبوو بەڵام پێناسەی درۆ. تەنیا ڕەمزی لەم بارەدا دەیتوانی وەڵامی پرسیاران بداتەوە.کوردییەکەی ئێمە زۆرچاکی پێوە دیار بوو ئێمە بێگانەین.
ئەو دەمە ئێمە لە دەرەوەی گۆڕەپانی مەترسیی ڕاستەوخۆدا بووین و، دەمانویست پێش ئەوەی هەنگاوی تر هەڵێنین چەندی بۆمان بکرێ چاکتر بارودۆخەکە تاوتوێ بکەین. شەومان لەسەربانی خانێك بەسەر بردو بۆ بەیانی کاتێ لەخەو ڕابووین ـ هەرچەندە زۆریش شل و شەکەت بووین. بەڵام ، بە وورەیەکی نوێوە ئامادەی بەرەنگار بوونی ئەو ڕۆژە بووین. جودایی ڕۆژهەڵات بریتیە لە گەرمای لە کێش بەدەری ڕۆژ کە بەرگە گرتن لە دەرەوەی ماڵ شتێکی دژوارە، لەگەڵ سەرمای فێنکی شەوانی دەرەوە کە چەند پیاڵە چایەکی بەلەزەت وات لێ دەکات هەست بکەیت تین و تاوی

لەبەرچووت بۆ گەڕاوەتەوە.
ڕەمــزی گوتی:« ئێــوە ناتوانن بەسەر پردەکەدا بپەڕنەوە. پشکنینەکەی زۆر توندو تیژەو پۆلیس پرسیار لە یەکە یەکەی خۆتان دەکات.»
ڕەمزی پشنیازی ئەوەی کرد بەتەنیا خۆی بچێتە ناو شارو بەدوای خزمەکەیدا بگەڕێ بەڵکو بتوانێ بمانشارێتەوە. کاتێ ئەو قسەی دەکرد من سەیرێکی ئەوبەری ڕووبارەکەم کرد. بیرم کردەوە، ئایا دەکرێ بەمەلە بپەڕینەوە؟ ڕەمزی بیری منی خوێندەوە، «گوتی: لەوانەیە بەمەلە پەڕینەوە لە شەو بێ، چونکە ئەو کاتە ناکەوینە بەر چاوان.»
«باشە ڕەمزی خوا حافیزت بێت. ئێمە لێرە چاوەنۆڕت دەبین.» ڕووومان کردە کۆنە چایەخانەیەکی سەر ئەو شەقــامــەی بەرەو پردەکە دەچوو. چووین بەبێباکی لەوێ دانیشتین. بیرم کردەوە ئایا کابــرای خاوەن چایــەخــانە سۆسەی هیچ شتێکی لە ئێمەدا نەکردووە؟ ئێمە بەبێ ڕەمزی زۆر سەغڵەت بووین. سەرەرای هەموو بێباکییەکمان دەتگوت لەسەر پشکۆی ئاگر دانیشتووین.
ئاپۆرەیەکی گەورەی هاتوچۆکەران بەبەردەمی ئێمەدا ڕادەبورد: گوێدرێژ بە بارەوە، کوردی ئەسپ سوار، پیــادە شتــومــەکی خۆیــان بۆ بازێر دەبرد. ژمارەیەکی فرەی ئۆتۆمۆبیلیش تێکەڵی ئەوان دەبــوون. زۆربــەیان ئۆتۆمۆبیلی سوپایی بوون. چاوێك لە خەفیەیی‌دا مەشقی کردبێ هەمیشە بەئــاگــایــەو چاوەچاویەتی هەموو ئەو وورده زانیارییانە هەڵبژێرێ کە پێوەندییەکی پتەویان بە سوپاوە هەیە. ئەگەر هاوەڵانم لە نیشتمان دەزانن ئێرە چ سەربازێکی لێیەو ژمارەیان چەندە ئەو کاتە دەتوانن بڕیارێکی گونجاو دەربارەی ئەو ڕاپۆرتە دژ بەیەکانە بدەن کە ئێستا دەگاتە دەستیان و هەموو جۆرە نەخشەیەکی ستراتیژی بەلاوە دەنێ.
هەروا بۆ بابەتی هێڵە نوێیەکەی شەمەندەفەریش گوایە لە نێوانی بەغداو باکوور کێشراوە. پاشی چەند ڕۆژێك بۆمان دەرکەوت کە ئەم هێڵە نەك هەر دانەمەزراوەو خەریکی دامەزراندنی نین، بگرە هەروەها تا ئێستا نەخشەشی بۆ نەکێشراوە.
پێداپێدا زانیاریی بەدرۆ لەلایەن ئەو دەسکیسانەی کە بەڕاستی لە پێناوی دوژمن کاریان دەکرد، دەدرایە ئەڵمانیا. ئەگەر بەپێی نەخشەی خۆمان هەڵبدرایەنایە سەر زەوی ئەوا لەهەمان ئێوارەدا زانیاریی بەنرخم لەم بارەیەوە بە نیشتمان ڕادەگەیاند.
دوای ساتــەوەختێــك ڕەمزی گەڕایەوە. ئاماژەی داین و ئێمەش بەدوای کەوتین. بە چرپەیەکەوە گووتی: پێویستە لێرە بڕۆین . لە گەڵ خزمەکەمدا قسەم کرد .مووسڵ پڕیەتی لە کارمەندی سوپایی ئەمەریکاو ئینگلیز و سەرتاپای خەڵکی ئەم شارە یان خەفیەن یان دەمڕاستی ئەوانن.
گوتمان «ئەدی بنکەی پشکنینی  سەر پردەکە؟»
«چۆنم پێشبینی کرد بوو ئاوەها بوو. هەموو کەسێك بە دوودڵی و گومانەوە ڕەفتاری لەگەڵ دەکرێ. بەووردی پرسیار لە هەموو ڕێبوارێك دەکرێت. ئەگەر پێویستیش بە لێتۆژینەوەی پتر بکات ئەوا دەسبەسەر دەکرێت.»
«دانیشتوان بە ئێمەیان زانیووە؟»
گوتی:«نەك هەر ئەوان بگرە سەرانسەری عێراق لە ئێمە خرۆشاوە. بەیت و باڵۆرەو ووتواتێکی لە سنوور بەدەر دەربارەمان هەڵبەستراوەو سەرتاپای ووڵاتی گرتۆتەوە. خزمەکەم پێی گوتم جاری

نرخێکی گەورەیـان بۆ سەری هەریـەکێـك لە ئێمە داوە. داوایان لەتێکرای دانیشتوان کردووە بەشداری لەو پشکنینە بکەن کە بۆ ئێمە دەست پێ کراوە.»
لەدڵی خۆم گوتم: خۆزیا ئەوەندەمان پێ دەکرا ملی خۆمان لەپەتی سێداره دەرباز بکەین.
نزیکەی ٥٠ کیلۆمەتر لە ژووروی دیجلەدا دەرمەتانی پەڕینەوە لە رووبارەکە هەیە. لەوێش پۆلیس هەیە، بەڵام دەبوو ڕێگایەك بدۆزینەوە بۆ ئەوەی بەدزیی چاوانەوە دەرباز ببین. ئەوە بوو ڕۆیشتنی چەند ڕۆژێکی تریشمان لەبەر هەتاوی کرگرتوودا دەکەوتەوە پێش.
وە دەرکـەوتـین دوور بە دووری ڕێگـا دەڕێشتـین. پاش ئەوەی نیو سەعاتێك تێپەڕی، چەند ماشێنێکی بارهـەڵگری سوپایی لە تەنیشتمانەوە دەرکەوتن. پێش ئەوەی ماشینەکان بووەستن سەربازی چەك بەدەست خۆیان هەڵدایە سەر زەوی. چوار دەوری ئێمەیان گرت. دڵم بە تەپوکوت کەوت. گوتم ئیتر هەموو شتێك تەواو.

بەڵام هەندێك جار لە هەلومەرجی ئاوەهایی، ساتمەی وا گەورە کروکپمان دەکات وبوامان لێ دەکات خۆمان نەبان بکەین. ئێمە لە ڕۆیشتنی خۆمان بەردەوام بووین بێ ئەوەی هەنگاومان گورج یان شل بکـەین. بۆ بەخت چاکیمـان هیـچ شتێـك رووی نەدا. ئەمە گاڵتەو جەفەنگێکی لەناکاوی چارەنووس بوو. ئەوەی ئێمە لێی بەهەڵەدا چوو بووین تەنیا مەشقێکی سوپایی بوو و هیچی تر. ئایـا ئێمــە لە ترسـانــە خۆمـان وێك هێنابووەوە؟ یان سەرنجی کەسمان بۆ تەنگەتاویی خۆمان ڕاکێشـابوو؟ ئەم جۆرە بیرو دڵەڕاوکانە زۆری هەراسان دەکردین.
ئەو ڕۆژەش وەك ڕۆژانی تر گەرم بوو و ئێمەش دەردو ئازارێکی زۆرمان چێشت.
بەڵام کاتێ دەهـاتـەوە بیرمـان ئەوا سەرمـان لە دوو نراوە، هەنگـاومـان گورجتر دەکرد. ئێمە نەماندەویست هەموو ئەو کۆششەمان بە فیڕۆ بچێت. دەمزانی ئەو کاتە چەند تینوو بووین پاش نیوەڕۆ بوو بەلای گۆماوێکی سەروزباودا تێپەڕیین، جۆگەلەیەکی بچووکی تێوە دەرژاو هاڵاوی بۆگەنێکی بێزەوەری لێ هەڵدەستا، بەڵام لە هەمووی ناخۆشتر ئەوە بوو پشکڵی ئەو مەڕو ماڵاتەی سەد مەترێك لە دووری ئەو ناوە دەلەوەڕان، دەهاتە ناو گۆماوەکەوە. دانەوینە سەرچۆکان ئاومان بەسەری خۆمان داکرد و تێرمان لێ خواردەوە. ئێمە هەر ئەوەندەمان دەویست تا تینوتیمان دەشکێ ئاو بخۆینەوە.
بەڵام ئەمــە شتێکی بە مەتـرسی بوو. ئەگـەر لەسەر ئەو ڕێبازە بەردەوام بووینایە ئەوا بەدەس دیزانتری و سێبەرۆ یان کۆلێراوە دەمردین. ئەو دەمنکە حەبانەی ئاو پاڵاوتن کە دوێنێ بەیانی ـ بەپێ ئامـۆژگـاریی بەدەم خۆ بۆ ڕۆیشتن ئامـادەکـردنــەوەی یەکێکی تیپـەکەمان، لەگەڵ خۆمانمان هەڵگرتبوو، خەریك بوو تەواو دەبوو. بەکورتی دەبوو بەسەر ترس و دڵەڕاوکەی پێوەندی بە خەڵکەوە کردندا زاڵ ببین.
ئەو چەنـد ڕەشماڵەی ڕەوەندان کە لەو نزیکانە هەڵدرابوون بەلای ئێمەوە چاکترین شت بوون، ڕەشماڵەکان دوور و نزیکی ڕێگاکە بوون. پێ نەدەچوو هێشتا وتوواتی لەمەر ئەڵمانە هەڵاتووەکان گەیشتبێتـە ئەوان. ڕوومـان لەوێ کرد. ئەمجـارەش ڕەمزی بەزمانزانینی خۆی نەیهێشت هیچ گومانێك سەرهەڵبداو، خواردنەوەیەکی پیاوانەشی بۆ وەرگرتین.

ڕەمـــزی کاتێ گەیشتـــە بەر دەرگـــای ڕەشمـــاڵەکـــە دەنگی هەڵبـــڕی «ســـەلامـــو عەلێکـــوم» «عەلێکومەسەلام!» یەکێك لە ژوورەوە وەڵامی دایەوە. پیرەژنێك هاتە دەرەوە. دیار بوو لە ژوورەوە لەبـــەر سێبەر ڕاکشابوو. ڕەمزی بە خولکی پیرەژن لەبەر سێبەری ڕەشماڵەکە ڕۆنیشت. ئێمەش دوور بە دووری هەڵکونجاین.

ڕەمزی گوتی: «خودا تەمەنت درێژ بکات، دایە،»

پیرەژن وەڵامی داوە: «چەند ڕۆژێکی کەمم ماوە، ئەفەندی»

ڕەمزی گوتی: «خوا دەس بەتەمەنتەوە بگرێ،»

گوتی: «تێنووتە، ئەفەندی؟» چوو هەندێك دۆبێنێ

«ڕۆژی خوا بۆ چاکەی زەوییە!» ڕەمزی گوتی.

«بەڵام بۆ ئەوانەی بەرێوەن چاك نییە،» پیرەژن وەڵامی دایەوە.

پیرەژن بە خۆو بە دەفرێکی گەورەوی (دۆ)وە گەڕایەوە. دۆیەکەمان بە نۆرە خواردەوە (بێ گومان ڕەمزی یە فدندی‌یەکەمجارد‌ەیخواردەوە) تا چۆڕمان لێی بڕێ. ئەوشتەی دوێنێ لووتمان لێ لادەدا ئەمـــڕۆ بەلامـــانـــەوە زۆر بەتـــام بوو. پاشـــان هەستاینەوەو ڕەمزی پارەیەکی خستە ناو دەستی پیرەژنەوە. بەرێ کەوتین وپیرەژن لە دوامانەوە گوتی:

«یاخوا ڕێگاتان خۆش بێ و، دوورە بەلا بن،» نزایەکی چاکە، هەموومان گوتمان، تارادەیەك بەگوڕو تینتر ملی ڕێگامان گرتەوە بەر.

بەر بەری ئێوارە گەیشتینە گوندێکی بچووك، گوندەکە کەمێك لە شارێیەکەوە دوور بوو. لە کەش و هەوای ئاوەها پیاو ناتوانێ شەو وڕۆژ لەسەریەك بەڕێگاوە بێت. دەبوو لە شوێنێك پشوو بدەین. هەروەهـــا بە گوێـــرەی بەرفـــراوانی دەشت ودەرو دووریی ڕێگـــاوبـــان ڕۆیشتنی بە پێیـــان زۆر درێژەکێش بوو، لەبەر ئەوە بیرمان لەوە دەکردەوە بەڵکو یەکێکی بە متمانەمان بۆ هەڵکەوێ‌و چەند ئەسپێکمان بۆ پەیدا بکات. کات بە پەلە بەسەر دەچوو و ئێمەش دەمانویست تازووە لەدەست دەربچین و بگەینە شوێنێکی هێمن و دوورە دەست.

ڕەمزی بۆی دەرکەوت، پیرەمێردێك کە ئێمە میوانی بووین باوکی دەناسیو ئەوە بوو وای لە کابرا کرد متمانەی پێ بکاو بەڵێنی لێ وەربگرێ چەند ئەسپێکمان بۆپەیدا بکا. ئیدی دەمانتوانی ئەو شەوە ڕێگایەکی دوورو درێژ ببڕین و بۆ بەیانی بگەینە سەر ئەو ڕووبارەی مەبەستمان بوو. پیرەمێرد کرێی خۆی وەرگرت، کە بینی ئەو شتەی پێویستە هەمانە لێیدا بچێ ئەسپ پەیدا بکا. لەو دەمەدا ئێمە نووستین. کاتێ بە ئاگای هێنایین مانگەشەوێکی ڕووناك بوو. لەخەو هەستاین، تەواو ووشیار بووینەوەو خۆمان بۆ ڕۆیشتن ئامادە کرد.

سێ ئەسپیان بۆ هێنا بووین. سێ ئەسپی لەڕو لاوازی پێست بەسەر ئێسکەوە نووساو، گومانی تێدا نەبوو تەنیا بە پووش و پەڵۆشە ئالیك درابوون. بەڵام ئێمە چارمان ناچار بوو. سوار بووین، دەبوو یەکێك لە وولاغەکان دوو کەسمان هەڵگرێ. بەڵەدەکەمان لە پێشەوە سواری ئەسپێك بوو بوو. کابرایەکی تەمەن مامناوەندی، ڕوویێکی گرژو مۆنی سەیری هەبوو، جووتە چاوێکی نامۆ بەڕوویەوە دەبریسکانەوە. کەسمان پێی خۆش نەبوو خۆی بداتە دەست ئەو چەکدارە کێوی و ئەشقیایە بەڵام کابرای پیرەمێرد دڵنیای کردین کە پیاوێکی دۆستە و بە ئاسانی دەمانگەیێنێتە جێ‌مەستمان.

دەبوو نرخی هەموو شتێکمان پێشـدەست بدایە. ئەوجا بە هەنگاوی بە ئەسپاییو سلۆك گوندەکەمان بەجێ هێشت و ملمان لە شەوی دڕ و تووش نا. حەزمان دەکرد پێ هەڵگرین و بەپەلەتر برۆین بەڵام ئەسپەکان ملیان نەدەدا. سات لە دوای سات رابردن و هێندەی نەخایاند نیوەی رێگامان بەبێ رووداني هیچ شتێك بری. بەڵەدەکەمان کرو بێدەنگ لە بەراییەوە دەڕۆیشت. رەمزی ووریا بوو نەبادا لە ووتوویژی لەگەڵ کابرادا شتێکی لەدەم بترازێ. کاتێ بەیان ئەنگووت کەیفمان هاتەوە بەر. تێ فکرین ئیدی ناکرێ پتر پشت بەم بەڵەدە دڕدۆنگە ببەستین.. هیچ نەبوایە دەبوو بزانین کابرا بەرەو کوێمان دەبات.

گوندێك کەوتە پێشمان و ویستمان تاوێکی تێدا پشوو بدەین و ئەسپەکانیشمان ئالیك و ئاو بدەین. هەروەها تەواوێکیش گەرم داهاتبوو، لە سێبەری خانوویێك لامان دا. رەمزی نان و ئاوی بۆ وەرگرتین و ئەسپەکانیشمان بەردایە سەر ئاو. نیو سەعاتێك رابرد بێ ئەوەی هیچ نیشانەیەکی گەڕانەوەی ئەسپەکان دەربکەوێ، ئێمە تەنگە تاو بووین، رەمزی چوو بیانگرێتەوە. پاشی چەند دەقیقەیەك گەڕایەوە، ئاگر لە چاویەوە دەباری.

گوتی: «دەزانن خەڵکی گوند چییان پێ گوتم،»

زانیمان شتێکی نالەبار روویداوە چونکە چ جاران رەمزیمان بەم تووڕەییە نەبینیوو.

«کابرا سوار بووەو بەخۆو هەموو ئەسپەکانەوە بەرەو مووسڵ ڕۆیشتووە.»

کەواتە ئەمە فێڵ وتەڵەکە بوو! کابرا پێش هەمو شتێك پارەی خۆی وەرگرت، ئەوجا ئێمەی هێنایە ناوچەیەکی تەواو چۆڵ ودوور لە هات وچۆ. لێرەوە دەربازبوونمان بە ٢٤ سەعاتیش لە تواناندا نەبوو. وێڕای ئەمەش کابرا یەکسەر بەرەو مووسڵ هەیپای لێ کردووە بۆ ئەوەی لە بریتی سی پارچە زیوو بازرگانیمان پێوە بکا. هێندە نابا تێکرای خەڵك دەکەونە دووامان و پێش ئەوەی لە دەست دەرچین بەدیلمان دەگرن.

دۆشدامان و بێ هیوایی چ سوودیان نەبوو. دەبوو بەخۆ کەوین. چی بکەین؟ پێشی هەموو شتێك دەبوو لە گوند وەدەرکەوین. بە پێیان دەرچووین وپاشی سەعاتێك هاتینە کوێرەدێیەك، بریتی بوو لە کۆمەڵە رنجێکی لەگڵ دروستکراو.

ئافرەتێك لەسەر بیرێك کاری دەکرد، کچە کۆچەرییەکی باریکەڵەی شۆخ وشەنگ! رەمزی داوا ئاوی لێ کرد. ئەویش گۆزەیەکی دایە دەستمان، تا تێر بووین خواردمانەوە. بیراوێکی پاك نەبوو بگرە شینکاوێکی لیتە بوو، بەڵام هیچ نەبێ لە ئاوە تێکەڵ بە پشکڵەکەی دوێنێ چێتر بوو.

ئافرەتەکە خولکی ماڵەوەی کردین بۆ ئەوەی سووکە نانێك بخوین، رەمزیش داوایەکەی قەبوڵ کرد. میوانداریی رۆژهەڵاتی ناوەراست شتێکی چەند سەرسوڕهێنە! چەندین جارم بە چاوی خۆم دیووەو شتێکی چەند خۆشە پیاو خواردن خواردنەوەی بەبێ هیچ مەبەستێك بدرێتی و، چاوەنۆڕیی وەرگرتنی هیچ پاداشتێکی لە بریتیدا نەکرێ. بگرە هەر تەنیا لەپێناوی میوانداری و نانبدەییدا دەکرێ. مێردەکەی لە ژوورەوە بوو، پیرە کۆچەرییەکی چوارشانە، رەنگ و رووی چرچ و لۆچداری بە وێنەی قاوە هەڵقرچا بوو، بەڵام چاوەکانی بەزەیی و چاکەیان دەنواند. هەندێ لە کورکانیشی لەوێ بوون، یەك لە یەك بەخۆوەتر و بە سەروسەمەرتر. چایان لە پێشمان دانا، نانیان بۆ هێناین. بەجێیان هێشتین بە ئارەزووی خۆمان پشوو بدەین. پیرەمێرد خۆی لە

سووچێك وەستا بوو، دەست لەسەر سینگ، چی شتێكمان بوێ بۆمان جێ بەجێ بكا.
رەمزی هەر زوو سەری وتووێژی لەگەڵ پیرەمێرد دامەزراند.
گوتی: «باوەگیان، دەمانەوێ لەزێ بپەرینەوە»
«زێ زۆر دووره ئەفەندی،» پیرەمێرد وەڵامی دایەوە. ووچانێك بێدەنگ بوو، پاشان گوتی:
«ئەفەندی ماڵ ماڵی خۆتە. لەگەڵ دەستوپێوەندانت لێرە بمێنەوە تا تینی گەرما دەشكێ ئەوجا وورده وورده بدەنەوە رێ»
رەمزی گوتی: «باوە، چی لەو كابرایە دەكەی ئەگەر ئەسپ لێ بەكرێ گرت و پاشان بە بیانگەی ئەوەی دەچێ ئەسپەكانی ئاو دەدا، لەكاتی هەرە پێویست وڵا چاری بەجێت بهێڵێ؟»

پیرەمێرد نەرمەبزەیەكی‌هاتێ و شەویلاگەی تا نزیك مناگوێ كرایەوە:
«خودام شایەدبێ، دەردێكی ئەو تۆی دەدەمێ تاماوە لەبیری نەچێتەوە.»
رەمزی گوتی: «راست دەكەی باوە، بەڵام پێش ئەوەی ئێمە بە خۆمان رابگەین كابرا قووچاندی. چی‌بكەین؟ سەری لەدوو بنێین بۆ ئەوەی بیگرین و سزا بدەین یان بەرەو زێ بڕۆین؟»
كۆچەرییەكە پێكەنی وگوتی: «من یارمەتیتان دەدەم ئەفەندی. دوو گوێدرێژم هەیە دەتوانن بەنۆرە سواری پشتیان بن. بەڵام دەبێ بەردەوام پەكێكتان بە پێ بڕوات.»
«ئەی خۆت، باوە؟» رەمزی پرسیاری كرد.
پیرەمێرد خۆی هەڵكێشاو بە برێك بێزارییەوە گوتی:
« چما كۆچەر هەمیشە بە سواریی دەڕۆن؟»

جارێكی تریش بەشێوەیەكی دۆستانە دەست لەسەر سنگ نوشتایەوە. رێزە چایەكی تری هێناو چووە دەرەوە گوێدرێژەكان بێنێ. گەرایەوەو، وەك لێرە باوە كوندەیەكی پڕ ئاو كردو لەسەر پشتی یەكێك لە گوێدرێژەكانی دانا. دەبوو زۆر ئاگاداری ئەو ئاوە بەنرخە بین. بەڵام ئاوەكە بەشی ئەوەی دەكرد هەموو ناو بە ناوێك دەم وگەروومانی پێ تەر بكەینەوە.
پێش ئەوەی بەرێ بكەوین، رەمزی ویستی پێشدەست كرێی بداتێ، بەڵام كابرای كۆچەریی چاوبڵند رەتی كردەوە.
گوتی: «كە گەیشتینە جێ ئەو كاتە بیدە.»
دەبوو ئێستا بەسەر بانێكی تەواو رووتەنەوە بڕۆین و پاشان لەناكاو بەرەو نەورابییەكەی دۆڵی دیجلە نشێو بینەوە. هەتاو وەك جاران بێ بەزەییانە نەڵێی دەدایین. بەڵام ترسی ئەوەی نەبادا لەپشتەوە زەبرێكمان لێ بدەن نەیهێشت تروكەیەك چییە ووچان بدەین. ئەو رۆژە بۆ رەمزی رۆژێكی ناسك و بەمەترسی بوو. لە بەرودوایی هاتنی كۆرەوی ئەوێ رۆژێ رەمزی بەهۆی تیشكی گەرمی هەتاو ئەوەندەی نەما بوو لە پەلوپۆ بكەوێ. شانازیمان بەوە هات تەواوی بەشە ئاوەكەی خۆمان دەرخواردی ئەو بدەین. رەمزی بە چاوی كزو ماتەوە سواری گوێدرێژەكە بوو، یا چاتر بڵێین بە شەكەتییەوە خۆی لەسەر پشتی گیر كرد. ئەوجا دەمی بە كوندەكەوە نا تا تێری لێ خواردەوە. كاتێ گەیشتینە سەر زێ بە جۆرێك هێزمان لەبەر برابوو كە لەسەر زگ راكشاین و وەك مەرو ماڵات

بینمان بە ئاوەکەوە نا. پارەی کابرای کۆچەرمان دا و بەخۆی وگوێدرێژیەوە بەرەومال گەڕایەوە.
پاشان بۆ ماوەی دەمەساتێك لەسێبەری داروەدەومن پاڵ کەوتین وخەوەنووچکە بردمانیەوە.
ڕێژەنی رووبارەکەی پێشمان وورەی هێنایەوە بەرمان. لە پەنایەکەی خۆمانەوە بارو دۆخەکەمان تاو توێ کرد. تەوژمەکە توند بوو، هەروەها رووبارەکە نزیکەی ۲۰۰ مەترێکیش بەرین دەبوو. ئەگەر چارمان ناچار بێ دەتوانین بە شەو خۆمانی لێ دەین.
لەو بەرەوە، رێك لەسەر لێواری رووبارەکە گوندێکی پازدە بیست ماڵی هەبوو. لە چەپی گوندەکە باڵەخانەیەکی بەرینی سپی هەبوو، هەباو نەبا. ئەمە مەڵبەندی پۆلیس بوو. هەر نیو سەعات جارێك کەڵەکێك دەپەڕیەوە، بەڵام لەبەر تەنکاوی ناو رووبارەکەو لێوارە پڕ بەردەکانی، کەڵەکەکە نەیدەتوانی تا سەر لێوی رووبارەکە بێت. ئیدی دەبوو پێت پەتی بکەیت و شەرواڵت هەڵکێشی و ئەویتری بەخۆی بڕۆی. دەبوو دەستی یەکتر بگرن و، کەڵەکوانەکەش رێی نیشان دەدان و هەموانی بە تەنکاوترین شوێن رەوانە دەکرد. کاتێ دەگەیشتنە سەر کەنارەکە، پۆلیسێك هەبوو هاتو چۆکەرانی دەپشکنی. تەنیا لەم باری پشکنینەدا پۆلیسەکە بەچاو دەبینرا.
هێزی داهێنانی رەمزی لە برانەوە نەدەهات. بەپێی تێگەیشتنی زگماکی خۆی لەبارەی دەروون ناسینی خەڵکی وڵاتەکەیەوە دەسبەجێ نەخشەیەکی کێشا، کاتێ کەڵەکەکە گەیشتە جێ، رێبوارە وەستاوەکان سوار بوون و کەڵەکەکە کشایەوە ناو تەوژمەکە، رەمزی باڵی هەڵتەکاند وهاواری کرد ئێمەش دەمانەوێ سوار بین، بەڵام کابرای کەڵەکوان بۆی نەکرا جارێکی تر بگەڕێتەوەو لەنگەر بگرێ، رەمزی بە دوای کابراوە دەستی بە هەراو هەنگامە کرد.
«کورە بگەڕێوە ئێرە هۆی نامەردی گەورە! بۆ پێت وایە هەموو ئەمڕۆ لە چاوەنۆری تۆ دادەنیشین!».
گوتی: «زۆر باشە. زوو دێمەوەو کاروانێکی سەربەخۆتان بۆ دەکەم، بەڵام زۆری تێ دەچێ.»

رەمزی بە تووڕەییەکی فێڵبازانەوە نەراندی: چۆن تەڵەکەبازێکە! چۆن دەسبرێکە! خۆ هەمووتان گوێتان لێ بوو؟ کابرایەکی ئەوەندە بێ دەسەڵاتە پێی.ناکرێ جارێکی تر کەڵەکەکەی ببەستێتەوەو پارەشی لێم دەوێت. بۆم بووەستە تا دەگەڕێیەوە ئێرە کابرا! ئەوجا تێت دەگەیەنم لەگەڵ کێ قسان دەکەی!
ئەو کاتە کەڵەکەکە خەریك بوو لە زێیەکە دەپەڕیەوە، کابرای کەڵەکوان نەیدەتوانی وەڵام بداتەوە. دەستی رێبوارەکانی گرت و بەرەو کەناری بردن و گەڕایەوە. پیاو راست بڵێ زوو هاتەوە. ئێمە سوار بووین. رەمـزی وەکو پاتشایەك بەوپەڕی دردۆنگییەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ کابرا کرد. بۆ ئەوەی ئاشکرا بزاندرێ ها ئەوەتا لەگەڵ سێ دەست و پێوەندان بەرێوەیە. ئێمە هەرسێ دەست وپێوەند پێکەوە بە مات ومەلوولی هەڵکورمابووین و وورتەمان لێوە نەدەهات، وەك بڵێی تاکە خواستیمان لە ژیـان ئەوە بێ بەو پەڕی رووخـۆشی فەرمان لە ئاغامان وەرگرین و جێ بەجێی بکەین. کابرای کەڵەکوان بە بێدەنگی دەستی رێزی بەسنگەوە ناو هەموو پرسیارێکی زۆر بەشەرم ورێزەوە وەڵام دایەوە. ئەمجارەش کەڵەك لەنگەری گرت وئێمە دابەزینە خوارەوە. کەڵەکوان بە بێدەنگی دەستی گرتین و بەرەو کاناری بردین. رەمزی هیچی نەگوت، ئێمەش زارمان لێك نەکردووە، هەموو لە هەموو کش ومات بووین. ئەمەش رێك ئەو شتە بوو ئێمە مەبەستمان بوو.

کاتێ گەیشتینە سەر کەنار تاك تاك ڕۆیشتین. کەڵەکوانەکە بەوپەڕی ڕێزو حورمەتەوە تا ئەولاتر ڕێگای پیشاندایین. ئەگەر پۆلیسەکە هەر پرسیارێکی لێ بکردایە دەیگوت مەترسە ئەو پیاوەی لە ڕووبارم پەڕاندەوە جوامێرێکی بەناوو دەنگ بوو.
بەڵام ڕەمزی پێی وانەبوو شتی وا ڕوو بدات، ڕادیتنەکەشی ڕاست دەرچوو. ئەم پۆلیسە بچووك و کەم دەرامەتانە ئەرکی خۆیان بە دڵسۆزیو دەروونێکی زیندووەوە ڕادەپەڕێنن و، هەر نیو سەعات جارێـك کەڵەکێك دێت و دەچێت و ئەوان بە ساویلکەیی خۆیان دەیپشکنن. بەڵام ئەو ماوەیەی دەکەوێتە نێوانەوە، هیچ کەڵەکێك نایەت و ناچێت. ئیدی ئێمە دەتوانین بەدزیی چاوی پاساوە بۆی دەرچین. پاشی پێنسەد مەترێك بۆ لایەکی تر وەردەچەرخێین و دەرباز دەبین، یان بەشۆەیەکی تر بڵێین لە چاوی پۆلیسـەکـەوە وون دەبین. بەم شێوەیە بێ ئەوەی کەسمان پێ بزانێ لە دیجلە پەڕینەوە و سەرکەوتنێکی چاکمان لە ڕێڕۆیشتنمان بەدی هێنا. پاشان زانیمانەوە ئەو پۆلیسە وەك سەرپـاك بەرپرسانی تری پاسا، پێش ماوەیەکی کەم فەرمانی پێدرا بوو هەشیار بێ‌ولە هەموو ڕێبوارێك بپێچێتەوە چونکە چەتربازی ئەڵمانی نیشتوونەتەوەو خەریکی هەڵاتنن.
ئێستا چیایەکانمان سێ چوار ڕۆژێك لێوە دوور بوون. لەوێ دەکەوتینە سایەی پاراستنی دۆستانی ڕەمزی. ئەمە هانی داین خۆمان گورجتر بکەینەوەو بەرەوپێش بکوتین. ووتووێژێکی کورتمان کرد. هەمووەمان لەسەر ئەو باوەرە بووین پێویستە بەوپەڕی تواناوە پێ هەڵگرین. هەندێك جار پشوویەك لەسەر زەوی دەنووستین وپاشان لەجاران ماندووتر هەڵدەستاینەوە، هەزاران مێشوولەمان تێوە ئالاّ بوون. پێستی پێمان داماڵکا بوو و خوێنی لەبەر دەڕۆیشت. پەنجەپێمان بە خوێنی ووشك پێکەوە نووسابوون. کەس بیری لە خۆراك نەدەکردەوە. ئاویشمان لە کوێ بۆ هەڵکەوتایە لەوێمان دەخواردەوە. تەنیا بیرمان لە گەیشتنە ئامانج دەکردەوە. چەندی دوژمن لە دۆزینەوەی ئێمە بەپاش بکەوتایە، پشکنین و شوون هەڵگرتنی بۆرو بەرینترو چوست و چالاکتر دەبوو. هەنگاومان گورج کرد، ڕۆژ و شەو ترسی گیران چنگ لەسەر شان سەری لەدوومان نابوو.
دواجـار ئێـوارەیـەکیان گەیشتینە گوندێکی[8]باوکی ڕەمزی.ماڵی خۆی لێرە بوو، ئەگەر خۆیشی لەماڵەوە نەبوایە ئەوا پاکارە بروا‌پێکراوەکانی ڕایان دەگرتین و سەرووبەریان دەکردین. ڕەمزی لە سێبەری کەلاوەیەکی بەجێ هێشتین، و خۆشی بۆ ئەوەی کەس نەیبینی بە ڕێگایەکی ناڕاستەوخۆدا چووە ماڵەوە. هێندەی نەبرد پاکاران ئەسپیان بۆ هێناین و بە شێوەیەکی دۆستانە ئامادەیان بۆ کردین کەوا لەلایـەن ڕەمـزیـیـەوە نێردراون وپێـویستە بەسواری بڕۆین. پاشی ماوەیەکی کەم گەیشتینە حەوشەو بانێك، ئێمەیان بردە دیوخان و بە ئەسپایی دانیشتین. پێڵاومان لەپێ داکەند و سەرخەوێکی چاکمان کرد.
کاتێ بەئاگا هاتین ئێوارەکی درەنگ بوو. سەرکەوتینە سەربان بۆ ئەوەی خۆمان بدەینە بەر شنەبای فێنکی ئێوارە. هەریەکەو دەیچرپاندە گوێی ئەویتر (باوکی لەم کاتە لە گوند نییە)، ئەو پاکارانەی ڕەمزی‌یان لە منداڵییەوە دەناسیو خۆشیان دەویست، ڕەمزی پسپۆڕیو ئەزموونیدیتەیی ئێمەی بۆ باس کردن، لێرە پیاو دەتوانێ بە ئاشکراو بەبێ ترس بدوێ چونکە ئەو شتەی گوێیان لێی دەبێ ووشەیەکی چییە لەزاریان دەرناچێ، وەکو مردوو کرو بێدەنگن. هێلانەیەکی حاجی لەقلەق پێنج مەترێك لە ئێمەوە دوور بوو، خێزانێکی گەورە بوون. لەقلەقەکان بە دڵئاسوودەیی دەندووکیان لێك

دەدا. پاش ئەوەی تێروپڕمان خواردو خۆمان شوشت، خۆمان ئامادە کرد بەرەو ماڵی باوکی ڕەمزی لە هەولێر بەرێ بکەوین. ئەو هەنگاوەیان پێویستییەکی بەناچاری بوو لە پێناو ڕزگاریمان و هەورا بۆ ئەوەش بەڵکو لەوێ پشتیوانێکمان دەست کەوێ.
بۆ ئەوەی نیشانی بدەم بۆچی ئەو بایەخە گەورەیەمان بە ڕاکێشانی باوکی ڕەمزی دەدا بۆ لای خۆمان. حەزدەکەم بە کورتی ئاماژەی ئەو شتە بکەمەوە کە لە بەرەوە لە بابەتی پێکهاتی خێڵی کورد و پێوندیی سەرۆك خێڵ وخێڵەکەیەوە لێوەی دوا بووم.
سەرۆك خێـڵ دەسـەڵاتێکی بێ سنـووری هەیـە. دەتوانێ سەرتاپای گوندێك بە خەڵکەکەیەوە بفـرۆشێ‌و کەسیش ناوێـرێ بەرامبەر ئەم کردەوەیەی سەرۆك خێڵ دەم بکاتەوە. ئەگەر بیەوێ، دەتوانێ سەدان ژن وپیاو بۆ کەسێك بەکرێ بگرێ کە خۆی هەڵی بژاردبێ؛ ئەوانیش بەبێ وورتە بەگەڵی دەکەون. بەشێوەیەکی تر، ئەگەر لەپەنای سەرۆك خێڵێکی ناوچەکەدا بین ئەوا لە ئاشتی وئـاسایشین. سەرۆك خێڵ خەڵکەکەی خۆی دەناسێ ودەزانێ متمانە بە کیهەیان دەکرێ. تا لە سایەی ئەمانەدا بیت بە ژیان و بەگیان پارێزراوی. نەخشەکەی ئێمە ئەوە بوو تکا لە ئاغا بکەین بمـانگـەیێنێتـە چیایەکان و، ماوەیەکی زۆر لەوێ دوورە دەست بژین، لەهەمان کات بەڵەدێکی ئەوتۆمان بەگەڵ بدا سنووری کورد و تورك بزانێ و یەکێکمان بەسەلامەتی ئاودیووی تورکیا بکات: لەوێ ئەو کەسە خۆی بداتە دەستی پۆلیس و داوا بکا بگیرێ.وەك نیشتمانییەکی ئەڵمانی دەتوانێ پێوەندی بە باڵیۆزخانەی خۆیەوە بکات و بەسەر هاتی ئێمە بەنیشتمان ڕابگەیێنێ. تەنانەت ئەگەر بیەوێ دەتوانێ بچێتەوە ووڵاتیش.
لە بارێکی ئاوەهـادا، دەتـوانین لەسەر شوێنێك ڕێك بکەینەوەو. کە ڕەستەو شتومەك و دەزگای بێتەلمان بە چەتر بۆ هەڵدەنە سەر زەوی. ئەوجا دەتوانین پێوەندی بە بنکەی نیشتمان بکە ینەوەو، ئەو نەخشەیەمان کە ئاوەها بێ سەروشوێن بوو بوو ڕێکوپێکی بکەونەوەو بەرە پێشی ببەین. دیسان سەرومێشکم‌پڕ بووەوە لە نەخشـەو نەخشـەکاری ودەمتوانی هەزاران دەروازە بدۆزمەوە؛ باسی دەست هەڵگرتن هەر مەکە؛ دەبوو بڕوامان پتەو بێ کە هێشتا دەرفەت هەیە کردەوەکەمان جێ بەجێ بکەین و تیایدا سەرکەوین.
کە شەو داهات سواری ئەسپی چاك وچاپوك بووین وگەردوگۆڵی بەیانی گەیشتینە هەولێر. ماڵی ئاغا کەوتبـووە پەرگەی شار، لەناوەندی باغێکی گەورەی بە سێبەرو سایەو، پڕ لە درەخت وگوڵزار و، شووره بۆ کێشراو هەڵکـەوتبـوو. ڕەمـزی هەر لەسەردەمی منداڵییەوە ئاشنای شوێنەکە بوو و دەیزانی چۆنی لێ بچێتە پێش بەبێ ئەوەی کەس بیبینێ. لە ئەسپەکانمان دابەزین، ئەو پاکارانەی لە گەڵمان هاتبوون، بە خۆیان و ئەسپەکانیانەوە لەو ناوە بزر بوون وئێمەش بێ ئەوەی کەس پێمان بزانێ لە کونێکی ناو دیوارەوە بە بێدەنگی ئاودیوو بووین و لە کونجێکی دوور هەڵکورماین.
ئەرکی ڕەمزی ئەوە بوو پێش ئەوەی باوکی ببینێ، هەموو شتێك لە برا گەورەکەی ڕابگەیێنێ. چونکە لە ڕوژ هەڵاتی ناوەراست براگەورە میراتگری موڵك و ماڵی ئاغایەو، وەکو باوکی خاوەن دەسەڵاتە. بە شێوەیەکی ئاسایی خواست و ئارەزووی باوکی لە هەموو شتێك بەجێ دەگەیێنێ. لە ڕاستیدا باوك چەنـدی بەنـاو ساڵیش بکەوێ وتەنانەت ئەگەر تەمەنی بگاتە سەد ساڵیش، جڵەوی هێزو دەسەڵات هەر لە دەستی خۆی دەهێڵێتەوە.



● حاجی عەلی قاوەچی
منداڵەکان (ئەمیر، ماهیر، شەهیر) نوورەدین ڕەشید



● نافیع ڕەشید ئاغا ـ لە گوندی (تەرجان)



● نافیع ڕەشید ئاغا ـ لەگوند

گرنگترین دڵەراوکەی یەکەمین کوری ژنی هەرە خۆشەویستی ئاغا ئەوەیە نەبێنێ هیچ دژێك بێتە سەر شانـۆ. بۆ ئەوەی کاتێ باوك کۆچی دوایی دەکـات ئەوا ئەو یەکسـەر خۆی لەسـەر زینی فەرمـانـرەوایی تونـد بکـات. بەڵام چۆن ئەو گوێـرایـەڵی باوکیەتی کە هێشتا ماوە دەیەوێ برا بچووکەکانیشی کتومت ئاوەها بەرفەرمانی ئەو بن.

رەمزی بزر بوو. پاشی تاوێك گەڕایەوەو براگەورەشی لەگەڵدا بوو. براگەورە چاویلکەیەکی چوار چێوە کانـزای لەچاو بوو، پێ دەچوو زۆر بە ترس و پارێز بێ. لە یەکەمین سەرنجی ئەم پیاوەوە بۆت دەردەکەوت ئێمە میوانی پێشوازیکراو نین.

رەمزی پێی گوتین: «برایەکەم دەڵێ، نابێ باوکم بە هیچ جۆرێك بزانێ ئێوە لێرەن. لەیەکەمین شەری جیهاندا باوکم دژایەتییەکی بە ئاشکرای ئینگلیزی کردووەو. سەرەنجام هەر هەنگاوێکی ئێستا هەڵی دێنێ بەو پەری گومانەوە سەیر دەکرێت. لە پێناوی ئەوەی کە بە هێمنیو دڵنیایی بژین ئاغا بریاری داوە لە هەموو ئەو کارانەی بە یاساشکاندن دادەنرێن خۆمان بەدوور بگرین.»

براگەورە بە هەراسانییەوە جێ پێی بزواند وگوتی:

«رەسمی میواندار ی ئەوەیە خواردن و خواردنەوەتان بدرێتێ و دەرفەتی پشودانتان بۆ دابین بکرێ. پاشان دەبێ برۆن.»

بۆمان دەرکەوت هیچمان لێرە دەست ناکەوێ؛ دەبێ پشت بە ژیری و وریایی خۆمان ببەستین. براگەورەش بێدەنگ لە شوێنی خۆی وەستا بوو بەبێ ئەوەی دەستی هیچ یارمەتییەك نە بۆ رەمزیو نەبۆ ئێمە رابکێشێ.

رەمزی گوتی: «دڵنیام باوکم یارمەتیم دەدا. بەڵام براگەورەم دەتوانێ باوکم بە تەواوی بکاتە دژی من.» بە غەمباری وتوورەیی تێ هەڵچووەوە وگوتی: «خۆزیا لە شوێنێکی لەبار دەکەوتینەوە. بەڵام ئێستـا پشکنـین و شوون هەڵگرتنێکی گەورەمان بەدواوەیە. برام دەستی خۆی لە گرەو نانێ و بریاری داوە ببێتە کۆسپ لە نێوان من و باوکم.»

دوای نیوەڕۆ لەو ژوورە دانیشتبووین کە باوکی رەمزی لەکاتی گەڕانەوەیدا بەسەر ئێمەدا دەهات. ئەو کاتە دوو کەس بە نۆرە دڵنەواییان دەکردین بۆ ئەوەی دڵمان بدەنەوەو وورەیەکی نوێ بخەنەوە بەرمان. یەکەمیان برا بچووکی[9] رەمزی بوو، بەتەمەن رەنگە هەر دەسالان دەبوو، چاوگەشێکی چاوگـەورە بوو، لەهـات وهـاوار نەدەکـەوت چونکە هێشتا منداڵ بوو. بە خواهشتی خۆی وەك خزمەتکارو، یارمەتیدەر و پاسەوان و وەك هەموو شتێك بەگەڵ ئێمە کەوتبوو تەنیا بۆ ئەوەی لەگەڵ برا گەورەی بێت کە هۆگری بوو بوو. لاساریی منداڵانەی ئەو بوو بووە مایەی کەیف خۆشیمان. چونکە هەموان هەستیان دەکرد چەند هۆگری رەمزی‌یە. هەروەها پیرەمێردێکیش هەبوو، زۆر پیرو کەنەفت و بەناو سال کەوتوو بوو، ئەویش (ئەحمەد)[10] ی قاوەچی بوو. چل پەنجا ساڵێك دەبوو، لەوە بترازێ قاوەی بۆ ئاغای‌و خزمان ومیوانانی ئاغا لێ دەنا هیچی تری نەکردبوو. قاوەی بۆ ئێمەش هێنـا بەڵام چۆن قاوەیەك! قاوەلێنان لە رۆژهەڵاتی ناوەراست بووەتە هونەرێکی جوان Fine art بەتایبەتی لە ماڵەشێخە گەورەکان دا.

رەمزی، یان رەمزی‌یە شێت کەهەر لە منداڵییەوە وا ناسرا بوو، لەگەڵ کابرای پیرەمێرد زۆر دۆست بوون. کاتێ رەمزی باسی گیان لەسەر دەستیی ئێمەی بۆ دەگێرایەوە، چاوەکانی پیرەمێر لە خۆشیانە

دەبریسکانەوە.
پیرەمێرد گوتی: «برایەکم هەیە بست بە بستی سنووری تورکیا شارەزایەو دەزانێ چۆن بەسەر هەموو بنکەی پۆلیس و بنکە سوپاییەکانی ئەوێدا باز بدات. لەمشەو زووتر نییە دەنێرمە دووای خۆی ئامادە بکا وبێت.»
ئێستا ئێمە بەمە قایل بووین، بە یاریدەی دۆستانی برواپێکراوی رەمزی دەتوانین ملی رێگا بگرین و، پەنا بە هێزو تەکانی خۆمان بەرەو کەژو کۆسار هەڵکشێین. بەهۆی دۆستانەوە بۆمان دەکرێت داوێکی پێوەندی لەگەڵ قاوەچییەکەی ماڵی باوکی رەمزی رابگرین.
ئەو کونە دیوارەی ئامێزی بۆ هاتنی ئێمە کردەوە، ئەوا ئێستا وەك بڵێی بە مانەوەی ئێمە دڵتەنگ بووبێ رێگای بۆ ئاوالاکردنی جارێکی تریش بۆ ناو تاریکیی شەوگار سەر هەڵگرین. ئەوانەی بە هەڵاتنــەوەن، ئەو دڵنیاییە پارێزەری کە شەوەزەنگ بۆیان دروست دەکات لەگەڵ ترس وتۆقێنی شاراوەو کەس بەسەرچاوەنەزان هاوسەنگ دەبێت. ترس و تەزووی گیران لە دڵی ئێمەدا وا پەنج بەست بوو بوو دەمانگوت پێش ئەوەی بگەینە داڵدەی چیایان بە دیل دەگیرێین.
بەرەو باکـووری رۆژهــەڵاتی هەولێر دەرکەوتین. رێگاوبان لەوانی پێشوو ئاوەدانتر بوون چونکە خەڵکی ئەو دەوروپشتە شەوان شتومەکیان دەهێنایە شارو، بۆ بازێری بەیانییان ئامادە دەکردن. دەستــە سوارێــك بەم شەوگــارەو بەرووکــارێکی پێچەوانەوە بەرەو چیایان هەڵبکوتن بێ گومان سەرنجی خەڵکیان رادەکێشا. لەبەر ئەوە دابەشی دوو دەستە بووین. بەپێیان و بەبێباکی شان بە شانی تووڵە رێیەکە رۆیشتین.
هەستم دەکرد موچڕکەم دێتێ کاتێ یەکێك لە ئێمە نزیك دەکەوێتەوە. بیرم لەوە دەکردەوە کە ئێستا لەکات وساتی ئاوەهاییدا دەبێ رێگاوبان لەبن چاوەدێریدا بن.
لەماڵی رەمزی، ئەو چیرۆکە سەیر سەیرانەمان بیستەوە دەربارەی ئێمە هەڵبەسترا بوون. خەڵك دەیـانگوت تیپیکی پێشکەوتووی سوپایەکی گەورەی ئەڵمانی نیشتوونەتەوەو ئەندامانی ئەو تیپە رەنگ وروویان لە شێر دەچێ‌و ئاگر لە دەمیانەوە هەڵدەچێ، تانکی ئەوتۆیان هەیە تەنیا دیتنیان بەسە بۆ تێکشکاندنی مرۆ یان درندە ئەگەر لێی بچنە پێشەوە.. ئەرێ ئەوە چەند ئەسپ سوارێك نین لە پێشمانەوە و خۆیان لە لایەکەوە دانووساندوە؟ ها ئێستا نا ئێستا دەماندەنە بەر تیشکی پشکنین!
رەنگە بە چاکی هەست بکرێت دەمارگیریمان ئەو کاتە لە باری هەرە ناهەمواریدا بووە. ئیدی ئەوە بوو ملی ئێمە لە چەقۆ دەسووا.
رەمزی لەگەڵ یەکێك لە ئێمە رۆیشت بۆ ئەوەی بەبێ سەرنج راکێشانی کەس بزانێ ئایا دۆستە بەمتمانەو دەسرۆیەکەی لە ماڵەوەیە. دووەکەی تریشمان دووا بە دووای ئەوان تا هێزی پێمان هەبــوو هەنگاومان گورج کرد. بەڵام پاشان کەوتینە دوو دڵییەوە کە ئایا تووڵەرێیە راستەکەمان گرتووە یان نا. لە رۆژهەڵاتی ناوەراست چەندین پیادە رێ لە گوندێکەوە دەچێتە گوندێکی تر و چەندین ساڵە مرۆڤ وگوێدرێژ رایەڵەیان پێدا دەکەن. نیشتمانییەکانی ئەم وڵاتەی وەك رەمزی کاتێ رێکەوتی دووریانێك دەکات، بێ ئەوەی زۆری تێ رابمێنی بە خدووی زگماك دەزانێ کام رێگا راستە بۆ ئەوەی بیگرێتە بەر. بە هۆی پەرێشانی و ماندوێتییەوە تەواو شڵەژا بووین. پاش

تاوێك ووتووێژو تاوتوێكردن و نەخشەدانان هاتینە سەر ئەوەی هەردووكمان ڕاستین، بەڵام هێشتا تەواو دڵنیا نەبووین كام ڕێگا بەرەو ئەو لایە دەچێ ئێمە مەبەستمان بوو بۆی بچین.
زۆر بە ئاسایی، ڕەمزی بیری نەكرد بووەوە شتێكی ئاوەها چەند ئاڵۆزیو سەر لێ شێوان بۆ مێشكی ئێمەی ئەوروپایی دەنێتەوە. ئەو بەرەو ئامانج ڕۆیشت و دەبوو ئێمەش شوونی ئەو هەڵگرین، ئەوا ئێستاش بەم هەموو هێزی بیرو ئاوەزەوە، دووگیانی سەرلەدوو نراو، تەنیا باڵ؛ شەوكەت وماندوو؛ هەموو ئێسكی لەشمان ئازاری لێ هەڵدەستا؛ لە دەشتێكی وڵاتی دوژمن وون بوو بووین. بەم شەوەزەنگە تاریكەو بە نەوە دڵی هەنگاومان بەرەوپێش ڕاگوێزت. لە خۆم پرسی: ئایا بە ڕووكارە ڕاستەكە دا دەڕۆین؟ ئایا ڕێگامان وون نەكردووە؟ ئەگەر وون بوو بین ئەوا هیچ هیوای ڕزگاریمان نییە. چونكە ئەگەر بێو خۆمان وەك بیانی، واتە وەك دوژمن ئاشكرا نەكەین ناتوانین لەگەڵ كەس بدوێین. ئەو كاتەش تێكرای خەڵك بە گەورەو بچووكەوە بە ڕۆژنامەو ڕادیۆ و ووتووات ئاگادار كرابوونەوە بۆ ئەوەی چاو لە ئێمە بگێرن. چەند سەعاتێكی شەومان بە لارە لارە بری.
لەناكاو دەنگی تەپوكوتی غاردانی ئەسپمان هاتە گوێ. ئەمجارەش گوێمان هەڵخست: دەبێ چەند ئەسپێك بن! یەكەمین بیرمان پۆلیس وسەربازو پشكنین بوو؛ بیری دووەمینمان خۆشاردنەوە و ڕاكردن و دوور كەوتنەوە لە ڕێگاو خۆ وون كردنی ناو چاڵ و كەندری ناو كێڵگە بوو. پاشان چەند هەست و بیرێك ئێمەی گێڕایەوە شوێنی جارانمان. پێم خۆش نییە ئەم جۆرە ساتانە زۆر جار لە ژیانی خۆم تاقی بكەمەوە.
تروو كەیەك پاشتر، سوارەكان گەیشتنە سەرمان، یەكێكیان خۆی هەڵدایە خوارەوەو هاتە پێشمان و هاواری لێ كردین، تێیان نەگەیشتین. ویستمان بەتەنیشتیدا ڕەت ببین و بەناو دیواری پارێزەری تاریكەشەوەوە خۆمان وون كەین پاشان ووشەیەكمان كەوتە بەر گوێ: «ڕەمزی» یەكسەر تێ گەیشتین ئەو خۆی ئەسپی بۆ ناردووین، هەرگیز وەكو ئەو شەوە پڕ دڵەڕاوكەیە ئاوەها سووك و بەو چاپوكییە خۆم هەڵنەداوەتە سەر زین. بەخێراییەكی چاك ڕۆیشتین. بەڵام كاتێ بە پارێزوماتە ماتە چووینە ناو گوندێكی كوردەوە، گرنگی بەیانی دابوو. لە پێش ماڵی شێخ وەستاین و دەرفەتیان داین بچینە ژوورەوە.
لێرە خوێنبرایەكەی[11] ڕەمزیمان بینی. جۆرێكی سەیر سەر سوڕهێن بوو. كراوە، زیرەك؛ ڕوشنبیرێكی چاك، بەتەمەن هەروەكو خۆمان دەبوو. ڕەمزی لە خوێندنگای بەغدا لەگەڵ ئەو بوو بوو.
ئەو كەسەی دەرفەتی دیمانەی كوردێكی ڕەسەنی لەم شێوەیەی بۆهەڵدەكەوێ، ناتوانێ خۆی لە هەستی بە هێزی خۆشەویستی لە بەرامبەری ئەو گەلەو وڵاتەكەیاندا ببوێرێ. كورد، گەلێكی بەرچاو ڕوون وژیر ووریان. ووزەیەكی بەرزەوت نەكراوی لەبران نەهاتوویان هەیە. مرۆگەلێكن هێشتا لە ڕێورەچەڵەكیان، لە گوندیان لە داوو نەریتیان نەشۆراون، هەر كوردێكی تۆ دەیگری ڕەسەنزادەیەكە شیری دایكی خۆی مژتووە.
دەمانتوانی پشووێكی ڕۆژێكی درێژ لێرە بدەین، كانگەی بیرو دەروونمان ئەوەندەی نەمابوو چك بكات وپێویستێكی گەورەمان بە وە خۆهاتنەوەیەك هەبوو پێش ئەوەی دوا خواستیمان بخەینە پێش چاوان. لە دەرەوە لەبەر سێبەری درەختێك ڕۆنیشتین وئەوپەری كەیفمان لە بێن وبەرامی سەر

خۆشکەری گوڵ وچرۆی درەخت و شنەبای فێنکی بەر سێبەر و دڵنیایی وەردەگرت. کاتێ ووتووێژ هاتە سەر و وردایەتییە پێویستەکان، چووینەوە دالانی ژوورەوەی خانووەکە، سێبەری هەیوانێك لەوێ هەبوو. بۆ ئێمە سێبەری دارو درەخت و گوڵ وچرۆیان و پێش کانیاوە ساردەکەی باغەکەی دەرەوە خۆشتر بوو. بەلام لەوانەبوو خەڵکی گوند بمان بینن و ئێمەش نەماندەویست هیچ هۆك و بیانوویێك بۆ ووتوواتی ناپێویستی خەڵك دەربارەی میوانەکانەوە پەیدا ببێ. ئەوە بوو لە دالانەکەی ژوورەوە دانیشتین. خواردن وخواردنەوەی چاکمان خوارد و نووستین. زۆرمان حەزدەکرد مانەوەمان پتر بخایەنێ بەلام چارمان ناچار بوو دەبوو زوو لێرە وەدەر کەوین.

ئەم دۆستە نوێیانە شوێنێکی زۆر چاکیان بۆ خۆشاردنەوەی ئێمە دۆزیەوە. شوێنێکی وا نەبوو بۆ مانەوەی چەند مانگێك بشێ بەلام بۆ خۆشاردنەوەی چەند هەفتەیەکی داهاتوو باش بوو.
لە ژوورروو؛ لە چیایەکان، رۆژە رێیەك بەسواری؛ لە شوێنێکی چەپەکی دوورە دەست زنجێکی بچووکی ماڵە کوردێك هەبوو. ژن وپیاوێك و چەند منداڵێك بوون. ئەو خێزانە ژیانیان لەسەر شاتوویێکی گەورەو چەند سەر مەرو بزنێك بوو. ماڵێکی لاچەپ بوون و هاموشۆ ی کەسیان بەسەرەوە نەبوو. ناو بەناو تاك وتووك خەڵك بەوێدا رادەبووردن. چەند سەد مەترێك بەو لاوەتری ماڵەکە، ئەشکەوتێك لە پشت چیایەکەوە هەبوو. بۆ ئەوەی ئەو ئەشکەوتە ببێتە شوێنێکی چاکی خۆشاردنەوەی ئێمە کانییەکی سازگاری بچووکیش لە نزیکەوە هەبوو. شتی زۆر گرنگ ئەوە بوو ئەو ماڵە سەر بە خێلی باوکی رەمزی بوون. ئەو پەری وەفایان بۆی هەبوو، هەروەها سەرەرای ئەوەی زۆربەی جار سەرانەی (عەینی)یان لە بریتی زەویو ماڵەکەیان دەدا، هەر کاتێکیش شەری خێلەکایەتی هەڵبگرسایە دەبوو بە دوای سەرۆك خێل بکەون. رەمزیش بەو ناوەی کوری ئاغا بوو پایە وریزی گەورەی لەلای ماڵەکە هەبوو و، هەروا ئارەزووش ئارەزووی ئەو بوو. دەبێ ئێمە بشارنەوەو دڵسۆزی و وەفاشمان بۆ بنوێنن!

ئەو کاتەی هێواش هێواش لەو ماڵە وە دەرکەوتین تەواو ئێوارە داهاتبوو، لەبەر ئەوەی ماڵ وباغەکە کەوتبوونە سەرپەرگەی گوند، دەمانتوانی بێ ئەوەی کەس بمانبینێ خۆمان وون بکەین. دۆستەکەی رەمزی تەواوێك لە پێش ئێمەوە بە سواری دەرۆیشت بۆ ئەوەی رێگایەکە بەسەر بکاتەوە و ئەگەر نیشانەی هیچ مەترسییەك هەبێ وریادارمان بکات. هەستێکی خۆش بوو. دوای ئەو هەموو تەنگاوی و بێ هیواییە سەرەنجام بگەینە سایەی چیایان. سەرەتا ملی توولە رێیەکمان گرت. هێندەی نەبرد توولە رێ تەسك بووەوەو بوو بە چەمێکی بەردەلانی نێوان دوو نشێوی چیا، ئەو کاتەی ساڵ جۆگەی ئاو کەم بوون، بەلام وەرزی باران تەوژمی بەخور گەلێك زۆرن. رۆیشتنی بە پێیان سەخت بوو بەلام ئەوئەسپانەی ئێمە بە سووکی و خێراییەکی سەر سورهێنەوە دەرۆیشتن. سەرمان لە سووکی وبزێویی ئەسپی رێ نیشاندەرەکەمان سورما بوو، لەبەر تیشکی کزی هەتاو وەکو تارماییەك دیار بوو لە پێشمانەوە دەرۆیشت.
درەنگانی شەو بوو گەیشتینە جێ مەبەستمان. خەڵك لە مێژ بوو نووستبوون، بەلام سەگوەر لە نزیکبوونەی ئێمەیان ئاگادار کردنەوە.

# بەسەلامەتی

بێگومان، خەڵکی گوند لەسەر ئاگر بوون بۆ ئەوەی پێبکەون کێ بوو بەم نیوەی شەوە گەیشتە ئەوێو، دەسبەجێ بڕیاری ئەوە دەدەن شتێکی نامۆ لە گۆڕێیە. کاتێ دەبینن ڕەمزی‌و برادەرەکەی لە گەڵیانن هێـور دەبنەوە. وەکو لە ڕۆژهەلاتی ناوەراست باوە، پێش هەموو شتێك چای لێنراو ئێمـەش بەنیوەبازنەیەك لەحەوشەی بەردەم خانووەکە دانیشتین و سلاوی یەکترمان وەرگرتەوە، پاشـان هاتینـە سەرخـاڵی سەردانـەکـەمـان و بەشێـوەیـەکی ئاسـایی ئەمـە درێژترین باسی دانیشتنەکەمان بوو، لەباری ئاوەهادا تەنیا خاوەن ماڵ و لەوانەیە هەندێك جار کورە گەورەی تێکەڵ بەباس و خواسەکە ببن. ئەوانیتر لەلایەکەوە دادەنیشن، دەبوو نیازی خۆمان تەواو ڕوون بکەینەوە بۆئەوەی خەڵکەکە بزانین چییان لەسەر پێویستە بیکەن، هەموویان بەخواهشتی خۆیان گفتیان داو ئاشکرا دیاربوو کە مایەی سەربەرزییە بۆ ئەوان بتوانن کوڕی ئاغای خۆیان و هاوەلانی کوڕی ئاغا چەپاڵە بدەن.

دۆستەکەی ڕەمزی هەستا ڕۆیشت بۆ ئەوەی بەیانی زوو لەماڵی خۆی بێت و کەس سۆسەی لەمـاڵ دەرچوونی نەکات. بۆ نووستن سەرکەوتینە سەربانی خانووەکە بۆئەوەی خۆمان بەچاکی بپارێزین. شەو، ساردی کرد، خۆمان بەولێفانە داپۆشت کە خەڵکەکە بۆیان هێنابووین. وامدەزانی ئەوەندە شەکەت و ماندووم هەر چاوبنێمە سەریەك ئێدی خەو دەمباتەوە، بەلام وا دەرنەچوو.

برادەر، تۆ دەزانی کێچ و ئەسپێ چین؟ میوانی زۆر نالەبارن و ئەو کەسەی ناسیاوێتی لەگەڵیان هەبێت بروام پێدەکـات. بایی ئەوە لە ڕۆژهـەلاتی ناوەراست و کوردستـان ماوەمـاوە بزانم چاوەنۆڕی چیبم. بەلام باری ئێرە زۆر نالەبار بوو، بە کورتی، چەند جاری دەهاتمەوە سەر ئەوەی ببۆرژێم، لەناکاو دەکەوتمەوە بەر هێرشێکی گەرم. بەرگری لەخۆکردن هەر نەبوو. خۆم وەرگێڕایە سەرسنگ بەلام زۆری پێ نەچوو. جۆرە پیلان و داوێك لەشوێنێکیتر هەبووو لەناکاو هێرش بەرەو ڕانم وەرسـوورا. باسی نووستن مەکە، ئەو هەموو هێرش و چەپاوکردنە نەیانهێشت خەو لەچاوم بکـەوێت. هەمـوومان گیرۆدەی هەمان ئازارو دەرد بووین تەنیا ڕەمزی نەبێ. ڕەمزی، دۆستی خۆشـەویستمـان، بەوپـەڕی دڵنیایی لەحەشە ڕاکشابوو، ئەم گیانلەبەرە بچووکانە یان بێزیان لەخوێنی ڕەسەن خۆماڵیی ڕەمزی دەبووەوە یان بەراستی هەروەکو خۆی لەماڵەوە گوتی لەمێژە لێیان بزر بووبوو. تەنیا پاش ئەوەی هەموو سەرین و لێفەکانمان لەسەربان لابرد ئەوجا توانیمان تابەیانی لەبەر ئەو سەرمایە بخەوین.

ڕۆژی پاشتر دەستمان بەخۆشکردنی ئەشکەوتەکە کرد. بەردەکانمان بردە لایەکەوەو زەویەکی ڕەق بەلام ڕێکوپێکمان بۆ خۆمان خۆش کرد. لەگەڵ خەڵکی گوند ڕێك کەوتم هەموو ڕۆژ خواردنمان بۆ بێنن و ئێمـەش پارەیـەکی چاکیـان لەبرێتیدا بدەینێ. ئێمە بەحەزی خۆمان بوو لەو شوێنە شاراوەیە بین، نەبادا خەڵکێکی لایدە ڕوو لەوماڵەبکەن و سەربە ژووری ماڵەوەدا بگرن. هەروەها دەمانویست تا ئەوکاتەی یەکەمین شەپۆلی پشکنین دەنیشێتەوە لێرەبین و، دۆستانیش بەڵێنیان پێ داین هەمیشە وریا بن و هەرچی شتێك هاتە ڕوودان پێمانی ڕابگەینن و هەر مەترسییەك هاتە پێشەوە زوو بەزوو وریامان بکەنەوە. زۆر بەپەرۆش بووین برای قاوەچییەکە بگات و یەکێکمان

بەپەلە بگەیێنێتە تورکیا. بەمەزندەی ئێمە کابرا بەدوو سێ ڕۆژ دەگەیشتە جێ.

پاشی ئەوە دەبوو بکەوینە خۆمان و هێشتا لەسەرەوەتری چیایان شوێنێکی تری خۆشاردنەوە بدۆزینەوە. هەرچەندە ئەو شوێنەی ئێستامان چۆڵ و دوورە دەست بوو بەڵام هێشتاکە پۆلیسی عیراقی دەگەیشتێ. لەدۆڵەکانی ژووروو، لەو شوێنەی لوتکەی بەفرین سەریان لەئاسمان دەسوێ، پاسایەکیتر لەوێ دەسرۆیە، پاسای عێل و عەشایر.

نەپۆلیسی عێراق و نەسەربازی ئینگلیز ناوێرن خۆیان لەقەرەی ئەو ناوچەیە بدەن. ئەو شوێنە دڵی وڵاتی کوردانەو، (پەردەی ئاسنین)ی کوردی خوێن لەوێوە دەست پێ دەکات و سنووری دەستکرد مانای ئەوتۆی نییە.

بەڕۆژەوە دادەنیشتین نەخشەمان دەکێشا. کاتێکیش تاریك دادەهات هەریەکەو دوو سەعات ئێشکمان بەنۆرە دەگرت. دەمانچەی رووتمان لەناو دەست بوو. ترسی تووش هاتنی ئینسانی نەیار تاکە ترسێك نەبوو هەرەشەی لەئێمە دەکرد، بگرە دەبوو خۆمان لەدرندەی کەژوکێوی کوردستان، لەوورچ و کەمتیارو تورگیش بپارێزن. هەروا بێ ئەژمار مارو موور هەبوون و دەبوو لەکاتی ڕۆیشتن زۆر ووریا بین. لەوانە بوو هەنگاوێکی دووبەختی ببێتە مایەی دەردو ئەشکەنجەی زۆر یان ڕەنگە مردنیش. بەتایبەتیش لەکاتی ڕۆژ کاتێ ماری ژەهردار لەبەر گرموی گەرما ڕادەکشێن و ژەهری کوشندەی ناو کەڵبەیان زور بەکارو مەترسییە.

## دەستەی قاچاخچییان

چەندڕۆژێك بەبێ رووداو رابردن. ئەو پیاوەی دەبوو یەکێکمان لەکەوشەنی تورکیا ئاودیوو بکات هێشتا دەرنەکەوتبوو، پێمان وابوو هەرکاتێکی دەربکەوێ دەردەکەوێ. بەیانیانێك، ئەوکاتەی دوا ئێشك گرتنی شەو تەواو بوو بوو و هەموومان بەیەکەوە لەئەشکەوتەکە نووستبووین، یەکێك لە ئێمە بەئاگا هات. داخۆ هیچ شتێکی نامۆی هاتبوو گوێ؟ پاڵی دایەوەو نووستەوە. جارێکی تریش بەئاگا هاتەوە، نیشانەی مەترسیی ڕاگەیاند و ئەوانیتری ووریادار کردەوە.

بەڵام کار لەکار ترازابوو و بۆ هەڵاتن زۆر درەنگ داهاتبوو. هەناسەمان ڕاگرت، دەنگی سمی ئەسپانمان هاتە گوێ، لەسەد هەنگاوێك دوورتر نەدەبوو. کاتێ سەرمان دەرکێشایە دەرەوە، چەند کوردو چەند هێستریکمان بینی و گوێمان لە غەڵبەغەڵبی دەنگیان بوو. هێسترەکان باروبنەیان لێ کرایەوەو بەرەڵڵای سەر کانییەکە کران، پیاوەکانیش هاتن شوێنێکی سێبەر بۆ خۆیان بدۆزنەوە. کاتێ ئێمەیان لەناو ئەشکەوتەکە بینی ڕاچەنین و یەك لە دووای یەکتر بە خۆیان وپەنجە لەسەر پیلکەی تفەنگیان هاتنە پێشەوە. نەیاندەزانی داخۆ ئێمە دۆستین یان دوژمن. بەپارێزەوە سەلامیان کرد. ڕەمزی دەسبەجێ بەگوڕو جۆشی لەمەرخۆیەوە سنگی ڕەپێش کردو زەردەخەنەیەکی بۆ کردن. خوڵکی چا خواردنەوەی کردن. ئەم نیشانەیە بەڵێنی ڕەفتاری دۆستانەی لە نێوانی هەردوولا ڕاگەیاند.

بێگومان هەردوو لا زۆریان حەزدەکرد بزانن ئەوانیتر لەکوێوە هاتوون و لەم ناوچە لاچەپە چی دەکەن. ڕەمزی بوو بەدەمراستی ووتووێژەکەو تەکتیکی خۆی بەکار خست. کاتێ هەستی ئەوەی

کرد ناتوانێ خۆی لە دەستەو بەرۆك بوونیان ببوێری (ئەشکەوتەکە هێندە درێژ نەبوو بۆ ئەوەی خۆمـانی تێـدا وون بکەین)، بریاری دا تەکتیکی خۆی لەسەر بنەمای دۆستایەتیو پارەنەودوو شتەی لە رۆژ هەڵات باویانە، دابمەزرێنێ.

لەوانە بوو راستیو راستوێژیی تەواو باشترین سیاسەت بن. بەلای رەمزییەوە ئەم هەلومەرجە نوێیە وای دەویست بەتایبەتیش ئەو کاتەی بۆی دەرکەوت ئەوانەی مامڵەتیان لەگەڵ دەکات لەو خێڵەن کە دایکی خۆی ـ واتـە کیـژی ئاغـای ئەوانی، لێـوە هاتـووە. وێـرای ئەمەش، ئەمانە دانیشتووی هەرێمی چیا بەرزەکان بوون کە بۆ ئێمە پەناگەی هەرمباشی داهاتوومان بوو.

کەوابوو بارودۆخەکە تەنیا پارەی پێ دەویست. هێشتا برێکی تەواو دراوی زێرمان پێمابوو بۆ ئەوەی بتوانین دەسگرۆیی سەرۆك تیپێکی لەم بابەتەی پێ بکرین. بەڵام ئەوشتەی دەبوو وورپای بین ئەوە بوو پارەکە پێشدەست نەدەین. دەبوو لەسەر شوێنێك رێك بکەوین و پارەکە لەوێ بدرێ.

هەتـا پارە فەرمـانرەوا بووایە ئێمە ئەرخایەن بووین. ئەدی پاشان؟ گومانم نەبوو تا ئەوکاتە دەمانتوانی لەبەستنی سەری پێوەندی لەگەڵ خێڵەکان سەربکەوین و، لەراستیدا نەك هەر ئەمە بگـرە کەلوپەلێکی زۆرمان لەئامێری نوێبابەت و چەك و تفاق و زەخیرەی شەرەوە لە وولاتەوە بۆ دەهات بۆ ئەوەی کردەوەکەمان بەگوێرەی نەخشەی بۆ کێشراوی خۆی بکەوێتەوە سوور.

هەموو جۆرە بارو بیرێك بەمێشکمدا گوزەری کرد. کاتێ سەرنجم دا دەبینم وا رەمزی پێیان دەڵێت ئێمە کێین و لەکوێوە هاتووین و نیازمان چییە. هەروا ووردە ووردەش لەسایەی سەرراستیی خۆیەوە توانستی سۆزی ئەوان بۆلای خۆی بەکێش بکات. بەهیچ بارتێك نەدەکرا ئەو راستییە بشارینەوە کە ئێمە کورد نین. چونکە هەزار و یەك پرسیاری ئەوتۆمان بەرەو روو دەکران کە ئێمە نەدەکراین وەڵام بدەینەوە.

میوانەکانیش دڵی خۆیان بۆمان کردەوەو پێیان لێناکە دەستەیەکی قاچاخچین و پێوەن برێکی گەورە لەتووتن بە رێگایەکی نهێنی بەرەو شار بگوازنەوە بۆ ئەوەی خۆیان لەباجی میری بدزنەوەو تووتنەکەش لەوێ بەنرخێکی گران بفرۆشن.

ئایا ئەمە هەلێکی چاك نەبوو لەوکاتەی دەمانویست دالّدەی ئێستامان بەجێ بهێڵین تووشی ئەم پیاوانە ببین و بەهەمان ئەو رێگا نهێنییەی ئەوان بەچاکی شارەزای بوون بەرەو ژووروی چیایان هەڵکشێین؟

سەرۆکی تیپەکە گفتی پێدا پاشی دوو رۆژ بگاتەوە ئێرە و لەگەڵ خۆیمان بباتە چیا. هەر هێنـدەی دەویست بەپـەلە شتـومـەکـەکەی لە هەولێر ساغ بکاتەوە. پێمانی گوت گوندەکەی لە شوێنێکی زۆر بەرزی پاڵی چیـایـەو بۆ ئێمە لەبارترین شوێنە. لەوێ تەواو دوورە بەلا دەبین و پێویستە ئێمەش بروای تەواو بەخۆیو ئەو پیاوانەی بکەین کە هەمیشە بەرفەرمانی ئەوەن.

پێویست بوو ئێستا بەپەلە بەخۆمان بکەوین. ئەو بەڵەدەی یەکێکمانی بۆ تورکیا دەبرد بریار بوو ئەو رۆژە یان رۆژی دوواتـر بگـاتەجێ. بەڵام ئێمە حەزمان نەدەکرد هەرکەسەو بەدوای کاری خۆیەوە بێرەدا رابووری. رەمزی پێشنیازی کرد بەتەنیا خۆی بچێتەوە لای قاوەچییەکە لە هەولێرو بزانێ باروزرووفەکە چۆنەو پاشی دوو رۆژان بێتەوەو، هەروا ئەگەر هاتوو قاچاغچییەکان پێشی ئەو هاتنەوە دەبوو بەگەڵیان بکەوین و ئەویش بەدووای ئێمەدا دەهات. ئەو پێشنیازەمان بەلاوە بەجێ

بوو و رەمزی لە هەمان پاش نیوەڕۆدا بەجێی هێشتین. بۆ ئەو هیچ مەترسییەك لە گۆڕێ نەبوو لەبەرئەوەی بەکوردی دەدواو کەسیش حسێبی ئەوەی نەکردبوو یەکێك لەوانەی لەگەڵ ئەڵمانەکان خۆی بەپەراشووتهەڵداوە بەرەگەز کوردە. کورد، بەگشتی لە چیاو چۆڵی خۆیان بەدوور ناکەون لەبەر ئەوەی ئەوان لەو چیایانەدا هەست دەکەن لەزێدو مەفتەنی خۆیانن، بە سەروەڵ ئاسوودەیی دەژین. بەڵام هەنـدێـك جار هەڵدەکەوێ شێخێکی کورد لەناوچەی سەرسنوور بژیو پێوەندیی چاکیشی لەگەڵ شارستانێتی هەبێو کوڕێکی بنێرێتە بەغدا بۆ یەکێك لە خوێندنگا بەرزەکان، یان تەنانەت، بۆ نموونە یەکێکی وەکو رەمزی بنێرێتە زانستگا لە بێرووت یان ئەستەموول. زۆربەی جار ئەمـانــە پاشی تەواو کردنی خوێنـدیان دەگەڕێنەوە ماڵی باوکیان و سەرلەنوێ نەریت و خدووی جارانیان لەوێ هەڵدەگرنەوەو وا خۆیان دەنوێنن کەهیچ جارێك گوندیان بەجێ نەهێشتووە. بۆ نمـوونــە ئەمــانــە لە بێرووت بەشێـوەیەکی ناسك بە چەنگاڵ و چەقۆ شیو دەخۆن، بەڵام کاتێ دەگەڕێنەوە ووڵات زۆریان کەیف پێدێ ئەو شتە بێزارکەرانە لەبیری خۆیان ببەنەوە!

رەمزی لە ماڵەوە هێشتا بەئاشکرا خۆی پێشان نەدابوو، چونکە ئەو بەرەسمی ساڵێك لەمەوپێش چووبووە دەرەوەی ووڵات و، گەڕانەوەشی بێگومان بەرەسمیرانەگەیەنرابوو! دیارە هەموو کەسیش دەربارەی کەیو چۆن گەڕاوەتەوە دەکەونە پرسیارو، کۆمەڵی ڕێکوپێکی بەزەبت و رەپتی پۆلیسیش دەسبەجێ بڕیاری ئەوە دەدا کە دەبێ ئەم گەڕانەوەیە شتێکی تێدا هەبێ. بەڵام رەمزی لە گەڕان و سووڕانی ناو ووڵات هیچ مەترسیی نەبوو. تەنیا دەستاوێژێکی پێناسینی پێ دەویست، رەمزیش ئەمەی هەبوو.

ئەوە بوو رەمزی بەجێی هێشتین. کاتێ پاشی چەند رۆژێك پێك گەیشتینەوە بارو دۆخەکە تەواو جودا بوو. کەسمان پێشبینی ئەو نسکۆیەی نەکردبوو کە ئاوەها زوو هاتەرێمان، بەڵام رەمزی لە هەموو دەردەسەرییە بەرو دوای یەکەکاندا لەتەکمان وەستا. تەنانەت ئەویش لەئاکامی ئەو بارە بێریو دەروونییــەی دەبــوو پێیـدا تێپەڕێ بۆ ماوەیەك مێشکی تێك چوو هەرچەندە کە رۆڵەی هەڵکەوتەی لەبەزین نەهاتووی سروستیش بوو.

هەستی ئەوەی کە ئۆبـاڵی ئەو چارەکلۆڵییەی ئەو لە ئەستۆی منداٰیە، زۆر بەگرانی لەسەرم وەستا، ئەی ئەوە نەبوو من هاتنی ئەوم بۆ ئەڵمانیا سەروبەر کردو لەگەڵی دووام تا هاتە سەر ئەوەی بەگەڵمان بکەوێت؟ ئەی چەندین جار گفتی سەربەخۆبوونی ووڵاتەکەیم پێی نەدا؟

ئەو کاتــەی پاشی چەند ساڵێك تووشی یەکتر بووینەوە، زۆرم ترس هاتێ، لەدڵی خۆمدا گوتم: «ئەگەر بێو ئێستا وەکو پڵنگ راماڵت بدا و لە ئەوکت بگرێو فەراقی رەشت لێ ببڕێ، مافی خۆیەتی.» کەس ناتوانێ بڵێ کابرا بۆ وات کرد، من شایانی ئەوە بووم.

«رەمزی، من زۆر بەداخەوەم،» ئەوکاتە هەرهێندەمم بۆ گوترا.

«گوێ مەدێ، کاپتن، گوێ مەدێ، چیتر بیر لەمە مەکەوە،» بەو پەڕی خۆشەویستیو دۆستایەتی وەڵامی دامەوە.

چاوم پڕ بوو لەفـرمێسك. زمانم بەجۆرێك گیرا نەمتوانیی وەڵامی بدەمەوە. بۆ ئەوەی بەخۆدا نەشکێمەوە، وای پیشان دا چاوی لێم نەبووە.

# بەدیلگیران

پێش ئەوەی ڕەمزی بەجێمان بهێڵێ، دەمانزانی ڕۆژێکی گرانمان دێتە پێشەوە لەبەر ئەوە داوای لە دانیشتوانی زنجەکە کرد مەنجەڵێکی گەورە ئاوی گەرممان بۆ بهێنن بۆ ئەوەی بتوانین خۆمان بەچاکی بشۆین و برینی پێ و پلمان جارێکی تر پاك بکەینەوە.

دەتگوت لە نوێژەنەوە لەدایك بووینەتەوە. ئای لەو گەرماوە چاکەی کردمان. پێش ئەوەی بۆ حەشارگەی خۆمان بگەڕێینەوە لەوێ دانیشتبووین چامان دەخواردەوە، ئێشکگرەکەمان لەو کاتەدا کتوپڕ بە هەڵەداوان گەڕایەوە. هاواری دەکرد و دەستی هەڵدەوەشاند، ئاماژەی ئەولایەی دەکرد کە پێویست بوو خۆمانی تێدا بشارینەوە.

تەنیا یەك ووشەی لێ حاڵی بووین؛ تەنیا: «پۆلیس، پۆلیس»و هیچی‌تر. کەسمان نەدەبینی بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەڵمان کوتایە ناو ژاژەڵانێك و خۆمان بەپەلە شاردەوە. ئەشکەوتەکە شتێکی ئەوتۆی تێدا نەبوو بەڵگەی تێدا بوونی ئێمە ڕابگەیێنێ. بەردەوام وورده کەلوپەلەکانمان لەگەڵ خۆمان هەڵدەگرت.

وای بۆ چووین هەبێ و نەبێ ئەم پەلامارە کتوپڕە یەکێك بێ لەو پشکنینە ڕووالەتیانەی بەدوای ئێمەدا دەکرا، بێگومان بۆیان نەدەکرا تێکڕای خانە ژاژاڵانەکان بپشکنن. هێندەی پێ نەدەچوو دەڕۆیشتن و ئێمەش بەکەمێك ترس و لەرزەوە دەردەچووین.

چارەکە سەعاتێك ڕابرد ـ ماوەیەکی بێ کۆتایی بوو بۆ ئێمە ـ ئەوجا دەنگی سمی ئەسپ و هەراو چاوەجاوەمان هاتە گوێ. هەڵکورمام. بەئاواتم دەخواست زەوی هەڵم لووشێ. هەندێك جار دەنگەدەنگ لەلایەکەوە دەهاتنە گوێ و هەندێك جاریش لەلایەکی ترەوە. یەکێك بۆ ناو ژاژەکان هات و لێم نزیك بووەوە. دەمتوانی خشەی ئەو ژاژانە ببیستم کە وەبەر سمی ئەسپەکە دەکەوتن. ئەو کاتەم هاتەوە بیر لەناو فڕۆکەدا نزام دەخوێند یان ئەو کاتەی دەمویست خۆم بکوژم. دەستم بەناڕەقە دەردان و لەترسانە لەرزین کرد. مردنی بە سێدارە ئاکامێکی خۆش نەبوو! کاتێ بیرم لەوە کردەوە، خەریکە چارەنووس بەئەنجام دەگات و تۆڕی ڕووداو هەڵمان دەداتە ناو مردنێکی دژوارو گۆڕێکی هەتا هەتایەوە، ئیدی هیوڕتر بوومەوە. خۆم گرت بزانم چیی تر ڕوو دەدات.

پاشان وەکو ئەو جارەی ناو فڕۆکە دەستم کردە نزا خوێندن: «دەستم بگرە و ڕێم نیشاندە ـ ئەگەر بۆ سەرکەوتنیش نەبێت با بۆ گۆڕبێ. با وابێ بەڵام لەژێر سایەی تۆبێ.» لەناوەندی نزاخوێندن گوێم لە هاواری یەکێك بوو.

«وەرنە دەرەوە ئەگەر نا ئاگرتان دەدەین!»

لەو کاتەی لەبەرخوا دەپاڕامەوە چارەنووسم لە مستی خۆی بگرێ، بەخت هەرەسی هێنا.

یەکێك لە هاوڕێکانم هەستایەوە. ئەمە بەجێهێنانی ڕوا ئەرك و پێوەندی هاوڕێیەتی بوو. منیش هەستامەوە. سێیەمین هاوڕێشمان هەستایەوە. دەستمان هەڵبڕی.

پۆلیسی نیزامی چوار دەوریان گرتین، تفەنگیان لێ سوار کردین، بەڵام تەواوێك لێمانەوە دوور بوون. پیاو بەئاشکرایی هەستی دەکرد ئەمانە تەنگاون لەمەترسی ئەو گرفتانەی ڕەنگە ئەم ئەڵمانانە بینێنەوە. لێهاتوویی ئێمەیان لە شەڕدا بیستبوو. فەرمانیان پێدا ین‌چۆك دا بدەین بۆ ئەوەی

یەکێکیـان دەستمان لە پشتەوەرا ببەستێتەوە. ئەو کاتەی دەستی یەکەمین گیراوی بەستایەوە، بەئینگلیزی هاوارم کرد.

«ئـەو شتـەی ئێـوە دەیکـەن نارەوایە. نابێ ئێمە کەلەپچە بکرێن. ئێمە ئەفسەری ئەڵمانین، بەنهێنییەوە هاتووین. خۆتان چاك دەزانن ئێمە ئەفسەرین. بێ گومان بەرگە سوپاییەکانی ئێمەتان دۆزیوەتەوە.»

ئەو کاتـەی من هاوارم دەکرد، یەکێك دەیویست دەستم ببەستێتەوە. حەزم دەکرد بمرم نەك دەستم ببـەستـرێتـەوە. کەلەپچـەکـەم راتـەکـاندو بەختم یاربوو پێش ئەوەی بارەکە بئاڵۆزێ سەرپێچییەکەم کاری خۆی کرد. وابێ دەچوو پۆلیس ئەفسەری فەرماندەری تیپەکە لە ئینگلیزی بگات و دڵنیا نەبێ ئاخۆ ئەو شتەی من گوتم دەبێ شتێکی تێدا نەبوو بێ. هەرچۆنێك بێت ئاماژەی دەستت بەرڵلا کردنی ئێمەی کرد. هەستاینەوە، دەمانویست گەورەترین چێژ لەو سەربەستییەی لەو هەلەدا بۆمان هەڵکەوتبوو وەرگرین. دەستیان پێ بەرزکردینەوە. ئەو کاتەی خەریك بوون وەپێشمان دەن بزەخەندەیەکی بە گاڵتەمان هاتێ.

پۆلیس ئەفسـەرە عیراقییـەکـە زۆری شانازی بەوە دەهات کە لەسەرتاسەری عیراقدا خۆی توانیویەتی ئەڵمانە راکردووەکان دەسگیر بکات. بەو پەڕی بەخۆنازینەوەو بە سەرکەوتوویی سواری پشتی ئەسپەکەی بوو بوو. دەیویست بەچاکی سەرپەرشتیی گیراوەکانی بکات. لەوانەیە دڵنیابێ ستایشێك لە فەرماندەرە بەرزەکانی، یان تەنانەت میدالیایەکیش وەربگرێ. شتێك هەبوو دەیتوانی تەواوی لێ دڵنیابێت ئەویش ئەو پاداشتە بووکە بۆسەری ئێمە داندرابوو. ئەمە وێرای رەزامەندیی سەرکردە فەرماندەرەکەشی. نەیدەزانی پاشی چەند مانگێکی کەم بەهۆی گوێ بەفەرمان نەدانەوە پلەی دادەبەزێ.

بەلووتی بەرزەوە لە پێش ئەو پیاوەوە دەڕۆیشت کە خۆیو سەربازەکانیی بۆ سیەر ئێمە هێنابوو. ئاشکرا دیاربوو هیچ نرخێکی بۆ کابرا دانەدەناو بەچاوی سووکەوە سەیری دەکرد. ئەو پیاوە سەر بەدەستەی قاچاخچییەکان بوو. سەردەستەکە خۆی نەبوو بەڵام بەچاکی دەناسرایەوە کە ئەندامی ئەوتیپـە بوو. ئەو کاتـەی ئەوان دەچنە ناو شارەوەو شاریش لەو بەندو باوانەی دەربارەی ئێمە هەڵبەستراوە جمەی دێت و، بێ گومان ئەو دەستمزە گەورەیەشیان بەرگوێ دەکەوێ کە بۆسەری هەر یەکێـك لە ئێمە دانرابوو: ٢٥٠ پاوەن بۆ سـەری هەر یەکێمان، واتە ١٠٠٠ پاوەن بۆسـەری هەرچوارمان. ئەم پارەیە گەلێك لەوە پتر بوو لە ئێمەیان وەردەگرت. بۆیە بریار دەدەن هەموو شتێکی پیرۆز: دۆستایەتی، بەڵێن، وەفای خێلایەتی، بفرۆشن.

پاشی چەنـد سەعـاتێـك لە ژوورێکی بارەگـای پۆلیس لە هەولێر دانیشتبـووین. قەرەوێڵەی سەفەرییان بۆ هێنایین بۆ ئەوەی بە ئارەزووی خۆمان راکشێین و پشوو بدەین. هەروەها خواردنی چاکیان لە پێش دانایین. پاشان سەرتاشێکیان نارده لامان ریشی کوردانەی ئێمەیان پاك تاشیو ئێمەیان جارێکی تر بردەوە سەر نەریتی هاونیشتمانی ئەورووپایی. بەڵام هێشتا بەرگی کوردانەمان لەبەردا بوو. ئەوەی لە هەموو شتێك پتر نارەحەتی کردبووین ساغ نەبوونەوەی سۆراغی رەمزی بوو. سەیر بوو کەس لەبارەی کەسی چوارەمەوە پرسیاری لێ نەدەکردین. هەر چەندە زانیبوویان ئێمە چوار کەسین. دەبێ ئەویشیان دەسگیر کردبێ؟ ئایا دڵنیابوون لەو شتەی پێوەی بوون؟

هەڵوێستی پۆلیس دڵدەرەوەو بەبەزەیی بوو. هەموو شتێکیان دەکرد لە پێناوی ئەوەی لەو چەند سەعاتەی کەوتبووە پێش بەدەست ئینگلیز دانەوەمان، بەو پەڕی توانا دڵخۆشمان بکەن، دەیانزانی یەکێك لە ئاواتەکانی ئێمە سەرفرازیی کوردستان بووە.

ئێوارە منیان بردە دەرەوە بۆ ئەوەی لە شوێنێکی تری مەڵبەندی پۆلیس گفت و گۆیەکی ئاساییم لەگەڵ بکەن، ئەو پۆلیسەی بەگەڵم کەوتبوو بازووی تێ وەرهێنام، دەستی بۆ ئاسمان هەڵبری، خوای کردە شایەدی ئەوەی ملی بەبرین بچێ ئەگەر هیوای هەموو سەرەنجامێکی ناحەز بۆ ئینگلیز بەئاوات بەخوازێ کە ئەو کاتە وولاتیان لەژێر رکێفی خۆیان نابوو.

زۆرمان پێخۆش بوو چەند سەعاتێکی تریش پێکەوە دەبین، چونکە ئەگەر ئاڵۆز بوون و لك لێ بوونــەوە لە شایەدیو دەمودوامانمان هەبوایە ئەمە هێنان و بردنێکی زۆرتری بۆ ئەزموونداندمان دەنایەوەو دووچاری سەرئێشەیەکی بێ سوودی دەکردین.

کێ هەیە هێشتا هەناسەی بێت و بچێو، هیوای لەژیان برابێ؟ تەنانەت ئەوکاتەیٚ لەبەردەمی سێدارەش دەوەستێو پەت دەخرێتە گەردنی هێشتا هیوای بە پەرجووەکەیە. ئەوەکەی ئێمەش ئاوەهابوو. بڕیارمان دا بەسەرهاتمان ئەوەبێ کتوپڕ لە شوێنێکی چەوت کەوتووینەتە سەر زەویو ئێمە لە راستیدا نیازمان وابووە هیچ شتێك لەدژی عیراق نەکەین. کاری ئێمە لە کوردستانێ ئێران بووە، نیازمان ئەوە بووە، لەئێران بچینە پێش و کاتێ بۆیشمان دەرکەوت لە عیراق دابەزیووین، شتومەکمان بەجێ هێشتووەو دەرپەڕیووین.

ڕۆژێـك و دووان بەســەرچـوون. پاشــان بەیانیانێك لەناکاو دەرگا بەتوندی کرایەوەو یەکێك هەڵدرایــە ناو ژوورە نیـوە تاریکـەکەمانەوە، ئەمە ڕەمزی بوو، بەوێنەی داماوێك هەرگیز لەبیرم ناچێتــەوە: ڕەمــزی، کوری سەرۆك خێـل، مرۆڤێکی سەرئاسوودەو سەربڵند، بڕوابەخۆ، بەتێك شکاویو نیوە مردوویی، پیس و بەرگ دراو، بەچاوی پڕ لەخوێنەوە!.

هاوارم کرد. «ڕەمزی، ڕەمزی، ئەمەچییان لێ کردووی؟»

بەپەلەو سامگرتوویی، یەك لە دوای یەك سەیری کردین. سەرەتا ناڵەناڵێکی کردو پاشان نقومی بێدەنگی بوو. کاتێ بەخۆی هاتەوە کەیف شادبوو جارێکی تر لەگەڵ ئێمەدا تەنانەت لە تاڵترین و بێ هیواترین، جابەڕاستی بێهیواترین بارودۆخدا یەك بگرێتەوە.

گوتمــان «ڕەمزی، تۆ دۆستی بەڕاستیمانی. خۆزی بەخۆزیداران تۆ لەم چارەنووسە دەرباز دەبووی. زۆرت لە پێناوی ئێمەدا بەخت کردو ئێستاش هیچی ترت لە دەست نایەت.»

پاشــان خێرا خێرا بەســەرهاتی خۆی بۆمان گێرایەوە. وەك بڵێی ئەو شتەی ئەو دەیگێڕێتەوە ووتنێکی بەپەلە بوێ. دەتگوت ئێستا          تا ئێستا سەری لەدوو دەنێنەوەو لەم کونەوە بۆ ئەو کون شوونی هەڵدەگرنەوە.

گوتی: «تازە گەیشتبوومە هەولێر، کتوپڕ نەخۆش کەوتم، دڵم پێی گوتم مەترسییەکی گەورەم بۆ هاتۆتە بۆسە، هەر چەندە شتێکی ئەوتۆم بەچاو نەدیتبوو کە گومانم لەکن پەیدا بکا بەڵام هەستم دەکرد وا چاوی بەدکرداری لە هەموو لاوە سەرنجم لێدەدا. شەوم لەپەنای دەوەنێك بەسەربرد. توولەرێیەك لەو نزیکانە  هەبوو بەدرێژایی شەو ژمارەیەکی مشەی هاتوچۆکەرانی بەسەرەوە بوو. بەرێکایەکی ناڕاستەوخۆو بەسەر بەردو تاوێراندا خۆم گەیاندە ئەو ئامۆزایەم کەئێوە بینیووتان،

پێی گوتم پشکنینێکی ئەستوور بەدوای تۆدا دەستی پێکراوەو بەهیچ بارتێك ناتوانم لەلای ئەو بمێنمەوە چونکە پۆلیس هەستی پێدەکەن. گوتی پێم خۆشە گیانی خۆمت لەپێناو دابنێم بەڵام بۆ ئەم کاتە ژیرانەترین شت بۆ من ئەوەیە بچمە لای مامم و خۆم لەوێ بشارمەوە. ئەوە بوو بەدزییەوە خۆم گەیاندە ئەو مامەی هەمیشە خۆشی ویستووم. گوتم یان بمشارەوە یان ئەوەتە سەرەوەدەریکم بۆ بدۆزەوە.

پێتان وایە چیی پێ گوتبم باشە؟ بچمە نزیکترین مەڵبەندی پۆلیس و خۆم بەدەستەوە بدەم لەبەرئەوەی باوکم و برای گەورەم لەدوێنێوە گیراون و، لەلای ئەو پۆلیسانەی لەبەر دەستی ئینگلیز کاردەکەن دەست بەسەرن. هەر دەست بەسەریش دەبن هەتا ئەو کاتەی من دەسگیر دەکرێم. برادەرینــە ئێوە دەزانن (ئەبوو ـ باوك) بۆ ئێمەی رۆژهەڵاتیایی چییە!. ئیدی ئێوە دەتوانن تێ رابمێنن ئەو هەواڵەی مامم چەنــد جەرگبڕ بوو بۆ من، (ئەبوو)، ئاغا، لە گرتووخانەیە! یەکسەر بەراکردن چوومە مەڵبەندی پۆلیس.

رەمزی لەوێ لەبەردەممان وەستا بوو. بەلەنگاز و لەش تێکشکاو، هیچمان لە دەست نەدەهات دڵی ئەوی پێ بدەینەوە.

بەکورتی، پاشان ئێمەیان بردە مووسڵ و لە زیندانی ئینفرادییان دانان. ئەو دەستە جلکەی لەکـاتی راکـردن لەبەرمان بوو لەلایەن ئینگلیزەوە لێمان سەندرا. (سەرۆك هەرێمی عیراق) کە جەنەراڵێك بوو، یەك لەدوای یەك ئێمەیان بردە لای، دەیویست بەسەروبەری هەموو شتێك بکەوێ. ئەو سەربردەیەی لەمەڕ ئێرانەوە لەسەری رێك کەوتبووین بۆ ئەویشمان دووپات کردەوەوە. واپێ دەچوو کابرا بڕوا بکات.

بۆ بەیــانی، چوار ماشێنی بەریتانیی پڕ لە پۆلیسی سوپاوە هاتن، ئێمەیان بەرەو بەغدا برد. شێوەی گیران و ئەو پاسەوانییەی لە ئێمە گیرابوو وای دەگەیاند کە بەچاوێکی پڕ لەمەترسی سەیری ئێمە دەکرێ و ئەمەش بەکورتی وای دەردەخست کە پاشەرۆژێکی ناهەموارمان لە پێشە. لەبەغدا، سەرەتا ئێمەیان بردە زیندانی جودا جودا لە گرتووخانەی پۆلیس و، پاشان لەدوای چەند رۆژێك بۆ خانــوویکی بەغدایان گواستینەوە. لەراستیدا ئەو خانووە لەسەر شێوەی (ڤێللا) یەك بوو و بەپەلە کرابوو بە گرتووخانەیەکی تایبەت. منیان خستە ژوورێکی گەورەوە. ژوورەکە پەنجەرەیەکی گەورەو پانکەیەکی گەورەی لە ژێر میچەکەیدا هەبوو، بەڵام تەنیا تەنیا بووین، دەرگاکان شمشێرە دار بوون و بەقفڵی گەورە قایم کرابوون. وورده وورده دڵنیابووم کە مەبەستیـان ئەوە نییە پاشی چەند دەقیقەیەك یان تەنانەت پاشی چەند سەعاتێکش هەڵمان بواسن.

بیرەوەریــەکی ئازاردەری جاری پێشــووی بەغــدام بەتــونــدی سەرودڵی گرتم. بۆ سەردانی مەبەستێکی ناوەکی بانگهێشتن کرابووم بۆ ئەوەی ژیان و گوزەرانی بەندییەکان ببینم. ئەوانەیان نیشــانــدام کە بەژیــانی هەتــا سەر لە گرتــووخــانــە بەند کرابوون و ئەوانەیش کە چاوەنۆڕی جێبــەجێکـردنی فەرمانی لە سێدارەدان بوون و هەروەها ئەوانیش دەست و پێ بە کەلەپچەو کۆتەوە بوون. بێگومان دەبوو زیندانی لە سێدارەدانیش ببینم. زیندانەکە بریتی بوو لە کۆلیتێکی بچووك، جووتێك دەرگا ـ تەڵە (trapdoor)ی هەبوو وبە نوێڵێك کاریان دەکرد بۆ ئەوەی بۆ ژێرەوە بکـرێنــەوە. کاریتەیەك لەسەر زنجەکە هەبوو، چەنگاڵێکی پێوە بوو و شەش پەتیش بەدیوارەوە

هەڵواسرابوون. پەتەکان بەپێی باریکی و ئەستووری ڕێزکرابوون. باریکەکان بۆ پیاوی بچووك و بێ هێزو بوون، ئەستوورەکانیش بۆ پیاوی گران و بەکەلەش. ویستم ئەو بیرە لەمێشکم وەدەرنێم بەلام موچرکێکی سارد بە پشتمدا چووە خوارەوەو هەستم کرد ئەستەمە بۆم بکرێ بیری ئەو سێدارانە لە مێشکم ببەمە دەرەوە.

خواردنمان باش بوو، هەموو ڕۆژ لەلایەن خاوەنی ئوتێلەکەوە بەتایبەتی بۆ ئێمە دەهات. پێ دەچوو ئێمە لە عیراقدا وەك گیراوی بەناوبانگ مامڵەتان لەگەڵ بکرێ، هەرچەندەکە ئەو جودابیە کەمێکی زۆرکەم دڵخۆشیی دەدامێ. تەنیا کاتێ ژەم نەبێ کە قفڵەکە رادەمەژاو هەندێك ئەفسەری عیراقی یان ئینگلیـز یان هەندێك خەڵکی مەدەنی دەهاتنە ژوورەوە ئەوکاتانە خۆم کۆدەکردەوەو هەڵدەستـامەوە. دەمویست بەبارێك خۆم نیشاندەم کە ئیسپاتی بکەم وولاتەکەم بەچاکی هەڵی بژاردووم بۆ ئەوەی متمانەم پێبکا.

ڕۆژگـار درێـژو گەرم بوون، سەرەرای هەوای پانکەیش بەلام هێشتا گەرمییەکەی لەکێشدا نەبوو. سەرم دەسووڕا، بیرو هزرم بەردەوام دەگەرانەوە لەسەر تاکە پرسیارێك: چۆن دەبێ شتی ئاوەها ڕوو بدات؟ سەبارەت بەگەرما، نەشەوو نەرۆژ نووستن نەبوو و بەهیچ بارێکیش ئارەزووم لە خوێندنەوەی کتێب نەبوو. ئەم پرسیارە شەو و ڕۆژ لە هەموو شتێك پتری ئازار دەدام: چۆن ئێمە بەهـەڵە فرێدراینە سەرزەوی؟ هیچ پێوەندییەك نەبوو لەنێوان ئەو شتەی رووی داو ئەو شتەی بەئـاشکرا و بێ پێچ و پەنا لەگەڵ فرۆکەوانەکەدا لەسەری رێك کەوتبووم و، ئەویش بەبێ هیچ پێشگرو بەرهەڵستێك پەسندی کرد بوو وەك بڵێی ئەو شتانە هەر هەموویان سووك و هاسان بن. بەراستی، بەهۆی ڕێکەوتێکی نالەبارەوە هەموو شتێك بە بەرەواژی هاتە ڕوودان.

یەکەمین ڕێنوێنی لەسەری رێك کەوتبووین ئەوە بوو لەناوچەیەکی دوور لە ئاوەدانی فەڵدراین ئەی ئێمـە لەکـوێ هەڵدارین؟ لەسەر گوندێك. هەروەها ئەوەش روون کرابووەوە کەوا پێویستە لەنـاوچـەیەکی چیایی ٥٠ تا ٨٠ کیلۆمەتر دوور لەو ڕووبارەی دەرژێتەوە ناو (گۆلی ورمێ) وە هەڵبـدرێین، بەلام ئێمە لە نزیك ڕووبارێکی ناوچەیەکی دەشتانی هەڵدراین. هەروەها باشترین بەرزی خۆمانی لێوە هەڵدەین ٢٠٠ مەتر بوو بۆ ئەوەی لەنزیکی یەکتر بکەوینە سەر زەوی.

چەندی دەمکردو دەمکۆشا بیرم لەسەر ئەم شتە بگوازمەوە بەلام بێ سوود بوو. بیرم هەمیشە دەگـەرایـەوە سەر ئەو شتـەی بیرلێ کردنـەوەی بەدەستی خۆم نەبـوو، خۆزیـبـە خۆزیداران لێکدانەوەی ئەم نسکۆیەم بەدەستەوە دەهات ئیدی هەینێ دڵنیا دەبووم و ئەم بیرە ئازاردەرەی ئارامی لێ بریبووم بە ئاکامێك دەگەیشت. بەلام چەندی پرسیارم لە خۆم دووپات دەکردەوە، هۆیەکی ئەوتۆم نەدەدۆزیەوە .. تا پاشی دوو ساڵ لە دێرەکۆنەکەی Emmaus ئەفسەرێکی ئینگلیز لە کاتی ئەرکی ئیشکگرتنی خۆی بۆی باس کردم.

# مەعادی

## لەبەر سێبەری سێدارەدا

بەیانیانێك، پێمیان راگەیاند سەرۆك پۆلیسی عیراق كە جەنەراڵێك بوو، دێو دەیەوێ ووتوێژم لەگەڵدا بكات. ئەوەندەم گوێ بەم هەواڵە نەدا. هەرچەندە لە راستیشدا حەزم دەكرد شتێكی ئەوتۆ روو بدا خەیاڵ و بیری دوورو درێژم بپچرێنێ. پرسیاری ناوی ئەو جەنەراڵەم كرد. كاتێ زانیم ئینگلیزە لە شوێنی خۆم تاسـام. ئەو هێـزەی نیازمان بوو بیبەزێنین وا ئێستا بەسەر كەوت. ئەم دیمانەیە، رەفتارو زەپتو رەپتی ئاسنینی لێم دەویست

بەبـەرگی مەدەنییـەوە هات، دوو پۆلیسی عێراقیشی لەگـەڵ بوون. یەكێكیان بە ئینگلیزی دەدواو ئەویتریان بە عارەبی. ئیستا، جەولەیەكی بی برانەوە لە پرسیارو وەڵام دەستی پێ دەكرد. كەوتمە بەر دەستـرێژی پرسیاران، رۆژی یەكەم پێنج سەعاتی خایاندو رۆژی دووەم حەوت سەعات. سەرۆك پۆلیسی عیراق پیـاوێكی ژیرو لەكاری خۆ كەیشتبوو بوو. ئەمەش تەواو بوو، پاشان سێ هەفتـەی دوورو درێـژ ـ بێ ئەوەی هیچ تۆژینەوەم لەگەڵ بكرێت، بەسەرچوون. چەند جارێك ئەفسـەرێكی گەنجی ئینگلیز سەری لێدام و لەبارەی هەندێك بابەتی گشتی دەمودووی لەگەڵ كردم. بە ئەڵمانییەكی شێوە فینسیایی دەدوا. سۆسەی شتێكی مەترسیدارم لە چاوی دەكرد.

بەیانێك سەر لەزوو، كتوپڕ ئەو هەڵسوكەوتە بەرێزو ئەدەبەی عیراقییەكان لەگەڵ ئێمەیاندا دەكرد بەكـۆتـا هات. چەنـد سەربازێكی كەتەو تێكسمراوی ئینگلیز هەر لە شاگردە قەساب دەچوون هەڵیانكوتایە ژوورەوە، هەڵیان پێچام و فرەیاندامە ناو ئۆتۆمۆبیلەكە. ئۆتۆمۆبیلەكە، بە هاژووشتنی خێراو كوێرانە رۆیشت و پاشان كتوپڕ وەستا. دەمتوانی دەنگی ماشێنی فرۆكەیەك ببیستم و پێش ئەوەی بزانم لە كوێم لە پاشكـۆی فرۆكـەیەكی باربەرو لە نێوانی دوو پاسەوانیان دانیشاندم. دەرگاكان زوو پێوەدران و فرۆكە بەرۆیشتن كەوت. نەمدەزانی بەرمان بە كوێوەیە. بەڵام لێم روون بوو لێرە بەدواوە هەموو شتێك ئاڵۆز، زۆر ئاڵۆز دەبی.

دەمتوانی بەهۆی باری هەڵكەوتی هەتاوەوە بزانم رووكارمان بەرەو رۆژئاوایە. بە تی‌چاوێك سەیری دەرەوەم كردو زانیم بەسەر ناوچەیەكی ئاوەدانیی كەناری زەریاوە دەڕۆین. بەتیژی بەسـەر شاردا تێپەڕین و سێ نیشانەی زۆرناسراوم لەژێرەوە ناسییەوە:سێ پیرامیدەكەی جیزة (أهرامات الجیزة). دەبێ لەو ساتە رەنگ لە رووم پەڕیبێ لەبەر ئەوەی بۆم دەركەوت رووكارمان بەر بە كوێیە: بەرەو بارەگای سەركردایەتیی ئینگلیز لەرۆژهەڵاتی ناوەراست. لێتۆژینەوەی توندو تیژ لەوێ دێتە گۆڕێ و پاشان هەموو شت بەكۆتا دێت. دەمزانی هەر دەبێ «كۆتایی» بێت و چارەی نییە. چونكە لە هەلو مەرجی ئاوەها كۆماندۆزی ئینگلیز لە لایەن سوپای ئێمەوە دەدرانە بەر دەسترێژی گوللە. بریا پاشی گیرانم یەكێك فیشەكێكی پێوە دەنام و لەم سەرەنجامە ناهەموار و تاڵەی دەرباز دەكردم.

لە دەرەوەی قاهیرە نیشتینەوەو منیان بە سواریی ئۆتۆمۆبیلێك بردە ناو ئۆردووگایەك. رووبەری ئەو

ئۆردووگـایـە بەنـزیکەی بیست کیلۆمەتری چوارگۆشە دەبوو، پڕبوو لە باڵەخانەو داوو دەزگای سوپایی و گۆڕەپان و پاشان ژمارەیەکی بێ ئەندازی خانووی سوپایی دەهات. هەموو شوێنێك تەلبەند بوو. دەرگا کرایەوە، پاڵێکیان پێوەنام و لەبەر گرمو گەرماوی هەتاویان ڕاگرتم. زۆر تینوو بووم، ئەوا ئێستا لەبەر هەتاویشیان ڕاگرتبووم بۆ ئەوەی لەگەرمانە ببرژێم. داوای ئاوم کرد، بەتیزو گاڵتەوە وەڵامیان دامەوە. پەندێك لە کوردستان باوە دەڵێ ئەگەر ماریش لە ناو خواردنەوە بێت نابێ بیکـوژی. ڕۆژهـەڵاتییـایی ئاوەهـا بیردەکاتەوەو ئەوروپاییش ئەگەر تووڕە بوو بێ بەم شێوەیە بیردەکـاتەوە.لەخۆمم پرسی، ئایا ئەوروپایی بەڕاستی توانای خۆشەویستییان هەیە؟ پاشان ئەو ئەفـسـەرانەی دەبوو ووتوێژم لە گەڵ بکەن هاتنە لام. ئەم بارە حەوت مانگی خشتی خایاند. دەتوانم تەنیا ووشەی (گەوجایەتی) بەناوێك دابنێم بۆ ئەو هەموو مانگانە.

گەوجایەتی لەو ووتوویژانە باڵادەست بوو. پاشی ساڵێك جارێکی تر هەردوو هاوڕێیە لەشساغ و دەم بە پێکـەنـین و لێهـاتـووەکەی سەر بە کردەوەی (مامۆنت)م بینیەوە. ئەوانیشیان هێنابووە (مەعادی)و هەردووکیان شێت بوو بوون.

ڕەنگە زۆر لەوانەی ئەم کتێبە دەخوێننەوەو جاران لە هێزی ئەفەریقیا سەرباز بووبن و لەکاتی دیلیدا نێردرابنە مەعادی ئێستا لێتۆژینەوەی ئەو شوێنەیان لەبیر مابێت، بەڵام لەوانەیە لێتۆژینە لەگـەڵ ئەوان سووك و سادە بووبێ و تەنیـا بەمـەبـەستی وەرگرتنی ئەو زانیارییانە بووبێ کە سەربازێکی ئاسایی یان ئەفسەرێك دەیزانیو شایانی ئەوە بووبێ لێیان وەربگیرێ. بۆیە دەشێ جارێکی تر بیر لەو شوێنە ناهەموارو دڵتۆقینە نەکەنەوە. ئەندامانی ئەو یەکە کۆماندۆزیەی لەلایەن دەسەڵاتی هەرە بەرزی ئەڵمانیاوە فەرمانی کارو کردەوە درابوون بە شێوەیەکی جودا ڕەفتاریان لەگەڵ دەکرا.

هەرچـەند جارێکی دەربارەی گوزەرانی ناو ئەو زیندانە دڵتۆقێنانە پرسیارم لێ دەکرێ، ناتوانم بەزمان وەڵام بدەمەوە. هەرگیز بۆم ناکرێ بڵێم لەچی دەچوون. ئەو شتەی مرۆڤ شێت دەکا زەبرو زەنگ نییە. بێگومان زەبرو زەنگ هەبوو بەڵام بەشێوەیەکی زۆر سەرەتایی و ڕەمەکی بوو و تەنیا کاری لە مرۆڤی ترسنۆك و بێ ووره دەکرد. چەند جارێکیان دەکوتین و جەزرەبە دەدان، ئەوانیش بۆ ئەوەی جارێکی نەکوترێن پێیان لە هەموو شتێك دەنا. بەڵام لێدان و کوتان لەگەڵ هەندێکیتر بەپێچەوانەی ئەو مەبەستە دەکەوتەوەکە پسپۆری لێتۆژینەوە دەیویست بەدەستیانی بهێنێ. ئەو لێـدان و کوتانە دەبووە مایەی دروستبوونی بەرگری لەکن گیراو و ئەمەش بەپێچەوانەی نیازی لێتۆژەوە بوو. یەکەمین ووشە ئەفسەری ئەزموونەدەر بە گرژینەوەیەکی گاڵتەئامێز لە زیندان پێی گوتم ئەمە بوو:

« ئێمە زۆر بە چاکی شارەزای شێوەی لێتۆژینەوەی (OGPU) ی ڕووسیاین.»

پاشان بە دەنگێکی نەرم وەك ئەوەی شتێکی زۆر بێ بایەخ بڵێت، چرپاندی: «ئەرێ سووزانا شووم پێ ناکەیت؟»

پاشان ڕووی لێم گرژ کردو هیچی تری نەگوت. سەرەتا توانجێکی تێ گرتم. ئەمە ڕەفتارێکی ژیرانە بوو: ئافەرین بۆ خۆت و توانستت. بەڵام بەداخەوە تۆ ئەگەر ئەم هەموو شتانە بزانیت، باهەر لە نێوانی خۆمان بێت زۆر شتی تر هەن هەرگیز ناتوانی بیانزانیت. ئەگەر بەهۆی دەزگای بێتەلەوە،

بە مۆرسێکی بەپەلە ئامادەکراو پێوەندی بە هانرلەوە بکەیت، هەرچییەکت بوێ دەتوانی بیزانی هەروەها دەتوانی تێکرای تیپەکە بەداوو دەزگاوە بەدوای ئێمەوە بێنێ، ئەم شتە گومانی تێدا نییە.

لێتوژینەوەی بەندکراوان زانستێکە. زانستێکی زۆر تاوانبارانەیە بەڵام پیاو دەتوانێ فێری ببێ. لە راستیدا، فێربوونی ژمارەیەکی زۆری رێگاو شێوەیە. ئەگەر یەکێك لە سەرەتاوە بزانێ کام رێگا بە کەڵکی بارێکی تایبەت دێ ئەوا بەزوویی دەتوانێ مەبەستێ خۆی بەدەست بێنێ. ئەگەر نا ئەوە بەرژدیو رکابەری دەکەوێتە دوای ئەزموونی یەك لەدوای یەکی رێگاو شێوە. ئیدی بەندکراو واتــە گیـانی مرۆڤ هەمــوو رێگاکان دەئەزموونێ. گەورە یان بچووك، بەهێزو لاواز، چەربەزەو ساویلکــە، هەموویان (هەر هەموویان) لە لێتوژینەوەی ناو زیندان دواجار بەرپرسیاری خۆیان دەناسن. هەروەها هەموویان هۆشیان لەسەریان نامێنێ. بەکورتی، ئەزموونی درێژە دەکێشێ تا ئەوان گرەوی سەرکەوتن دەبەنەوە. سەرەتا بەندکراو بەنەرم و نیانی هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرێ و تا دەگاتە ئەوەی پێ لە هەموو شتێك دەنێ وەك پاشا دەیگوزەرێنێو هەرچییەکی بوێ دێتەجێ. پاشــان وەك تێکرای ئەوانتر دەردی سەگی دەردێتێ. یەکێکی تر خۆراکی لێ کەم دەکرێتەوە تا دەگاتە ئەوەی ووزەی دەروونیی بەرگەگرتنی هەرەس دێنێ.

هێشتنــەوەی بەنــدکــراوی خۆراگــر بۆ چەندین هەفتە یان چەندین مانگ لە تاریکیو نووتەکی باشترین چارەسەرە بۆ ئەوەی هەرەسی پێبێنن یان رێگایەکیتر، شەوێك کتوپر دەرگای زیندان بەراتەکاندنێك دەکرێتەوە. بەندکراو لەناو نوێنە، راماڵی بۆ دەبرێ، ملی دەگیرێو بەبەر جوێن و تێهەڵدان دەدرێ و پەلکێشی لای ئۆتۆمۆبیلێك دەکرێ. بە بێدەنگی بەرەو شوێنێکی چۆلی دەبەن. کەس ووڕتەی لەزاری دەرنایەت، پاشان فەرمانی دەدەنێ بێتە دەرەوەو لە بەرامبەریان بووەستێ، کۆمــەڵێك سەربازی چەك بەدەست رێز دەبن. فەرمان دەدرێ، ئەفسەرێکیش لەوێ دەوەستێو کاتژمێرێکی لەنێو دەستە «پاشی دوو دەقیقە هەمووتان گوللە باران دەکرێن»

ووچانێك بێدەنگی.

«ئەگەر شتێکتان هەیە بیڵێن»

«وا دەقیقەیەکی تریش بەسەر دەچێ. چل چرکە، سی، بیست.»

چەك بەرز دەکرێتەوە

«هیچی ترتان نییە بیڵێن؟ من تەنیا بەرژەوەندی ئێوەم دەوێ: دەتوانن ژیانی خۆتان بکرنەوە، ئێ، باشە، دە چرکە پێنج. ووریایی! ئاـ گـ ـ ر.. .هەی بەرازینە پێتان وابوو مردنێکی قارەمانانە دەمرن. نا.نا، برادەرینە. ئەمە تەنیا ئەزموونێك بوو بۆ ئەوەی بزانن چیمان بۆتان داناوەتەوە».

پاشان بەلێدان و کوتان نەفرەت و جوێنەوە جارێکی تر دەتهێنەوە زیندانەکەت.

لەوانــەیــە یەکێــك نهێنییــەکی هەبێو بەهیچ بارێك ئاشکرای نەکرد بێ و بەکەسیشی نەگوتبێو بەردەوام توژینەوەشی لەگەڵ بکرێ. پاشان کتوپر رۆژێك سەری سور دەمێنێ، خۆی بەخۆی دەڵێ ئەم نهێنییــە چییــەکــابــرا دەرووخێ، توانای بەرگریی نامێنێ ئەگەر بێو پیاوانی توژینەوە هیچ شتێکیان لەم بابەتەی ئەم بەکەسی نەگوتووە بەدەست نەکەوتبێ ئیدی باشترین شت ئەوەیە دان بە هەموو شتێکدا بنێو خۆی لە ئازارو جەزرەبە رزگار بکا.

بەڵام شتی وا چۆن روو دەدا؟ ئەدی لەوێ، لەزیندان، لەکاتی شێنەیی چەندین کەسی سەرنج ڕاکێشی ئەوتۆ لەو دەوروپشتە نین و پێشتر لە سێرك و تیاتر مەشقی بیرخوێندنەوەی خەڵك و نواندنی موگناتیسی و گەلێك شتی تری ئاوەهاییان نەکردووە؟ ئەمانە لەکاتی شەڕو لە تۆژینەوەکاری بەکاردێن.

یان دەتوانرێ دەرمانێکی‌نواندن‌بکرێتە ناو شیوی ئێوارەی یەکێکەوەو هەرچیەکی بوویستری لێی دەربهێنرێ. بۆ بەیانی هیچی بەبیر نایەتەوە. بەڵام لەکاتی نووستن هەرچی پرسیارێکی لێ بکرێ بێ سێودوو وەڵام دەداتەوە. ئەدی ئێستاش دەرمانی ئەوتۆ نییە یەکێکی پێ ببەزێندرێ؟

ڕێگـایـەکی تر، ترسـانـدنی جادووگـەرانەیە. هەر دڵنیێ بەرێکەوتە پشیلەیەکی رەشی گەورەی پرشنگدار لەبەر پەنجەرەی زیندان هەڵدەکونجێ. چەندن ئەوانەی بەهۆی‌جادووەوە هەرەس دێنن؟ کاتێك پشیلەی ڕەش لە سەرەتای دەست بە تۆژینەوە کردن دەبینن وا هەست دەکەن کار روو لە لێژییە.

خەفیەدانان لەگەڵ هەر کەسێکی ناو زیندان ڕێگایەکی چاکە بۆ هەڵفریواندن. من دوو کەسم لەم پیشەگەرانە بەچاوی خۆم بینیووە.

بە جلو بەرگێکی پیس و بێزەودرو تیتۆڵ بەتیتۆڵی دیلێتییەوە لە زیندانی خۆم ڕاکشابووم. هیچ شتێکم لە لانەبوو بخورێ، لەبرسانە لاکەی سەرم دەهات. بۆم نەدەکرا خۆم بکوژم هەر شتێکی بۆ ئەو مەبەستە دەستی بدایە لەوێ هەڵگیرابوو.

ئەو کاتــەی کەوتبوومەوە بەر ڕەشەبای لیتۆژینەوە، توانای دیتن و بیستنم بۆ ماوەیەك نەمابوو، ئەوەندەی نەمابوو ئاوەزیشم بشێوێ.

هەندێك شت هەبوون نەمدەویست بە هیچ بارێك ئاشکرایان بکەم. بەڵام ئەو کاتەی بۆم دەرکەوت ئینگلیـز لە بارەی (دەستـەی گشتی)ی ئێمەوە زانیارییان لەلاهەیە، هەر سەرم سوڕما. هەرگیز باوەڕم نەدەکرد توانای شتی ئاوەهایان هەبێ. ئەم جۆرە زانیارییانەیان چۆن دەست کەوتووە؟ زۆر جار ئەم پرسیارەم لەخۆم دووپات دەکردەوە دەبێ هەندێ شت لە بنچ و بناوانەوە بە چەوتی هاتبن.

دەمویست تا دەکرێ خۆم پەنا بدەم، تا لەم تەنگانەیە ڕێ دەردەبەم کات بگوزەرێنم. هەر ڕۆژێکی رادەبرد بەسەرکەوتنێکم دادەنا. هەرچەندە ڕۆژ بە ڕۆژ تۆژینەوە پتر تاوی دەساند بەڵام وێرای ئەمەش توانیم چەند هەفتەیەك بەسەر ببەم. پاشان ووردە ووردە بۆم دەرکەوت چەندی درۆ بکەم و خۆم بدزمەوە ڕۆژێك هەر دێت ڕاستیم بەڕوودا دەدرێتەوە. سەرەڕای ئەمەش بڕیارم دا ئەو شتە گرنگانە هێشتا بشارمەوە.

ڕۆژێکیـان منیـان بردە پێش دادگـایـەکی سوپـایی و بەبێ هیچ پرسیارو وەڵامێك فەرمانی لە سێدارەدانیان بۆ دەردەکردم. ئیدی وا مردن هاتە پێشەوە. خۆشم چاوەنۆری ئەمە بووم. بۆمن مردن گەلێك خۆشتر بوو بۆ تەواو بوونی هەموو شتێك نەك ئەم هەموو لیتۆژینەوەو هێنان و بردنە بێ برانــەوەیە. تەنیا بێزم لەو پەچە ڕەشە دەبووەوە کە دەبوو بۆ چوونە سەر سێدارە لە سەرو بەچەکەودی بپێچم، بیرم لەم شتانە دەکردەوە کاتێ سەرۆك ئەفسەری تۆژینەوە هاتە پێشەوەو پێی گوتم.

«له ئێستــا بەدواوە بە مردووت دادەنێــین. بەڵام تەنیا ئەو کاتەی توانیمان هەموو ئەو شتانەی پێویستمانە لێتی دەربێنین، هەڵت دەواسین. هەی بەرازی پیسکەی ئەڵمانی. لە ئێستاوە هەموو ڕێگایەکت لەگەڵ بەکاردێنین و تۆش هەر دەبێ بەزمان بێی. هەر ئەمەشت لەدەست ماوە.»
بەمستە کوڵەو تێهەڵدان بۆ زیندانیان ڕاپێچ دام.
ڕاست بوو، ئەو ڕێگایەی تا ئەو کاتە لەگەڵیان بەکارهێنابووم تەنیا گەمەی منداڵان بوو.
کاتێ گەیشتمە ئەو ڕادەیەی ئیتر نەتوانم بەرگەی لێتۆژینەوە بگرم، ڕێگایەکی چاکم دۆزیەوە بۆ ئەوەی ژیــانی خۆمی پێ ببــڕێنمــەوە. برینــەوەی ئەو ژیانەی چیتر ژیان نەبوو. وێڕای ئەمەش هاتبوومە سەر ئەو لێوارەی بەزەبری کوتەك ئەو نهێنییانەم لێ بستێنن پێشتر ئامازەم بۆ کردن. منیش نەمدەویست ئەم شتە بەهەرچی شێوەیەك بێت ڕووبدات: واچاترە بمرم. هەرچۆنێك بێت من فەرمانی مردنم دەرکراوە. لەبەر ئەمە واچاترە ئێستا بمرم پێش ئەوەی ئەم زانیارییە گرنگانەم لەزار دەربچێ.
بیکەم، یان نەیکەم؟ بە دوو سێ چرکە هەموو ئەشکەنجەو چەرمەسەرییەکم کۆتا دەبێ و منیش سەرفــراز دەبــم. بیرم لەوە کردەوە مرۆڤ دەستی ناچێتــە گیــانی خۆی بەڵام دوور نییــە لە هەلومەرجێکی وەك ئەوەی من، پێویست بێ بیکا.
گوێم لە ترپەی پێی سەربازان بوو لە دەرگای زیندانەکەی من نزیك کەوتنەوە. ئێستا نا ئێستا جارێکی ترم بۆ تۆژینەوە دەبەن. ئەگەر بمەوێ ژیانی خۆم تەواو بکەم دەبێ هەر ئێستا بیکەم. ململانەیەك کەوتە ناو مێشکمەوە. بەداماوی لەسەر نوێنە ڕەقەکەم ڕۆنیشتم و لەگەڵ خۆم کەوتمە مشتومڕ. خۆزگە یەك سات کاتێکی بە شێنەیی دەبوو بۆ ئەوەی ئەم بیرەمی تێدا تاوتوێ بکەم. ئەو کاتەی بیرو خەیاڵ وەك گەردەلوولە بەناو مێشکم پێچی دەدا، کەسایەتیو سەرکەشیم دەستیان بە هەڵوەشانەوە کرد. لەوێ دانیشتم بێ ئەوەی ووزەی نزاخوێندنیشم بەبەرەوە مابێ. تەنیا شتێك لە توانست هەبووبێ بیکەم ناڵەناڵێکی بێ هێزو کۆششێکی ماندووی گیانی خۆکێشان بوو، ئەمەش زۆر دوورە دەست بوو. هەستم کرد ئیدی سوودی نیە، دادم نادا.
پاشان لەنێو گرو کەڤ بیرو خەیاڵ وێنەیەکم هاتە بەرچاو، وێنەی ژنەکەم. لێی ناوڕامەوە، مەڕۆ بەجێم مەهێڵە. تاك و تەنیام، شکستە باڵم. دەمەوێ گیانی خۆم بکێشم. لە ترسانە و لەتاوی ئازاری گیانم وا دەگریم.
هاوارم کرد: «هەڵم گرە، لەگەڵ خۆت هەڵم گرە!» هەر هاوارم کرد.
وێنەکە بە جوانی و بێدەنگیو خۆشەویستی لە شوێنی خۆی وەستا بوو. ئەوە وێنەی ژنەکەم بوو. ژنە ئازیزەکەی خۆم. هەستامەوە پێ. زرمەی پێی پۆستاڵەکەم هاتەوە گوێ. لەبەردەرگاکەی من وەستابوون و دابوویانە بەر قۆنداغەی چەکەکانیان. ئێستا نا ئێستا شمشێرەی دەرگاکە دەکرایەوە «وەرە، هەی بێزووی بەخوێن» بە مستەکوڵەو تێهەڵدان و هەنگاوی گورج و خێرا، دوو سەرباز بەناو حەوشەدا پەلکێشیان دەکردم.
بەڵام نا، ئەمجارە بانگی دراوسێکەمیان کرد. ئەو بێ دەرتانە بە پێشیان کەوت و گوێم لێ بوو چەند جارێك ناڵەو هاواری لێ هەستا.
دەنگی گرمەژنی چەند گوللەیەکەم وەك چەندین جاری پێشووتر لە دەرەوەرا هاتە گوێ. لەدڵی

خۆمدا گوتم دەبێ ئەمجارە کێبێت؟ دەبێ جاری داهاتوو نۆرەی من بێت؟
نەخێر من فەرمانی لە سیدارە درانم بۆ دراوە. من گولله باران ناکرێم. بەڵام ئەدی ئەو دەسرۆکە. ئەو دەسرۆکـە دڵتـوقێنەی چەندی لێ دەترسم. خۆزگە دەمتوانی خۆم لەمەیان بدزمەوە. خۆزگە دەمتوانی بەبێ ئەم دەسرۆکە بمرم. بمتوانیایە ئاسمانی شین و هەتاو لەدوا هەناسەدا بەچاوی خۆم ببینم.
وێنـەی ژنـەکـەم دیـارییـەك بوو لەلایـەن خوداوە. وێنـەکە ڕۆیشت بەڵام پرشنگێکی هێمنیو ترووسکـەیـەکی کزی ڕووناکیی لەلا بەجێ هێشتم. وەك بێ ئەنوایەك خۆم بەم ترووسکەیەوە هەڵواسی. جارێکی تریش توانای بیرکردنەوەی بەشێنەییم بۆ گەڕایەوە. مەسەلەکە مەسەلەیەکی بەپەلە بوو، چی بکەم؟ بڕیارم دا جارێکیتر نەچمە لێتۆژینەوە. دەبوو دەست پێشکەری بکەم و گیانی خۆم بستێنم. ئیستا تیریژێکی باریك ـ بەڵام گەرمی ڕووناکی هاتە ناو زیندانەکەم و دەستی کردە ڕەواندنەوەی بێهیواییم هەروەها ئەو تیریژە هەتاوە بە ئاشکرایی تێی گەیاندم ئەرکی من چییە. دەبێ لە پێناوی ژن و منداڵ و خێزانەکەم بژیم . خێزان و وولاتەکەم پێویستیان پێمە. دەبێ ڕۆڵی خۆم لە ژیـان بگـێرم. ئایـا چەند شتی هەڵەم لەژیانی خۆم کردووە؟ بوومەتە مایەی چەند نارەوایی؟ چەند چاکەم بەنەکراوی بەجێ هێشتووە!
لەبیری خۆم گوتم خودای خۆشەویست، تۆ باهەر هەبیت بەڵام هیچ بایەخێکت بۆ من نییە. تەنیا تکای ئەوەت لێ دەکەم لەم ساتە تەنگانەیە گوێم بۆ ڕادێری. من لە ئێستاوە گفتی ئەوەت دەدەمێ دەستی نارەوا لەکاری تۆ وەرنەدەم . من دەستم ناچێتە گیانی خۆم. ئەگەر تۆش نیازی ئەوەتە من بمرم، تکای بەزەییو ڕەحمەت لێ ناکەم، بەڵام بمخەرە بەر مەرەبانیی خۆتەوەو لەگوناهەکانی ژیانم خۆشبە.
بەڵام ئەگەر دەلوێ سەردەمێکی تریشم ژیان بەدیاری بدەیتێ لەبنەبانی دڵەوە تکای ئەمەت لێ دەکەم. زۆر چاك ئاگام لەکەم و کەسریو چەوتی و چەوێڵیی خۆم هەیە. چەندین ساڵم پێ دەوێ بۆ ئەوەی تۆڵەیان بدەمەوە، شتەکان ڕاست بکەمەوە، فێرببم برادەرانی خۆمم خۆش بوێ، لایەنی ئامۆژگارییەکانت بگرم، ببمە پاکارت.
ئەم بڕیارە توندو تۆڵە وورەی بەبەرم هێنایەوەو بەئەسپایی لەسەرچۆکان هەستامەوە. بڕیارم دابـوو تا دواپشوو ملی ئەو ڕێگایە بگرم کەخۆم بە بێباکیو نەخشە دوورە دەستەکانی خۆمەوە لەسەر بنچینەی کە شوفشی سەرەڕۆمەوە بۆ خۆمم دارشتبوو. بەڵام ئێستا ناتوانم بەتاکە کەسیی خۆم بەم ڕێگایەدا بڕۆم. ئێستا بەو پەڕی بڕواوە خۆم و ژیانم لە پێناوی ئەو خوایە دادەنێم کە هەمـوو شتێـك لەمەڕ ئەوەو هەر خۆشی منی گووراندوەو ئەگەر مەیلیشی لێ بێ دەست بەباڵەوە دەگـرێ. تەنیـا داوای لێبووردنی ئەوەی لێ دەکەم کەوا هەموو ئەو ماوەیەی پێشوو پشتم پێی نەبەستبوو. جارێکی تریش نزام خوێند بەڵکو ئێستا دەستم بگرێو ڕێم پیشان بدات.
ئێستا بۆم دەرکەوت ئەم ئازارە بۆ من شتێکی پێویست بوو بۆ ئەوەی بەم دەرەنجامە بگەم لەبارەی خواوە. هەرگیز دەست هەڵگر نیم لەوەی لە بنەبانی دڵەوە سوپاسی ئەو خوایە بکەم کە فرسەتی نەدام لە ڕێگای خۆم بەردەوام بم، بگرە دوچاری گۆشەیەکی کردم و تەنانەت بۆ پێش سێدارەشی هێنام ـ تاگەیشتە ئەوەی بەسەر لاملو کەشوفشی رەگاژۆمدا سەربکەوێ. لە ئێستا بەدواوە گوێ

لە مستی ئەو دەبم و هەرچی چارەنووسێکیش ئەو بۆم هەڵبژێرێ بۆی لارەمل دەبم.

زۆر بە درەنگەوە پێکەوتم بەم رادە گەورەیە خوا لە ژیانی من تێکەڵە. لەیەکێك لەنامە بەراییەکانی ژنەکەمدا کە پاشی سێ ساڵ و نیو لە قاهیرە بەدەستم گەیشت، نووسیبووی:

«تکـایە پێم بڵێ لە فلان و فلان ڕۆژ چی ڕووی دەدا. جارێکیان لە گەڵ باوکم بەناو دارستانێك دەڕۆیشتین و لەپڕ ڕەشەبایەکی توند هەڵی کردو گێژیدام. دەنگی تۆم بە ئاشکرایی هاتە گوێ، بە تەنگەتاوی‌و بێ دەرەتانییەوە هاوارت دەکرد « هەڵم گرە، لەگەڵ خۆت هەڵم گرە!» بەخەیاڵی خۆم توند تۆم بە ئامێزەوە گوشی. کاتێك ڕەشەبایەکە نیشتەوە، هێندە بێ بڕست و ماندوو بووم دەمویست هەر لەوێ دانیشم و بنووم  کاتێ بەئاگا هاتمەوە بەباوکم گوت دەبێ تۆ لەم ساتەدا شتێکی گرانت بەسەر هاتبێ، بەهەموو بارێك دەبێ مردن ڕووی لێت نابێ.»

ڕاستی دەگوت، من مردم. منە لاسارە بێ خوایەکە مرد. ئیدی لەو ساتە بە دواوە بێ پشووهەوڵم دا ببم بەپاکارێکی چاکی خودا.

تۆژینەوە بە تەوژمی بێ ووچان و لێزانییەوە بەردەوام بوو، بەڵام ئێستا شتێکم لە ناوەوە هەبوو لە هیوابڕاویی دەپاراستم، ئەو شتەش هێزێك، هەستێکی پارێزراوی‌و، ئارامی و تەبایی ناوەکی بوو. ئەو شتە لە دواجاردا بە ئاشکرا دەرکەوت. ئیدی ئەو لێتۆژەوانە نەیانتوانی چیترم وابەئاسانی بەرزەوت بکەن. (بەم بۆنەیەوە یەکێك لەو لێتۆژەوانە ئەو پیاوە شێوە ئاخاوتن ڤینیسیاییە بوو چەند جارێك لە بەغدا سەری لێ دابووم.)

لە سەرچـاوەیـەکـەوە یارمـەتیم بۆ هات کە زۆرکەم چاوەنۆڕی بووم: ئەویش دوو دەسکیزە هاوزینـدانـەکـەم بوون. دوو کەسی هەتـا بڵێی فلێلبـازو فریـودەر بوون، پاشان چەندین جار سەرکـەوتنی فروفێڵی ئەوانم بیستەوە. بیر لە هەلومەرجی ئەو بە ندییە تێکشکاوە بکەوە چەندین مانگە تاکوتەنیایەو بیرو دەروونی لە بارێکدایە کاتێ بەندییەکی نوێ دەبرێتە ژوورەکەی ئەوپەڕی کەیفخـۆشی دایـدەگـرێ. ئەو بەندییە نرکە و ناڵەی لێ هەڵدەستێ‌و سکاڵای خۆی دەردەبڕێ‌و ووردایـەتیی هەنـدێـك شت ئاشکـرا دەکـات هێشتا پێی لێ نەناوە و داوای ئامۆژگاری دەکا. هەردووکیان زوو متمانە بەیەکتر دەکەن. ئیدی هەموو بەندییەکان دەکەونە ئەم داوەوەو درەنگیش پێ دەزانن.

کاتێ دوو هاوەڵە بەنـدییـەکانیان بۆ هێنام، لەسەرەتاوە لێیان بەترس و پارێز بووم. زوو بۆم دەرکـەوت کاری ئەمـانـە چییە، بەڵام نەمهێشت ئەوان هەست بکەن من دەزانم کاریان چییە. بەپێچـەوانەوە بەلای خۆمم ڕاکێشان. ئەرکی ئەوان ئەوەبوو شتی ڕاستییان بۆ دەربکەوێ‌و پێ بکەون ئایا ئەو شتانەی هەموو ئەو هەفتەو مانگانە لە ژێر تۆژینەوە دەیڵێم کت و مت ئەو شتانەن کە بەمتمانەوە بەوانی دەڵێم. هەمان ئەو شتانەم بۆ دووبارەکردنەوە جاران دەمگوتن وداد وسکاڵام کرد، کەس بڕوام پێ ناکات و لەیەکبینە ئازارو ئەشکەنجەم دەدەن، بەڵام لەڕاستیدا هیچ شتێکی ترم نییە دانی پێدا بنێم. دەمویست بڕوایان پێ بێنم ئەوەی لەژێر لێتۆژینەوە گوتوومن هەموویان ڕاستن و هیـچ شتی تر نەمـاوە لێمی وەربگـرن  بێ گومـان کاریگـەریێتی ئەو لێتۆژینەوە بێ بەزەییـانەی ئەو هەموو هەفتەو مانگە دژوارانەی پێیان تێپەڕیبووم هێشتا بەسەرمەوە مابوون.

مرۆڤ بەئاسانی مێشکی تێک ناچێ، کەوابێ باشترین قسە لەبارەی بەسەرهاتی تیپە چوارکەسییەکەی کردەوەی مامۆنتەوە مابێ بیکەم ئەوەیە هەروەکو گوتم دووان لە هاوڕێیانم بەراستی مێشکیان تێکچووبوو

بێ گومان تۆژینەوە کتوپڕ هەڵنەدەگیرا. ئینگلیز بەهەر ڕێگاو هۆیەکی لەبەر دەستیان بوایە هێشتا تێدەکۆشان بیرو دەروون و وورەم برووخێنن. شەرو گێچەڵم لەگەڵ دوو دەسکیزەکە چەندین مانگی خایاند و بەهەموو شێوەیەک دەکۆشان پشتم لە زەوی بدەن.

پاشان بەرەبەرە پاڵەپەستۆیان لە سەر هەڵگرتم و بەبێ گێچەڵ بە تەنیایی لە زیندانیان بەجێ هێشتم. چەندین مانگ رابردن، زیندانەکەم بوو بووە کلێسایەکی بچووک و تیشکی ئەمری گەرمی دەکردەوە. منی لە نوێژەنەوە لە دایک بوو، لەوێ هەنگاوی نوێم بەرێگایەکی نوێ هەڵدەهێنا. ئیدی وەرس نەدەبووم. کتێبم پێویست نەبوو. بیرو خەیاڵاتی خۆم بەشی دەکردم. بروام بە هەبوونی ئەو خوایەی ئاگای لە هەموو زیندەوەرێکەو لەگەڵ ئەوانەی رووی تێ دەکەن خۆشەویستی دەبەستێ، بەرە بەرە گەشەی دەکرد.

ئەو کاتەی تۆژینەوە تەواو بوون، پێم وابوو هێندە نابا فەرمانی لە سێدارەدانم جێ بەجێ دەکرێ. کاتێ دەرگای زیندان دەکرایەوە رادەچڵەکیم. وێرای باوەری نوێم بە خوا، چاوەنۆڕیی مردن لە ساتێکەوە بۆ ساتێکی ترو لە مانگێکەوە بۆ مانگێکی تر، کارێکی توندو نالەباری لە دەمارکرژیم کرد بەتایبەتیش لەبەر ئەوەی هێشتا لە سەرەتای ئەو باوەرە بووم.

## بەغدا

ئێوارەیەک لە پڕ دەرگای زیندانم بەسەردا کرایەوە، پاسەوانەکە لەوێ چاوەنۆڕم بوو پاشان ئەفسەرێک بە بەرگی مەدەنییەوە هاتە ژوورەوەو پێی گوتم بەگەڵیان بکەوم. بیرم کردەوە دەبێ ئەمە مانای چی بێت؟ ئایا ئێستایە؟

لە سەربازگەیان بردمە دەرەوە و بەسواری ئۆتۆمۆبیل بە ناو مەعادی و قاهیرەیان دا بردم. لە نێوانی دوو پاسەوانان سڕ بوو بووم. نەمدەزانی چیم بەسەردێ و بەرەو کوێ دەچم. رووناکیو خەڵکم بینی ! خەڵك! هێندەی نەمابوو لەبیرم بچێتەوە هاوەڵە گیانلەبەرە ئاساییەکانم چۆنن. سەرەرای باری گرانی مێشکی نالەبارم، بەڵام ئەو رۆژە کە جارێکی تریش خەڵکم تێدا بینییەوە وەك خۆشترین رۆژی ژیانم بەسەر برد.

بردمیانە گرتووخانەیەکی تا رادەیەك چێترو هەندێك خواردنیان وێ دام. پاش ئەوەی ئەو ماوە دوورو درێژە (ئالیك) یان لە دەفرێکی تەنەکەی ژەنگاوی دەدامێ، جارێکی تریش توانیم خواردن لەناو دەفری سپی و بە چەنگاڵ و چەقۆ بخۆم، سەمەرەیەك بوو بۆ خۆی. بەیانیی رۆژی دوایی سواری فرۆکەیان کردم و بەرەو شوێنێکی نەزانراو بەرێ کەوتم.

دواجار لە فرۆکەخانەیەك، لە بیابان نیشتینەوەو پاشی یەك سەعات هاژوانی تر بیینم وا لە بەغدا نزیك دەکەوینەوە. لە بنکەیەکی پۆلیسی عارەبی گیرساینەوە و بەشێوەیەکی رەسمی منیان گەیاندەوە میریی عیراق. وا دیار بوو عیراق منی بە بەندکراوی خۆی دادەناو بەشێوەیەکی کاتی و بەمەبەستی

لێتۆژینەوە منی دابووە ئینگلیزەکان. لەراستیدا ئەمە بوو هۆی ئەوەی ئینگلیز نەیاندەتوانی هەڵم بواسن. هەروەها زووش بۆم دەرکەوت کە هەرچەندە هێشتا شەڕ بەردەوام بوو بەڵام فەرمانی لە سێدارەدانی من لەلایەن عیراقەوە کاتی بەسەر چوو بوو.

ئێستـا ، ئێمـە وەکـو دەستبـەسـەر رەفتارمان لەگەڵ دەکرا. لەبەر ئەمە لە خانوویێکی چاك دروستکـراوی گەڕەکێکی نوێی بەغدا، لە خانوویێکی ستایل ڕۆژهەڵات ناوەراستی بەند کراین. بۆمن ، خۆشترین شت پاش ئەو ماوە درێژە بەندییەتیەی میسر جارێکی تریش تێر بە سکی خۆم نان بخۆم. هێشتا بە تەنیایی لە زیندان بووم و ژوورەکەشم بچووك بوو، بەڵام زوو کەیفشاد بووم کاتێ بۆم دەرکەوت هەردوو هاوەڵەکەشم لێرەبوون. لەبەر ئەوەی یەکێکیان تووشی ئەقل تێك چوون بوو بوو ڕێگای ئەوەیان دابوون پێکەوە بن، ئەمەش بۆ لەش ساغەکە بارگرانی بوو. هەر رەمزی نەبێ دیار نەبوو.

کەی بوو بۆ دواجـار بینیم؟ لەسـەربازگەی لێتۆژینەوە لە مەعادی. لەوێ شوێنێکی بچووك هەبوو؟ ئەوانەی کێشەی (زۆر گەورە) یان هەبوو ڕێگایان دەدرا دوو دوو بەجارێك مەشق بکەن. بە دیـوارێکی بەرزی لە گوش دروستکـراو لەیـەك جودا دەکـرانـەوە. لەبـەر ئەمە بەندکراوێك بەنـدکراوەکەی تری نەدەبینی. ڕۆژێکیان وا هەڵکەوت تیشکی هەتاو بەشێوەیەك دەکەوتە سەر گوشەکە دیوەکەی تری تەواو رووناك دەکردەوە. کابرایەکی باریك و بنێسی تێکشکاو بەلارەملی و هەنگـاوی لەرزۆکـەوە دەهـات و دەچـوو. قۆڵ و باسکی بەجۆرێك پێستەیان بەسەر ئێسکەوە نووسـابـوو بەزەییت پێ دەهـاتەوە. پێستەی بەرەنگی بەفر سپی هەڵاتبوو، نیشانەی ئەوە بوو چەنـدین مانـگ لە تەپانی بنی زیندان بووە. کاتێ ئەو پیاوە بەلەنگازە تێکشکاوە بەرەو لای من وەرچەرخا و بەرەو رووم هات، هاوارێکی ترش وتاڵ لەبەربینگم تاسا. بیرم کردەوە: رەمزی، هەی بێ دەرمتان! چییان بەسەر هێناوی ! فرمێسك بەخوڕ لە چاوم هاتە خوار. خودای بە بەزەیی یان خۆت گوتەنی (ئەڵڵا) دەست بە باڵتەوە بگرێ و لەم ساتە داماوییەت رزگاربکا ئاشکرا دیاربوو تۆژینەوە ئەویشی لە ئەقڵ بێبەری کردبوو.

چەند هەفتەیەك پاشتر پاسەوانە کەپێی گوتم رەمزیش لێرەیە. لەژوورێکی بەتەنیا بوو. لەهەمان کات پێ کەوتم هاورێیە نەساغەکەمانیان بۆ چارەسەر بردووە. تەنگاو بووم.

ڕۆژهەڵاتی ناوەراست ئەوروپا نییە و باوەڕم نەدەکرد دوکتۆرێکی ئێرە بتوانێ چارەسەرێکی ئەوتۆ بۆ ئەو بارە ئاڵۆزە بدۆزێتەوە. ئەم چارەسەرەی ئێرە تەنیا دەیتوانی بارەکە ئاڵۆزتر بکات. پێم وابوو دەتوانم یارییەیەکی چاکتری هاوەڵەکەم بدەم.

کەس پێی نەدەگوتم چۆنە، ئیدی دەستم کردە ئەوەی مان لەنان خواردن بگرم. مانگرتنێکی تەواو. نەنـان نەئـاوم وەرنـەدەگـرت. ڕۆژهەڵاتی ئەمەی بەلاوە گرنگ نییە: چەك بە رووی مرۆڤی بێ دەستەڵات هەڵدەکێشرێ. ئەفسـەر پۆلیسی ئێشکگر زۆری لێ کردم دەست لە مانگرتن هەڵبگرم وپێ گوتم ئەوا هاوەڵەکـەشم باشترین چارەی بۆ دەکرێ. داوام کرد بمباتە لای هاوەڵەکەم. ئەوەبوو بەڵێنی ڕۆژی پاشتری پێدام. هەر چەندە گفت و بەڵێن لە ڕۆژهەڵاتی ناوەراستدا بایەخێکی ئەوتۆی نییە. بەڵام وێڕای ئەمەش هەستێکی پڕ لە شانازیم لەلا دروست بوو کەوا لەو نەریتە رەمەکییەو لە

خەڵکی تر بەدەرو جودا دەبم.
هەر لە بەیانییەوە تا ئێوارە و پاشان ڕۆژی دواتر و داوتریش لەسەریەك تەفرەیان دام. بەڵام لە هەمان کات ڕێگایان دام بە ڕۆژەوە لەگەڵ هاوەڵەکانم بم. هەلێکی دڵخۆشکەر بوو جارێکی تریش یەك بگرینەوە. مایەی دڵخۆشیم بوو ڕەمزیش بەرە بەرە تەرازووی هۆشی هاوسەنگ دەبووەوە. پێشتر ئاماژەم کرد، بەیەك گەیشتنەوەی دوا جارمان شتێکی چەند جەرگڕ بوو، ڕەفتارو هەڵسوکەوتی ئەو چەندی کار تێ کردم.
کاتێ داوای لێبووردنم لێ کرد هەر ئەوەندەی گوت «گوێی مەدێ کاپتن، گوێی مەدێ». ئەمە بۆ ئەو کاری (قیسمەت ـ چارەنووس) بوو و شتێك نەبوو لێبووردنی بوێ.
ئەو پۆلیسەی خۆراکی بۆ هێناین، بە چرپە گوتی هاوەڵە نەخۆشەکەمان بەزنجیر بەستراوەتەوە. ئەمە زۆر بوو بۆ من، جارێکی تر مانم لە خواردن گرتەوە. هاوەڵەکانم لە یەکبینە دەنگوباسی منیان بە پاسەوانەکان ڕادەگەیاند و دەیانگوت جار لەجار باری نالەبارترە. بێ گومان زۆریان پێوە دەنا بەڵام تا بڵێی شتێکی ئەستەم بوو بتوانیت لە گەرمترین وەرزیساڵدا بەبێ ئاو هەڵ بکەی.
تەنیا بە وورەی خۆراگریو، هێمنایەتیی بیرو لەش توانیم دان بە خۆمدا بگرم. پاشی سێ ڕۆژ پێیان گوتین دوکتۆری سەرپەرشتیکەر دێ وهەموو زانیارییەکمان دەربارەی هاوەڵەکەمان و شێوەی چارەسەکردنی دەداتێ. ڕۆژووم شکاند بەڵام بە ڕاشکاوی پێم گوتن ئەگەر ئەم جارەش فریووم بدەن ئەوا دڵنیابن دەست پێ دەکەمەوەو جاری داهاتووشم زۆر بەراستی دەبێت
جا بەراستی ڕۆژی دوایی دوکتۆر هات. ڕ.ڵەتێکی ئەورووپاییانەو شێوە ئاخاوتنێکی ڤێنیسیانەی خۆشی هەبوو. دەرکەوت کابرا جوولەکەیەو کۆچی کردووەتە ئەمریکاو نەخۆشخانەیەکی ئەقڵ تێکچوونی لە ناوەڕاستی نیویۆرك هەیە. وەك دوکتۆری سوپای ئەمەریکی هاتبووە بەغدا بۆ ئەوەی بە شێوەی سەرەکی بۆ مەبەستی پروپاگەندە لە نەخۆشخانەی میری کار بکا و سەرکەوتنی گەورە گەورەشی بە دەست هێنا بوو. کەواتە هاوەڵەکەمان نوێترین چارەسەری بۆ دەکرا، لەسەر دەستی کەسێك لەوانەیە زەمینەیەکی چاکی ڕك وکینە لە دڵ هەڵگرتنی لە بەرامبەر ئەڵمانیادا هەبێ کە ئەویش جوولەکەیەکی کۆچکردووە. هەر چۆنێك بێت، دوکتۆرەکە بۆ پیشەی خۆی سەرڕاست بوو و هاوەڵەکەمانی بەبێ نیشانەی هیچ بوغزو کینەیەك چارەسەر دەکرد. ڕوونکردنەوەکەی ئەو، ئێمەی هێمن کردەوەو هیوای بەرزی سەرکەوتنمان بۆی خواست.
پاشی چل ڕۆژ. کابرایەکی هەڵئاوساوی ڕەنگ پەڕیوو لە نەخۆشخانە گەڕایەوە. لەوێ دانیشتبوو هیچی نەدەکرد، داماو و بیر بڵاو. بە خۆشەویستییەوە دەمانلاواندەوە بۆ ئەوەی دڵنەوایی بکەین و جارێکی تر بەکەیفی بێنینەوە. بەڵام کاتێ لەگەڵی دەدواین تەنیا سەرنجی دەداینێ، دەتوانم بڵێم هیچ تێ نەدەگەیشت.
بیرێکم بۆهات: ئەگەر بێتو چەند پارچە شیعرێکی کورت یان درێژی پێ ئەزبەر بکەم ڕەنگە سوودێکی هەبێت. پاشی کردو کۆششێکی زۆر ووردە ووردە کاری تێ کرد. دوواجار گەیشتە ڕادەیەك ئیدی جارێکی تر بیری تاریك نەبێتەوە. بگرە چوست و چالاك بێ و بابەتێکی لە مێشك بێت. بێ گومان بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ ووشیاری وچاپوکی و بەخۆوەنازین و گەشبینی ودەماغ بەرزیی جاری جارانی بەراورد نەدەکرا، بەڵام ناهەمواریيەکەی لە نێو چوو، سوپاس بۆ خوا.

مانەوەمان لە بەغدا شتێکی لەبارو گونجاو بوو ئەگەر هێندەمان پاسەوان وئیشکگر لەسەر نەبوایە. لە نێو ماڵەکە، لە هەیوانەکان وبەردەگاکان هەمیشە نزیکەی سی چل پاسەوانێك هەبوون و رۆژ بە رۆژ دەگۆڕان. خولیای ئەو پاسەوانانە ئەوە بوو باس و هەواڵی خەڵك بە دوورو درێژی بۆ یەکتر بگێڕنەوەو هەروەها بە دەنگی بەرزیش وەك لە رۆژهەڵات باوە. ئێمەی بەندکراو تەنیا بە دەست گەرمـا وهەراو زەنای رۆژگارەوە وەڕس نەبووین بگرە شەوانیش بە دەست جاوە جاوی جاڕس و وەڕسکەر خەومان نەبوو.

ئیدی هێندە بێزار بوو بووم، بە جۆرێك ئامادە بووم لە دەرفەتی تۆزو بایەکی داهاتوودا رابکەمە لای باڵیۆزخانەیەکی بێ لایەن وداوا بکەم بەڵێنێك لە نێوانی من و هاوەڵەکانم لەگەڵ میریی عێراقدا دابنێن بۆ ئەوەی هیچ نەبێ بتوانین شەوانە بنووین.

شتێکی خۆشمان لەبارەی ئەو ناوچەیەی لە بنەڕەتدا پێویست بوو لێی هەڵبدرێینە سەر زەوی لە یەکێك لە پاسەوانەکانەوە بیست. جارێکی تر بارە تراژیدییەکەی کردەوەکەی خۆمانمان بە روونی هاتەوە یاد. لە هەمان ئەو شوێنەدا و تەواو لەو کاتیش کە ئێمەی تێدا هەڵدراینە کوردستان، یا خیبوونێکی کورد دژی عارەب و دژی ئینگلیز لەوێ سەری هەڵدابوو. ئەگەر هەموو شتێك بە پێی نەخشە بەڕێوە بچووبایە ئەوا ئێمە لە جەرگەی یا خیبوونەکە دەکەوتینەوە. لە سایەی لێزانیمانەوە لە رێکوپێك کردن و چەك بەکارهێنانەوەو هەروا لە سایەی ئەو کەلوپەلانەی لەگەڵ خۆمانمان هێنا بوو و ئەو پێویستییانەی تر کە بە هۆی پێوەندیکردنی بە بێتەلەوەو، بە برێکی زۆر پێمان دەگەیشت، بە تەواوی دەمانتوانی ئاتاج وپێویستییەکانی ئەو یا خیبوونە دەستەبەر بکەین. ئەدی ئێمە هەموو شتێکمان بە پوختەیی ئامادە نەکرد بوو؟ ئەدی فڕۆکەی خۆمانمان نەبوو و چاوەنۆڕی بە بێتەل پێوەندیکردنی ئێمەوە نەبوو بۆ ئەوەی شتومەکمان بۆ بێنێ؟ ئەدی شوێنی نیشتنەوەی فڕۆکەمان خۆش نەکرد بوو؟

سەرباری هەمو شتێکی تر، ئێمە ئەو شتەمان بەکورد دەدا کە لەمێژە نەیان بوو، ئەو شتەی بوو بووە هۆی لەبـارچـوونی هەموو یاخیبوونەکانیان: ئامانجێکی تێکرایی، ئامانجی کوردستانێکی سەرفرازو یەکگرتوو. ناو بەناو خێڵێك دەیویست سەرفرازی بە دەست بێنێ بەڵام بەهۆی سروشتی خێڵەکـایـەتیو دەرەبەگایەتیی وڵاتەکەوە هێشتا هەلی راپەڕینێکی سەرتاسەری هەڵنەکەوتبوو. هەروەهـا هێشتا دەرفەت نەگونجا بوو بۆ ئەوەی تاکە سەرۆك خێڵێك بە سەرۆکی تێکرای کورد بناسرێ، تەنیا سەرۆك خێڵێك تا ئێستا توانیبێتی بەشی هەر گەورەی ناوچەکە بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوەو سەربەخۆیی بەدەست بێنێ ئەوە شێخ مەحموود بووە. تا ئەو کاتەش هەر بە مەلیکی کوردستان دەناسرا. بەڵام ناوچەی دەسەڵاتی ئەو سەر بە عێراق بوو کەچی وڵاتی کورد بەرەو ناو ئێران وتورکیاش درێژەی دەکێشا.

بە هانـدانی راپەڕینێکی گشتی ودانانی سەرکردایەتییەك لەسەر بناوانی هاوبەشی، دەمانتوانی یاریدەی کوردان بدەین لە پێناو سەرفرازییان و، ئەوانیش یاریدەی ئێمە بدەن بۆ بە دەست هێنانی ئامانجی خۆمان.

ئێستا ئێمە دەمانزانی چارەنووس لە هەوەڵکۆوە بەرەوازی هێنا. ئاگری یاخیبوونەکە لە رۆژهەڵاتی

ناوەراست بۆ سوودی ئەڵمانیا هەڵنەگیرسابوو، هەر چەندە لێوەی نزیك بوو. لە چارەی کردەوەکەمان نووسرابوو شکست بێنێ وەك چۆن لە چارەی ئەڵمانیا نووسرابوو شەڕ بدۆڕێنێ..

زۆرمان کەیف بەوە هات کە زانیمان ئەو ئەفسەرەی بەرپرسی تیپە پۆلیسەکەی پاسەوانیکردنی ئێمە بوو لەکاتی هەڵگیرسانی یاخیبوونەکە لەگەڵ پیاوەکانیدا نێردرا بووە کوردستان.

لەراستیدا ئەو یاخیبوونە چەند مانگێك درێژەی کێشا هەتا ئەوەی کوردچەك و زەخیرەیان مابوو. بەڵام کەس نەبوو یارمەتییان بۆ بنێرێ لە بەرئەوە پاشەکشەیان کرد بوو و خۆیان لە چیا ئاسێیەکان شارد بووەوە. لە بەر ئەوەی پۆلیس زۆریان ڕێز لەو چەتەو نیشان ئەنگێوانە نابوو، تا ئەوپەڕی نەرمییان لەگەڵ بەکار هاتبوو، بەڵام هەر ئەوەندەی لە بەر دەستریژی ئەوان دەرچوو بوون ئیتر چیرۆکی ئەوتـۆیـان لەبـارەی شەڕو سەرکـەوتنی خۆیـان دەگـێڕایـەوە شەبکـەداری زەویی ژوورەکـانیشیـان دەهێنایە لەرزە. بۆمانیان گێڕایەوە چۆن پۆلیس ئەفسەرەکەی لەمەر خۆشمان گیـانی خۆی رزگـار کردبـوو. لەسـەر چیـایـان تووشی هەترەش چوونێك دەبێ تەنانەت کوردە یاخیبووەکانیش گوێیان لەم دڵتۆقین و ترس و لەرزە بێ ئەندازەیە دەبێ و بەزیرەکیو شارەزایی خۆیان شەوێك دەردەچن بۆ ئەوەی بیگرن. ئیدی کابرا ڕووت و قووت دەکەنەوەو بە نوێژی نیوەرۆ بەرەڵڵای دەکەن بۆ ئەوەی بگەرێتەوە لای پیاوەکانی.

دوای چەند ڕۆژێك رەمزی گەرایەوە سەر باری جارانی. کاتێ ڕێگایان دەدا ین بە ڕۆژەوە لەگەڵ یەکتر بین، کاتمان بەوە بەسەر دەبرد چیرۆك بۆ یەکتر بگێرینەوە. ئەو چیرۆکانەی زۆرمان پێ خۆش بوون ئەوانـە بوون رەمزی لە بارەی وڵاتی خۆیەوە بۆی دەگێڕاینەوە،کوردستان، ئەو وڵاتەی چەندین ساڵ بوو دەمناسیو فێر بووبووم خۆشم بوێ، وا ئێستا گوێم بۆ یەکێك لە هەرە چاکترین ڕۆڵە سەربەزەکانی شل دەکرد. نەریت و رەوشتی خێڵە جیاجیاکانی بۆ باس دەکردین، دوژمنایەتی و تۆڵەساندن و قارمانیەتیی ئەوانی بۆ دەگێڕاینەوە، دەربارەی ئایین و تیرە ئایینیە جیاجیاکان و سەرچاوەی کانزاو ڕێگای پەرەپێد انیان دەدوا. ئیدی ئەوا جارێکی تریش هاتینەوە ناوەندی بابەتی ژمـارە یەك: پەرەپێـد انی کوردستان. نەخشەو پێشنیازی دادەنا، ئێرە دەکەینە دارستان، لەوێ شەقام دەکێشین، بریارمان دەدا شار لە کوێ دەبێت، بنکەی بازرگانیو کەلتووری لە کوێ دەبن.

باك گراوندی ئەو کاتە پڕ لەشادییەمان لەلایەن کوردێکەوە دروست بوو بوو کە بە هەر شێوەیەك بێت هاتبوو و بوو بووە پۆلیس. دەیویست سڵاوی نیشتمان بە رەمزی رابگەیێنێ. لە سووچێکی حەوشەکەی ژێرەوە هەڵدەکونجاو چەندین سەعات لە یەك پشوو داستانی ئەوین ولاوکی کورد انەی دەژەنـد. ئەو ئاوازانـەی بە شمشاڵی شوانانەی کوردو بەشێوەیەکی زۆر تایبەت دەژەند. کاکی شمشـاڵژەن دەیتوانی نیو سەعاتی تەواو لەیەك پشوو بژەنێ. تەنانەت لە نێوانی (نۆتە) کانیش پشووی نەدەدا، لە بەر ئەوە ووچانی تەواوی لەنێوانی هەناسە وەرگرتن و هەناسەدانەوەدا نەبوو. ئیدی هەر دەیژەند و دەیژند، بە هونەرێك هەرگیز نەمدەتوانی سەرم لێی دەربچێ.

بۆ گوێی ئەورووپایی ئەستەمە بتوانێ خۆی لەگەڵ مۆسیقای تورك یان عارەبدا بسازێنێ کە بۆ ئێمە تەواو نەساز و ناناشنایە. بەڵام هەرچۆنێك بێت لەگەڵ مۆسیقای کوردی دەهاتینە جۆش. لە راستیدا ئەو مۆسیقایە لەگەڵ مۆسیقای ئێمە جودا بوو بەڵام هەستمان دەکرد جۆرە پێوەندێکیش

هەیە، چونکە کوردیش وەکو ئەوروپایی لە نەژادی هیندۆ ـ ئەوروپایین. هەروەها زمانی کوردیش لەگەڵ زمانی ئێمە پێوەندیی هەیە بەڵام زمانی عارەبی هیچ پێوەندیکی لەگەڵ ئەڵمانی نییە. (دا)ی کورد واتە (یا) بە ئەڵمانی، (نۆ) واتە (ناین)؛ (مادەر) واتە (ماتەر)؛ (پێدەر) واتە (فاتەر)*. ووشەی (ئەبو) لە عەرەبییەوە وەرگیراوە.

کاتێ پۆلیسە کوردەکە شمشاڵە شوانانییەکەی دەژەند، بیرو خەیاڵ رەمزی‌یان هەڵدەگرت، چەندین میل دووریان دەبرد، خەونی بە کەژوکێوە چۆڵەکانی کوردستان و گوند سەرەتاییەکانیەوە دەبینی. وێرای هەموو شتێك ئەمانە چیای (ئەو) و گوندی (ئەو) بوون. ئەو خوشك و برایانەی کە خۆی لە پێناویان هێنایە بەر پەتی سێدارە لەوێ دەژیان. رۆژێکیان، رەمزی لە کاتی نانی نیوەرۆ بە راکردن هاتە ژوورەکەم وماڵئاوایی لێ کردم. دەیانبردە گرتووخانەیەکی عیراق. تەنیا کاتی ئەوەم هەبوو دەستی بگرم و بە قووڵی لەچاوانی رابمێنم. پاشان لێیدا رۆیشت.

«خوا دەست بە باڵتەوە بگرێ، خوابە فریاتەوە بێ، خوات لەگەڵ بێ، رەمزی،» بە هەموو دڵەوە لە دوایەوە هاوارم کرد. بە درەنگەوە پێم زانی کە رەمزی بە تۆمەتی ناپاکی لە نیشتمان، بیست ساڵی خشت بەندیی لەلایەن (دادگایەکی سوپایی عیراقەوە) بۆ براوەتەوە. کاتێ زانیم ئەو دۆستە لە دڵ شیرینەمان جارێکی تریش تووشی ئەقڵ شێوان دەبێتەوە، زۆری پێ غەمبار بووم.

بەڵام دیارە لەگەڵ کۆتا بوونی شەر رەمزیش بەبەر لێبووردن دەکەوت و جارێکی تر دەگەرایەوە نیشتمانی خۆی. ئیدی ئەو کاتە قارەمانیەتیی ئەو لە سەرتاسەری وڵات دەنگی دادەیەوە، تەنانەت نەخشەی بە دیهێنانی سەرفرازیی کوردستان هەرچەندە سەریش نەکەوتبوو، دەکەوتە سەر زاری سەرپاکی کوردان.

---

★ میوولەر بە هەڵە ئەم وشانە بە کوردی دەزانێ. دیارە ئەمانە کوردی نین (وەرگێر)

## لە خاکی پیرۆزدا

پاش ئەوەی رەمزی‌یان بردە بەردەمی دادگای سوپایی، هێندەی نەبرد جارێکی تریش ئێمە لەلایەن ئینگیزەوە دوور خراینەوە، ئەمجارە هەموومان لە ناو یەك فرۆکەدا. ساڵێك بوو لە بەغدا لە گرتووخانە بووین و گەلێکمان پێخۆش بوو ئەو سەردەمە دڵتۆقێن ومێشك ئازاردەرە بەرێ بکەین. لە فرۆکەخانەی (لود ـ Lydda ) لە فەلەستین نیشتینەوە. ئێمەیان هاوێشتە ناو ماشێنێکی باربەری داخراو و گەشتێکی درێژخایەنمان بە تولەرێیەکی بەربەیاری ناو وڵات دەست پێ کرد. جارێك لە رێگا هەڵوەستاین و پاشان بەرێ کەوتینەوە. هەندێك جار بەرێگای مەیلەو باش وهەندێك جاریش بە رێچکۆڵەی نالەبار. نزیکەی سەعاتێکمان بە رێگاوە بەسەر برد تا ئەوەی لە پێش باڵەخانەیەکی بەردینی گەورەدا وەستاین، بە تۆرێکی تەلبەند چواردەوری گیرابوو. دەروازەکەی لەسەر پشت بوو، ئێمەش چووینە ژوورەوە بۆ ئەوەی جارێکی تریش ببینەوە دیلی ئینگلیز.

ئەو شوێنە کوێ بوو، ئێمە نەماندەزانی. ناوی ئەو شوێنە بۆ ئێمە شاراوە بوو. باڵەخانەکە نزیکەی دوو سەد بەندیی تێدا بوو. شوێنێکی لاچەپی تایبەتی هەبوو بۆ ئەوانەی کێشەیان گران

بوو. هەندێك كەس لە مێژە لەوێ بوون و پاشان برێكی پتر خەڵكیان هێنا. زۆری نەبرد بووینە چل كەس و لە ژوورێكی بچووكی تەنگەبەر مۆڵ دراین و چواردە مانگی تێدا ماینەوە. ئێمە لەگەڵ خەڵكەكەی تری ئەوێ تەواو جودا كرابووینەوە.

لەناو تاوەیەكی سوورەوە بوودا خرابووینە سەر ئاگر. راستە ژاوە ژاوی پۆلیسمان لێرە لە كۆڵ بوو بووەوە، بەڵام خەڵكێكی هێندە زۆر لە ناو ژوورێكی وا بچووك مۆڵ درابووین تەنانەت بەرزترین وورەی دنیاش نەیدەتوانی خۆی لە تێكەڵاوی كردن ببوێرێ. هەوایەكی درژو توندی ئەنجام پێشبینیكراوی هەبوو. ناهەموارترین شێوەی گرتووخانە بوو، پەنجەرەكانی بە دوو چین تۆرە سیمی باریكی تێكچرژاوی ئەو تۆ گیرابوو، پیاو تەنیا ئەو كاتە دەیتوانی دەرەوە بەدی بكات ئەگەر سەری بە پەنجەرەكەوە بنووساندایە.

بۆ بەسەر بردنی كات هەر شتێكی بۆمان بلوایە دەمانكرد. دەرسی زمانمان بەیەكتر دەدا: فارسی، فرەنسی، رووسی. هەركەسەو بە هەموو تواناوە دەیویست خۆی خەریك بكات.

رۆژێك، لە ناكاو یەكێكی ژوورەكەمان لە خۆی هەڵدا:

«هەمووتان وەرن، دەزانن ئێمە لە كوێین؟»

چاومان تێی بڕی! بەراستی، ئەمە ئەو شتەبووكە لە مێژبوو بە هیوای زانینی بووین: «لە ئیماوسین Emmaus» گوتی. «لەبیرتانە (دوو كوڕی گەنج بۆ ئیماوس چوون».

«ئیماووس» پرسیمان. رۆژنامەیەكی لە گیرفانی دەرهێناو رایكردە لای پەنجەرەیەك «ئێرە، سەیری ئەم وێنەیە بكەن: ئەم سوورە تووە، ئەم گەرماوە، ئەم دارستانە سەروو وە. كتومت ئەوەی دەرەوەیە.»

راستی دەكرد ئێمە لە ئیماوس بووین. ئەم دۆزینەوەیە بۆ من مایەی سەر سورمان بوو. بۆم دەركەوت چەند ساڵێك لەمەو پێش هاتبوومە ئەم خانووە. لە ئورشەلیم (قدس)ەوە هاتمە ئیماوس و لە هەمان ئەم ژوورانەی ئێستا تیایدا بەند كراوین لە میوانداریی باوە میوولەری سەرۆك (دێر) نانم خوارد وكاتی بە خۆشیم رابوارد. ژوورەكان بەم بارە نالەبارەیانەوە نەدەناسرانەوەو دیارە رەبەنەكان لەگەڵ دەست پێكردنی شەڕ چۆڵیان كردبوو. دێرەكە بوو بووە ئۆردووگای بەدیلگیراوان. ئەمە ئەو شوێنە بوو ئینگلیز ئەوانەیان تێدا بەند دەكرد كە سەروبەریان تەواو روون نەبوو، هەروا ئەوانەی بە شێوەی نایاسایی هاتبوونە فەلەستین، بەڵام سەر بەهیچ هێزێكی دوژمن و ناحەز نەبوون، بۆ نموونە: تورك، گریك، هتد. سەرەرای ئەمانە، دەسەڵاتدارانی عارەب، درووز و كورد، ئەوانەی گومانی ئەوەیان لێ دەكرا بە بیروباوەر دژی ئینگلیزبن، لێرە بوون. هەروەها چەند كاربە دەستێكی باڵیۆزخانەكانی ئەڵمانیا بە تەفرەو بەڵێنی بە درۆ هێنرابوونە ناوچەی ژێردەستی ئینگلیزو پاشان بەشێوەی نایاسایی وەك گومان لێكراوی تر دەست بەسەركرا بوون.

پیاو دەتوانێ تێ بفكرێ ئەگەر ئەو هەموو خەڵكە جودا جودایە بە زۆری زۆرداریەكی ناچاری پێكەوەژیان بكرێن دەبێ چی روو بدا. زۆربەی ئەمانە خەڵكی رۆژهەڵاتی ناوەراست بوون. كوری سروشت بوون، نەریت و خدووی نیشتمانی خۆیان تەنیا لە چیاو بیابانان دەناسی. رۆژێك، كابرایەكی عارەب هەست دەكات پیاوێكی سەر بە هێزی داگیركەری ناو ئەم ئۆردووگایە سووكایەتیی پێ كردووە. كابرا دەچێ چوار مێردەكی لەسەر جێو بالینگانی خۆی دادەنیشێ. بێ

دەنگ و دۆش دابردوو، لە تووڕەییان سوور سوور هەڵدەگەڕێ. چەپڵەیەک دەکێشێ و بانگ دەکا:

«حەسەن !»

پاشان چەپڵەیەکی‌تر دەکێشێ‌و بانگ دەکا

«ئیبراهیم!»

کوڕەکانی دێن و لە بەردەمی کڕنووش دەبەن، دەست دەخەنە سەرسنگ و ناوچەوان. باوکە ئاماژەی ئەو پیاوە دەکا کە سوکایەتیی پێ کردبوو. کابراش وەک نەبای دیبێ‌و نە باران، لە پەنایەک دانیشتبوو موتالای دەکرد. باوکە بە کورتی پێی گوتن:

«هەڵیواسن.»

حەسەن و ئیبراهیم بەلارەملی هاتن و شتێکی لە باریان دۆزییەوە. قوڵفێکیان لێ دروست کردو بە کاریتەی سەر دەروازەکەیانەوە هەڵواسی. دەروازەکە لە سەرپشت بوو. پاشان هەردووکیان ڕۆیشتنە لای کابرای لە پەنا دانیشتوو و حەسەن شتێکی پەستایە ناو دەمی کابراو ئیبراهیمیش پەلکێشی لای دەروازەکەی کرد. هەر زوو قوڵفیان خستە ملی کابراوەو حەسەن کابرای بۆ سەرەوە هەڵکێشا. بەرێکەوت ئێشککرێک بەو ناوەدا ڕابرد، دەمانچەی هەڵکێشاو لە حەسەن و ئیبراهیمی شڵەژاوی ڕاخوڕی. ئەوانیش بە ناچاری نێچیرەکەیان دابەزاند. زۆریان پێ ستەم بوو نەیانتوانی فەرمایشتی (ئەبوو - باوە) یان بەجێ بێنن.

ئەو شتانەی پێوەندییان بە ئۆردووگاو دانیشتووی ناوییەوە هەبوو، بێ گومان من زۆر بەدرەنگەوە پێم زانین. ماوەیەکی کەم بەر لەوەی بەسواریی پاپۆڕ لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٥دا بمانبەنە ئۆردوو - گرتووخانەیەکی شەهر لە میسر ڕێگایان پێ داین لەگەڵ گیراوانی تری ناو ئۆردووگایەکە تێکەڵ ببین. هەروەها وەکو ئەوانیتر دەرفەتیان داین هەموو ڕۆژ ماوەیەکی کەم لە دەرەوە بەسەر ببەین. ئەمە پاش ئەوەی چواردە مانگی خشت وەکو مەڕوماڵات لە گەوڕێکی تەنگەبەر مۆڵ درابووین. زەوینەی گەوڕەکە تاتە بەرد بوو. ئای چەندمان پێ خۆش بوو جارێکی تریش خاک لەژێر پێی خۆمان ببینین!

هەندێ لە هاو زیندانەکانم چارەنووسی وەک منیان بەسەر هاتبوو. ئەوە نەبێ کردەوەکەی من لەسەرەتاوە بە چەوتی هاتبوو بەڵام ئەوان توانیبوویان ماوەیەکی باش بەسەربەستی لە ئێران کاربکەن. توانیبوویان بۆ چەندین مانگ یان چەندین ساڵ بەیاریدەی ئێرانییە ئەڵمان دۆستەکانەوە خەباتی ژێرزەمینی بکەن.

تا ئەو کاتەی بارەکە بۆنی هیوایەکی پێوە بوو، ئێرانییەکان شوێنی خۆشاردنەوەی ئەڵمانەکانیان مەیسەر کردبوو تەنانەت ئەگەر هەندێک جار ژیانی خۆشیان کەوتبێتە بەر مەترسییەوە. بەڵام ئەو کاتەی گلۆڵەمان کەوتە لێژیو دەرکەوت سوپامان لە هەموو شوێنێک ڕوو لە شکانە، ئیدی ئەوانیش کەوتنە ئەوەی ئەڵمانەکان بدەنە دەستی ئینگلیزەوە کە ئەو کاتە وڵاتی لە بن دەستەڵاتی خۆی نابوو، هەرچەندە داوای ئەوەشیان کرد بوو کە نابێ ئەم ئەڵمانانە بکوژرێن. لە هەمان کات ئەوانەی بەرپرسی سەرپەرشتیی نیشتمانییە ئێرانییەکان بوون هەتا ڕادەیەک لەلایەن ئینگلیزەوە ڕێزیان دەگیرا چونکە نەیان ویستبوو بەبێ مەبەست ختوکەی ئەو ئێرانییانە بدەن کە بە باوەڕ ئینگلیز پەروەر نەبون.

لەوێ چالاکیی ژێر زەوینییی ئەڵمان لە دوو شوێن کۆجێ بوو بوو. یەکێکیان لە ناوچەی تاران و

ئەسفەهان، ئەویتریان لە باشووری ئێران لە ناو خێڵەکانی لوور (Luren) و قەشقایی (kaschgis) و بەختیاری (Bakthiari) .ئەم شتەش ئەوەی دەگەیاند کەوا دەتوانن بە سەربەستی لە ناو خێڵەکانی باشووری ئێران هاتوچۆ بکەن. ئەم هەلومەرجەی ئەوان تەواو وەك هی کوردەکانی لە مەڕ خۆمەوە بوو. بیانی نەیدەتوانی بێ بنێتە ئەو هەرێمەوە، تەنانەت ئێرانییەکانی تارانیش نەدەوێران خۆیانی لێ بدەن. بەڵام دەبێ ئەوە بڵێم هاوڕێ بە جەرگە ئەڵمانەکانم توانیبوویان بێ لەوێ بچەسپێنن و وەك راوێـژکـاری سەربـازیی سەرۆك خێڵەکان کار بکەن. تێکرای خەڵك، سەرۆك خێڵەکان، پیاوانی خێڵەکـان و ئەفسەرانی ئەڵمانیش چاوەنۆڕ بوون سەربازی ئەڵمانیا لە قەفقاسەوە بەرەو باشوور هەنگاو هەڵێنێن. هەموو شتێك بۆ مەبەستی ڕاپەرینێکی گەورەی دژ بە ئینگلیزی ناحەز و لە پێناوی ئەڵـمانیـای دۆست كۆك و تەیـار کرابـوو. بایـەخی گەورەی باشووری ئێران بۆ ئینگلیز لە تاکە سەرنجێکی نەخشەوە دەر دەکەوێ، چونکە ئەو شوێنە سەرچاوەی هەرە گەورەی نەوت بوو.

هەندێکی تری پیاوانمان لە تیپێکی سەرەکی لە ناو تاران و دەوروبەری کاریان دەکرد. ئەمانە لە مێژ بوو، هەر لە سەرەتای شەڕەوە لەوێ بوون و چوو بوونە ژێر زەوی. ئەوانیتر زۆربەیان بەچەتر نیشتبوونەوە. بە بیرم دێ ئەو کاتەی لە بەرلین بووم (ماوەیەکی زۆر پێش ئەوەی بەرێ بکەوین) چۆن دەستەی فڕۆکەوان بەشڵەژاوی گەرانەوەو هەواڵیان هێنا کەوا لە خۆهەڵدانێکی سەرکەوتوو لە بیـابـانی لووت (Luth) لە ئێران، یەکێك لە چەترەکان نەکراوەتەوە، لەبەر ئەوەی ئەو پەتەی لە پاشکـۆی فڕۆکەکە بە قوڵفێکەوە بەسترابووەوە و پێویست بووە بەشێوەیەکی خۆبزێو بکرێتەوە، بەڵام گیر بووە و نەبـووەتـەوە. وای بۆ چوو بوون کابـرا وەك پلووکە بەرەیك رووەو زەوی شۆڕ بووەتەوە، بەڵام لە ڕاستیدا کابرا بە ئەسپایی نیشتبووەوە، چەترەکە بەشکانی قوڵفەکە کرابووەوە.

ئەو تیپە دوای گەشتێکی چەند ڕۆژیی بەسواری ووشتر، خۆیان گەیاند بووە تاران. چووبوونە ناو شـا ڕێکی ژێـر چاودێـریی تونـدی پۆلیســەوە. بە یارمــەتیی ئەو دۆستانەی لەوێ دەژیان، لۆرییـەکیان بەکرێ گرتبوو. لۆرییەکە کەرەووچی بار کردوبوو و ئەوانیش خۆیان لە بۆشایی ناو بارەکەدا شێرد بووەوە.

پیاوێکی ئەزموون دیتە بوو و چەندین ساڵ لە ئێران ژیابوو و زانیارییەکی چاکی لە بارەی شێوەزمانە جوداکانی ئەوێ هەبوو، ئەم پیاوە ئاکامێکی دڵتەزێنی بە چارەنووس بوو. لە زنجێکی بچووکی کەس بەسەرەوە نەچووی ناو دارستانێکی گەورە دەژیا.

خاوەنی زنجەکە نەیدەزانی ئەم پیاوە بەدزییەوە خۆی لە فڕۆکە هەڵداوە. ڕۆژێکیان پیاوە ئەڵمانەکە نەساغ دەکەوێ و دوکتۆرێکی متمانە پێکراوی بۆ دێنن و نەخۆشیی گرانەتای لێ دەدۆزنەوە. چیی لێ بکـەن؟ ناتـوانن بیبـەنە نەخۆشخانە، چونکە سەرلەبەری کردەوەکە ئاشکرا دەبوو. هەروەها ئەندامانی تیپەکە نەیاندەتوانی متمانە بە خاوەن ماڵ یان یەکێ لە کرێکارەکانی بکەن و ڕاستیی لەلا بڵێن. تەنیا ناوی گرانەتا بەسە بۆ ئەوەی ببێتەمایەی ترس و لەرز. گرانەتا ئاهۆیەکی لە یەکتر گرەوەیەو لەوانەیە پەتای ئەم نەخۆشییە زۆر زوو بڵاو ببێتەوە. پێش ئەوەی بە هیچ بڕیارێك بگەن کابرا مرد. شەو لە بارذۆخێکی زۆر ئاڵۆزو دژواردا لاشەی کابرایان بردە بیابانێك و ناشتییان.

پێ دەچوو ئەم گرووپە تایبەتەی ناو تاران لە ئەرك و فرمانی خۆی چاپك و گورج و گۆڵ بێ و، بەو پەڕی ووردایەتی نەخشەی دەست بەسەردا گرتنی حکومەتی بە یاریدەی ئەڵمان دۆستەکانەوە

کێشابێ. راستت دەوێ، پیاو دەتوانێ بڵێ لە حکومەتێکی بەروالەت بەولاوە کە لەلایەن ئینگلیزەوە بەرێوە دەچوو، سەرتاسەرسەری ئێران ئەڵمان دۆست بوون. هەرچۆنێك بێ، لە گۆشەنیگای سوپاییيەوە هێشتا کاتی بزووتنەوە نەهاتبوو. لێرەو لە هەموو شوێنێکی تری ڕۆژهەڵات نزیکبوونەوەی پتری سوپای ئەڵمانیا بە پێویست دەزانرا. ئەگەر ئەم «پتر نزیکبوونەوە»یە بگونجایە، یان ئەگەر لە هەندێك شوێنی تر ڕاپەرینی لە خۆوەی خێڵەکایەتی ڕووی بدایە، ئەوا سەرەنجام و بنەتای شەڕ بە بارێکی تر دەکەوتەوە.

بەلاف و گەزاف مەگرن لێم ئەگەر بڵێم ئێستا من کە زانیاریی تەواو وورد لە بارەی هەلومەرجی ئەوکاتەی ئەوێوە هەیە، تەواو دڵنیام ئەگەر کردەوەکەی من سەر بکەوتایە ئەوا شەڕ ڕووکارێکی تەواو جودای دەگرتە بەر. وەك لە پێشەوە ئاماژەم کرد، لەو شوێنەی دەبوو ئێمەی لە سەر سنووری عێراق ـ ئێران تێدا بنیشینەوە، ڕاپەرینێك کەوتبووەوە. هەل بۆ ئێمە هەڵکەوتبوو. لە ماوەی چەند هەفتەیەك، سەرتاپای ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەر لە ئێرانەوە بگرە تا دەگاتە میسر، بە سوودی ئەڵمانیاوە دەهاتە سەر باری ڕاپەرین.

بەڵام مرۆ پێشنیاز دەکاو خوابڕیار دەدا. ئەم ڕاستییەم هەرگیز وا بە ئاشکرایی بۆ نەهاتبوو. ئێمەی ئەڵمان سەرکەوتن لە دوای سەرکەوتنمان دەهێنایە دی تا ئەو کاتەی خوا بڕیاری دا ئیتر هەنگاومان لە دوو نەیەت.

لە دێرەکەی ئیمایوس، ئەو کاتەی لەپشت جووتە تۆری لەسیم دروستکراوی پەنجەرەوە دەمڕوانییە دەرەوەو سەرنجم لە خاکی پیرۆز دەدا، لەوێ، ئەو جوولەکانەی ئێمە جاری کینەو ستەمکاریمان لە دژ دابوون، سەرگەرمی ئاواکردنەوەی نیشتمانێك بوون. ئەو کاتە گەلێ جار ئەم جۆرە بیرانەم بە مێشکدا ڕادەبوورن.

## مەتەڵەکە ئاشکرا بوو

لە بەروبوایی هاتنی مانەوەی ئیمایوسم، ئێشکگرێکی نوێیان هێنایە بەر دەرگاکەمان. کابرای ئێشکگر هەر بۆ ئەوەی کات بەسەر ببا یەکە یەکە پرسیاری سەربردەی زیندانییەکانی دەکرد. منیش بۆم گێڕایەوە چۆن لە کوردستان گیرام.

((ها، ئەوەکەی ڕۆژئاوای مووسڵ؟)) گوتی.

«بەڵێ» گوتم.

پێکەنینێکی بەگاڵتەی هاتێ. سێ مانگ بوو شەڕ تەواو بوو بوو ئیدی هیچ زیانێکی بۆ کابرا تێدا نەبوو ئەگەر ئەو شتەی دەیزانێ بیڵێ.

ئەو کاتە، ئەو لە مووسڵ جێگیر بوو بوو چواردە ڕۆژ پێش ئەوەی ئێمە خۆمان هەڵدەین یەکە (وحدة) کەی ئەو فەرمانی پێ درا بوو خۆیان بۆ دەسگیر کردنی دەستەیەك چەتربازی ئەڵمانی ئامادە بکەن کە لەوێ دەکەوتنەوە.

لە هەژمەتان هەناسەم لەبەر برا. لە ڕاستیدا، لەوانەیە ڕەنگی مردووانیشم لێ نیشتبێ، چونکە

سەربـازەکـە پشتی تێ کردم. لەوانەبوو پێی وا بووبێ من لە تەواوی بەسەرهاتەکە ئاگادارم و نەیدەزانی ئەو زانیارییە هێندەم بەرەودوا دەگێڕێتەوە. وا ئێستا وەڵامی ئەو پرسیارەم هاتە دەست هێندە شەو و ڕۆژە، هێندە هەفتە و مانگە هەراسانی لێ هەڵگرتبووم: شتی وا چۆن بووە؟ دەبێ فەرمـانـدەرانی بەرلینم منیـان دابێتـە دەستی ئینگلیز. دەبێ وڵاتی خۆم بە تیز و گاڵتەیەکی نامـەردانەوە ناپاکیی لەگەڵ کردبم. هەرگیز تا ئێستا، هەرگیز تاکە جارێکیش بیرم بۆ شیمانەی ناپاکی نەچوو بوو. لە ژیانی خۆم، هەرگیز ڕێکەوتی ئەوەم نەکردبوو لە وڵاتی خۆم نیشتمانییەکانم ناپاکیم لەگەڵ بکەن.

ئێستا هەموو کێشانە و پێوانەیەکم لەبەرچاو کەوت. پێشی هەموو شتێك نیازیان وابوو بە بۆنەی وێ نەدانی داوودەزگـای هونـەریی پێـویستەوە کردەوەکە هەڵوەشێنێتەوە.کاتێ زانییان من گوێ نادەمێ و بەردەوامم، فەرمانیان نارد دەست لە کردەوەکە هەڵگرین. بەڵام ئەوەش دادی نەدا چونکە هەموو دەم بۆم دەکرا پشت بەو فەرمانە ببەستم کە دەسەڵاتێکی سەرووتر بڕیاری لەسەر دابووە ڕەنگە ئەو پیاوە تەڵپ و ناپەسندەی لە بۆدێنتەل لەگەڵمان بوو دەستی لەم کارە هەبووبێ هەروەها پاشان چەندین هەفتەی تر بەسەرچوون و من چاوەنۆڕی ئامادە بوونی فڕۆکە بووم، دیسانەوە پێیان گوتم هیچ فڕۆکەیەك بۆ ئەو کارە لەبەر دەست نییە. ئەم هێشت ئەمەشم بەسەردا تێپەڕێ. دەبێ کەسێکی تایبـەتی زانیـاریی لەمـەڕ شوێنی خۆهـەڵدانی ئێمەوە دابێتە دوژمن، نەك ئەو شوێنـەی من دەمـویست بگـرە ٢٥٠ کیلۆمـەتـر دوورتر، لەکن مووسڵ، لەو شوێنەی دەتوانن دەسبەجێ بەدیلمان بگرن. کەوا بوو فڕۆکەکە یەکسەر بەرەو مووسڵی فڕاندین. بۆ بەرزایی سێ تا پێنج هەزار مەتر داکشایە خوارەوە، چەندین جار خولی سەر شارەکەی دا وەك ئەوەی بە ئینگلیز و ئەمـەریکـاییە بۆ ئێمە ژووان گرتووەکان بڵێ ، « ها وا لێرەین شان بە شانی ڕووبارەکە کەمێك بەولاوەتـر بەرەو ڕۆژئاوا دەفڕین لەوێندەر ئەم پیاوانە و شتومەکەکانیان لە بەرزاییەکی زۆرەوە هەڵدەدەین بۆ ئەوەی لە دووری یەکتر بکەونەوە و نەتوانن پێك بگەنەوە. ئێمە دەمانویست هەر لە هەوا بەهۆی وێ نەدانی ئۆکسجینەوە لەناویان ببەین بەڵام داخەکەمان کابرای چەتر مەشقدەریان ڕزگاری کردن».

ئەوە بوو هەڵدراین و کەوتینـەوە، بەڵام هەلمان بۆ ڕەخسا و سەری دەربازبوونمان هەڵگرت. سەرەنجـام گیراین، چونکـە هەمـوو شتێـك دەربارەی ئێمەوە زانرا بوو و خوا خۆی دەستی لە گرەوەکەدا هەبوو. کردەوەکەی ئێمە لە چارەی نووسرا بوو سەرنەکەوێ.

پاشی چەند ساڵێك، لە نیشتمان زانیمەوە ئەو فڕۆکەیەی ئێمەی هەڵدا بوو کاتێ گەڕابووەوە بنکە چی ڕووی دا بووە هانـز کریستـۆف هاوڕێم کە تەواوی بڕوام پێی بوو لەوێ لە چاوەنـۆڕیـدا دەوەستێ ئەرکی وی ئەوە بوو یەکـە ڕاپـۆرتـەکانم بگەیێنێتە بەشە جودا جوداکانی (دەستەی گشتی) و نیـاز و فەرمـایشتی ئەوانیش وەربگـرێ و بۆ منی بنـێرێتـەوە هەر خۆیشی بەرپرسی بۆهـەنـاردنی چەك و ئەسپـاب و پێویستیی ترمان بوو. هەروەها ئەو فڕۆکەیەی تایبەت بوو بۆ هاتۆچوی نێوان ئێمەو بنکەی خۆی، لەوێ دەوەستا، چاوەنۆڕی فەرمانی هانز کریستۆف دەبوو. هەروەها خۆی بەرپرسی لە پیاوی پسپۆڕ و کارامە لەوانەی بەیێکی چاك لە ڕۆژهەڵاتی ناوەراست ژیابوون. کارمەیی ئەمانە بۆ داگیرکردنی چاڵە نەوتەکان زۆر پێویست بوو و هەروا بۆ ئاواکردنەوە

و پەرەپێدانی کوردستان زۆر بەکەڵك دەهاتن. هەروەها دەبێ براکەی خۆیشم لە چاوەنۆڕیی گەڕانەوەی ئەو فڕۆکەیە لەسەر ئاوو ئاگر بووبێ . دەبێ هیچیان بەسەر نەهاتبێ؟ کەی بێ یەکەمین پەیوەندیی بە بێتە لم پێوە بکا؟ بەرە بەری بەیانی گوێیان لە هاڕەونەڕەی فڕۆکەیەك بوو نزیك دەکەوتەوە.

فڕۆکەکە نیشتەوە و کابرای فڕۆکەوان بەوپەڕی ساردییەوە پێی گوتن هەموو شتێك بەپێی نەخشە جێبەجێ کرا.

هانز کریستۆف بە تەقڵەکوت خۆی گەیاندە بەرلین و شانی لە کار توند کرد. دەبێ هەموو شتێك کۆك و ئامادە بێ لەبەر ئەوەی کردەوەکە ئێستا لە جێبەجێ بوونەو ، لەوانەیە ئێستا نا ئێستا هەواڵ بێ و داوای هەناردنی پیاو و کەلوپەلی پێویست بکەن. براکەشم لەتەك دەزگا ـ وەرگرەکەی خۆیەوە هەڵدەتروشکێ، سەعاتەو سەعات، ڕۆژەو ڕۆژ، باسکی دەزگا بادەدا و گوێی پێوە دەنێ، بە دوای لێـزان و پسپۆڕاندا دەنێرێ و دەزگایەکی شەپۆل فرەتر بەکاردێنێ، دەڵێ، هەر نەبێ نەبێ بۆرە پەیوەندێکم دەست کەوێ؟ دڵنیایە کردەوە سەرکەوتنی هێناوەو خۆیشی چاکم دەناسێ. ئەدی من لەم جۆرە کارانە لێوەشاوە و بەتوانا نەبووم؟ چەندین جار خۆم لە فڕۆکە هەڵداوە و دەزگای بێتەلم بە سینگی خۆمـەوە توند گوشیووە و زۆری وریا بوومە ، دڵنیابوومە هیچی بەسەر نایەت. ئەدی ڕەمزی، بە نەبەردی و زرینگی خۆیەوە لەگەڵمان نەبوو و بەڵەدیی نەدەکردین؟ دەبوو بەم زووانە پەیوەندییەك، نامەیەك وەرگرێ. شەوو ڕۆژ، ووشت و وریا گوێی هەڵخستبوو، بەلام بێ سوود بوو. دەزگاکە بێ دەنگ، بێ دەنگییەك لەگوێن بێدەنگیی مردووان و بڕایەوە، سەری سوڕمابوو.

لەهەمان کات پسپۆڕەکەی دژەخەفیەیی، ئەو پیاوەی لەگەڵمان سواری فڕۆکە بوو و، لەڕاستیدا هیچ پەیوەندییەکی بە تیپەکەی ئێمەوە نەبوو، لە هانز کریستۆف نزیك دەبێتەوەو ترس و دڵەڕاوکەی خۆی سەبارەت بەم کردەوەیەی ئێمەوە بۆ دەدرکێنێ. دەبێ خراپییەك ڕووی دابێ. شتێکی چاکە ئەگـەر بێو جارێکی تریش سۆراغی هەموو شتەکان بکاتەوە. هاوڕێکەشم خۆی ئاسا بەوپەڕی

ئەمەك و وەفاوە ڕاپۆرتێکی ڕاستەوخۆ لەمەڕ ئەو کارە دەداتە سەرکردایەتیی بەرلینمان و داوای تاوتوێ کردنی کارەکەیان لێ دەکا.

ئەو وەڵامەی وەری دەگرێتەوە وەڵامێکی شل دەبێ. یەکڕاست بچێتە پێشەبەرەی شەڕ. گەلێکی گوت کورە پیاوی چابن ئەمە نابێ، گوتی من بەرپرسی ڕاگرتنی پەیوەندیم لەگەڵ ئەو پیاوە و،

بەرپرسی هەناردن و هاوردنی ڕاپۆرتی ئەوم و، مەشقدانی گرووپی دووەم و بەڕێ خستنی لەناکاوی ئەم گرووپە بۆ ئەوەێ لە ئەستۆی منە. بەلام دادی نەدا و بەرگەی نەگرت. ئەویان نارد و گرووپی دووەمیش پەرتەیان کرد ئیتر ئەوا گەمەی شەڕەنگێزی ناپاکی هاتە سەرکەوتنی یەکجارەکی ڕەنگە ئەو کەسەی هەموو ئەو گرفتانەی نابێتەوە، دەورووپشتی چۆڵ بووبێ و بەتایبەتیش ئەفسەرێکی ویژدان زیندووی ئەوتۆ لە ئەنجام و ئاکامی مەترسییان بپیچێتەوە، لەوێ نەبووبێ.

# گەڕنەوەی بەرەو ڕووناکی

وێ دانـەوەی دێـری ئیمـاس بە ڕەبـەنـەکـانی خۆی لە کۆتـایی شەڕ، ئەوەی دەگـەیـاند کە دەسبەسەرەکانی گریك و تورك و عارەب و دوورزی و ئەوانیتر یان ڕەها بکرێن یان بگوازرێنەوە سەربازگەی تر . من بەپێنێکی باش لەناو ئەو دارەبازمیە مامەوەو ئەو شتەی لەوێ لە هەموو شتان پتری چەوساندبوومەوە، برسێتی بوو. فەرماندەری گرتووخانەکە، ئەو بەرازو خۆراکە بە مشەیەی لە کامپی ئۆرشەلیمەوەماوەمان بۆ دەهات یەکراست بۆ ناو گەلەبەرازەکەی خۆی دەناردن.

بەختی چاکمان ـ ئەگەر بشێ وابڵێین ـ لەفەڵەستین ئەوە بوو، ماوەیەکی زۆر پەتا و ئاهۆیەك لەناو وشتران بڵاو بووەوە و لە ئەنجام ژمارەیەکی زۆریان مردار بوونەوە یان سەربران. ئەوە بوو ماوەی چەند هەفتەیەك ، لەباتی بازەلیاو فاسوڵیاو گێزەر، بڕێکی گەورەمان لە گۆشتی وشتر بۆهات. دەبێ فەرماندەری گرتووخانەکە ئەو گۆشتەی بە خۆرا یان هێند هەرزان چنگ کەوتبێ خوا خوای بووبێ لە جیاتی ئەو گۆشت بەرازەی دەستی بەسەر دادەگرت، دەرخواردی ئێمەی بدا.

لەلای خۆمەوە ماوەیەك بڕیارم دا چیتر گۆشت نەخۆم، ئەو هەلومەرجە بۆمن لە فریوودانێك دەچوو. کاتێ برسی دەبی بیر لە نەخۆشییان ناکەیەوە، هەردەتەوێ بخۆی.

بەڵام من بڕیاری ئەوەم دا بە خواردنی ئەو پارچە پەتاتە بچووکانەی لەگەڵ گۆشتە زۆرەکە بوون گوزەران بکـەم. هەرچـەنـدە زگم تێر نەدەبـوو بەڵام لەبرسانەش نەدەمردم ئێستاش کاتێ ئەو ڕۆژگارانەم دێتەوە بیر دڵم خۆش دەبێ چونکە توانیم لە بارت باوەڕی خۆم ڕاستگۆبم.

پاشـان سەبارەت بەو فەرماندەرەوە کە پیاوێکی هێندە سادیستی لاپەرسەنگ بوو دەیتوانی زیندانییەکان هێندە جەزرەبە نیوەمر ببن ، جارێکیان بیستمەوە چۆن پەندەکەی پێشینان دەڵێ گوزەی ئاو لەڕێی ئاو دەشکێ، ئەو پیاوە خۆیشی درابووە دادگاو بەتاوانی دەست پیسی بەند کرابوو.

ئێمەی (تایبەتی) هیچ پلەیەکی یاساییمان نەبوو. دەسەڵاتداران نەیاندەویست بە دیلی ئاسایی شەڕمـان حسێب بکـەن و هەروا نەشیاندەویست سووك وسانا بەرمان بدەن ئیدی ئەوە بوو لە زیندان ماینەوە تا ئەوکاتەی ئێمەیان بردە گرتووخانەیەکی ئاسایی ئەڵمانیی سەر بە کامپی شەڕ لە میسر.

ئەم ڕووداوە بۆ ئێمە لەو پەڕی گرنگی دابوو. پاش چەندین ساڵ دابڕان لە هەموو پێوەندییەك بە دنیای دەرەوە، پاش ئەوەی لە ڕێزی مردووان دەژمێردراین، ئەوا جارێکی تر هاتینەوە ڕیزی زیندووان. یەکەمین پێوەندیمان ئەوە بوو لە خاچی سوور ناوونوس بکرێین واتە بەڕاستی بچینەوە ڕیزی زیندووان و جارێکی تر شوون بزر نەکرێینەوە. پاش بەپێنێکی کەم بۆ یەکەمین جار ڕێگایان داین نامە بۆ ماڵەوە بنووسین. هەست و خوستێك دایگرتم هەرگیز ناتوانم بە نووسین دەری برم. پیاو بە ئاستەم دەیزانی چی بنووسێ. پرسیار هێندە زۆر بوون مرۆ بیان نووسێ و تەنیا دەرفەتی ناردنی چەند دێرەنووسینێکی کەمیش دەدرا.

ئیتر ڕۆژ وَ هەفتەو مانگی مرۆتۆقێن و بێ برانەوە سەریان لە دوو یەکتر نا. ئایا ژنەکەم بە ژیان مابوو؟ ئایا ئەو منداڵەی ـ کاتێ من بەجێم هێشت لەزگیدا بوو، بەسەلامەتی لە دایك بوو بوو؟ دەبێ کوڕ بووبێ یان کچ؟ ئەدی دایك وباوکم، ئاخۆ براکەم، خوشکەکانم، هاوڕێیانم چییان بەسەر

هاتبێ؟

هەر کە گەیشتمە ئەو کامپە، گەرماوگەرم کەوتمە خوێندنەوەی کتێب.شێوەیەکی ڕێکوپێکی ئاڵوگۆڕی زانیاری هاتە کایەوە، هەر بۆم هەڵبکەوتایە هاوبەشیم لەو دەرسانەدا دەکرد پێوەندییان بەزانست و فەلسەفەو ئەرکیتێکتوورەوە هەبوایە. زۆر لە ئیسفەنجێك دەچووم چەندین ساڵ لەبەر گڕەی گەرما فڕێ داربێ و پاشان خرابێتە ناو ئاوەوە. پێم وابوو هەر دەیمژم و دەیمژم و دیمژم بێ ئەوەی تێنوێتیم بشکێ. بیری خۆم بەوە مەشق دەدا چەند پارچە شیعرێکی درێژ و تارادەیەکیش ئاڵوز لەبەر بخوێنمەوە ئیدی بەم شێوەیە هەر لەبەیانیان سەر لە زووەوە تا درەنگانی شەو خۆم خەریك دەکردو دەمتوانی کەم تاکورتێك برسێتیم لەبیر ببەمەوە، ئەو برسێتی‌یەی هەمووماں کەم یان زۆر پێوەی پەرێشان بووین.

ئەو جوداییەی لە نێوان نیشتەنییانی ئاسایی، کامپەکەو ئێمەی (مەدەنی) دا هەبوو ئەوە بوو ئەوان مووچەی ئاسلییی خۆیان وەردەگرت و دەیانتوانی خۆراکی زێدەی پێ بکڕن. تێبینی دەکرا ئەفسەرە پلە بەرزەکان کەمەریشیان ئەستوور بوو بوو. گیراوی تایبەتیی وەك ئێمەش هیچ مووچەیەکی نەدەدرایێ و دەبوو پشت بەو ژەمە خواردنە کەمە ببەستێ ئەوان بۆمانیان دابین دەکرد. لە ڕاستیدا، کەمێك پاش ئەوەی من کامپەکەم بەجێ هێشت گرانەتای برسێتی بڵاوبووەوە.

لەبیرم چوو ئاماژەی ئەوە بکەم، کامپە گرتووخانەکەی ئێمە کە بۆ ئەفسەران بوو، کەوتبووە پیابانەوەو ٨٠ تا ١٠٠ کیلۆمەتر لە قاهیرەوە دوور بوو. ڕۆژان گەرم و شەوان سارد بوو، هەندێك جار ساردیکی کوشندە. لە چادران دەژیاین و هەر چادرەی دوو تا هەشت کەسی بە پێی پلەی سوپایی پێشوویان تێدا بوو. چاڵی یەك مەتر قووڵمان هەڵدەکەند. بەخشتی کاڵ (خشتی لە قوڕو ئاو دروستکراوو و بەرگەرمای هەتاو وشکەوە بوو )مان هەڵدەچنی. گیانێکی پێشبڕکەی ئەوتۆ هاتبووە گۆڕێ سەبارەت بەوەی کێ بە چاترین شێوە چادران هەڵدەداو پیاو بەزەیی بەحاڵی ئێمە دەهات چۆن و بەچی دەردەسەرییەك ئەو چادرانەمان دەهێنایە سەر باری ئەوەی بۆ دانیشتن بشێن. بەو پەری بایەخ و ماندوێتییەوە باخچەمان لە پێش ئەو چادرانە دروست دەکرد و شاتازیمان پێ دەهات ئەگەر گوڵێکی بچووك یان دەوەنێکی گەنەگەرچەك ڕەگی دەربکردایە.

کامپەکە بریتی بوو لە کۆمەڵێك زیندانی ئاسایی‌و یەك زیندانی نا ئاسایی. ئەوان پێشوو بەڕۆژەوە بەر هەڵدا بوون و زیندانییەکان دەیانتوانی ئاموشۆ و دیمانەی یەکتر بکەن. ئەویتریان «ناپاك» ی تێدا بوو و لەبەشەکانی تر جودا کرابووەوە. ئەمە پێی دەگوترا «قەفەزی گەورە نازییان» و دەبوو بە چاکی جەزرەبە بدرێن.بەبێ هیچ سۆنگە و سەبەبێك ئێمەی «مەدەنی» یان لەوێ گیر کردبوو هەرچەندیشە ئەوانی لە دێری ئیماوسەوە هاتبوون هیچ پێوەندو سەراسوویەکمان بە سیاسەتەوە نەبوو. بەڵام دەبوو تەبای پیاوانی سەر بەسیاسەت ئێمەش هەموو ئازار و جەزرەوەیەکمان بنۆشیایە.

پاش چەندین مانگ چاوەنۆڕیی بە ئێش و ئازار، ڕۆژێکیان نامەی لە مێژەوە بە هەویا بووی ماڵەوەم بۆ هات. نامەو وێنەی جوانی دایکێکی جحێل و کوڕیژگەیەکی سێ ساڵانەی هێشتا باوکی خۆنەدیوو، هێشتا بە ژیان مابوون بەڵام لەسەر لێواری هەرەس و دەردی برسێتیدا.

ژنەکەم بە خۆی و مندالی ناو کۆڵەپشتیەوە لە ناو ئاژاوەو بشێوەنەی دوا دوای شەڕەوە سەری خۆی هەڵگرتبوو و هەڵاتبو . دایك و باوك و براکەشم مابوون و ئەوانیش دەرباز بوو بوون. بەلام ئەو دۆست و هاورێیانەی لە بەرلینم بەجێ هێشتبوون نزیکەی هەر هەموویان مردبوون.

پاش خۆ بە چەتر هەڵدانی ئێمە کورتە هەواڵێك گەیشتبوو: چوار ئەڵمان لە عیراق خۆیان بە چەتر هەڵداوە دوای ماوەیەکی کەم بە دیل گیراون. گیران لە بارو دۆخی ئەو کاتە هەمان مانای مردنی هەبوو. ئیدی ساڵ بە ساڵ هیچ هەواڵێك لە ئێمەوە پەیدا نابێ و سەرەنجام هەموویان دەگەنە ئەو راستییەی ئیدی من بە ژیان نەماوم. لە هەمووان پتر ژنەکەم دەستی لێ شوشتبووم چونکە ئەو رۆژەی ناو دارستانەکە منی زۆر بێ دەرەتان و بێ ئەنوا بینیبوو.

تاوێکی کەم پێش ئەوەی شەڕ بە کۆتا بێ نامەی ئەفسەرێك لە هەموو شتێك پتری سەرسام کردبوو. ئەو ئەفسەرە بۆی نووسیبوو لە گرتووخانەی ئیماوس لە فەلەستین لەگەڵ من بووەو، من بەژیــان ماوم و باشم، بەلام دەرفەتی نووسینم نییە. بیرم کەوتەوە ئەو پیاوەکێ بوو. ئەندامێکی کەرتی دیپلۆماسی بوو، پاشان لەگەڵ دیپلۆماسییەکی ئینگلیزی دیل ژێر دەستی ئەڵمان ئالوگۆڕی پێ کرا. رۆژێکیان، بردیانە دەرەوەو کابرای دیپلۆماسی خۆیشی نەیدەزانی بۆ کوێیی دەبەن.

ئەم هەواڵە ، بۆ ئەوان چەنــدی خەیاڵ بکەی هەواڵێکی دڵخۆشکەر بووە. ئەو کەسەی ئەوان بە مردوویان دانابوو، زیندوو بوو! ئێستا پیاو دەیتوانی بەهیوای دیداربێ، هەرچەندە ئەم دیدارە ساڵانێکی زۆریشی پێ‌بچێ.

هەرچۆنێك بێت . ئەو نامەیەی بۆم هاتبوو فەرامۆشیی نەدەدام: ژن و منداڵەکەم لەبرسانە رزگیان دەگــوشی . رۆژە بە زۆژە لەســـەر لاپــەڕەی رۆژنــامانم دەخوێندەوە کەوا مەترسییەکی گەورەی کەمبوونی خواردەنی لەوێ هەیە .زۆرم حەز دەکرد برێکی ئەو پارەو پولە کەمەی وەرم دەگرت بۆ ئەوانی بنێرم بەلام نەدەکرا.

ژنەکەم لەنامەی دووەمیدا نووسیبووی رۆژێکیان بە هۆی بێ‌هێزیو بەدخۆراکی لە پێپلیکانەی ماڵەوە کەوتــووەتــە خوارەوە. هەمیشە لە پەژارەی ئەوەدا بووم چۆنیان دەسگرۆیی بکەم. کاتێ ئاووهەوا ساف بووایە سێ پنتی بچووکم لە ئاسۆوە لێ بەدەر دەکەوتن ، پێم وابوو سێ پیرامیدەکەی (جیــزە)ن، هەشتا کیلۆمەتریك دوور بوون. دەبێ قاهیرە هێندە لەوانە دوور نەبێ، ئەو شارەی پڕیەتی لە خواردەنیو منیش پیاوێکی بەگوڕو توانم و دەتوانم کاربکەم وپارە پەیدا بکەم. تەنیا بەهــۆی پەرژینی تەلبەندێکەوە لەو شارەجودام. بۆ بەسەر ئەو پەرژینەدا پازێك نەدەم؟ وا لێرە دەستەوسان دانیشتووم و بچووکترین تروکەی هومێدی یارمەتیدانی ماڵەوەم لێ بەدەرەوە نییە و خێزان و کەسوکاریشم دەردی برسێتی دەچێژن، خۆمم پێ بەرزەوت نەدەکرا.

وا جارێکی تریش خولیای کار، خولیای خۆ لە مەترسیدان هاتە بن کلێشمەوە، ئەمە ئەو خولیایە بوو گەلێك جارم لەژیانی خۆم ئەزموونی بوو. جاری یەکەمجارم وا لەبیرە ئەو کاتە هێشتا هەرزەکار بووم بۆ یەکەمین جار بەتەنیا سنووری ئەڵمانیام شکاندو چوومە ناوچەیەکی بیانییەوە. هەروا دیمانەی یەکــەمجــاری زەریــاشم لەبیرە. بەلام لە هەموویان پتر ئەو رۆژە گرنگانەم دێنەوەبیر، دەساڵێك لەمەوپێش لەبەغداوە بەرەوژوور هەڵکشاین، بەرەو کوردستان ،کوردستانی خۆشەویستم.

بەپەلە بیری خۆمم تاوتۆی کرد. دۆستێکی چاکم لە کامپەکە هەبوو هەمان بارودۆخی منی هەبوو.

ئەویش ژن و منداڵەکانی برسی بوون ، هەروەها پیاوێکی زمانزانیش بوو.
یەکێکی تریش گوتی لەگەڵتان دێم. گوتمان بۆنا، بەڵام سێکەس بەسە.ئەم نهێنیەمان لە هەموو ئەوانـەی لەم بازنـەیـەی ئێمـە نەبوون بەچاکی شاردەوە. لە هەمان کات بەیاریدەی دۆست و برادەرانەوە دەستمان دایە خۆ ئامادەکردن. دۆستی چاك ، زۆرچاکمان لە کامپەکە هەبوون.
توانیمـان کەمێـك زانیاری لەبارەی چۆنیەتی دیووی دەرەوەی سیمەکە پەیدا بکەین. زۆرکەس هەڵاتبوون بەڵام پاش ماوەیەکی کەم هەموویان گیرا بوون و هاتبوونەوە.
بەڵام سەبـارەت بە رێوشوێنی دەرچوون و هەموو ووردایەتییەکی دەربازبوونەوە دۆستـانی ناو کامپـەکـە توانییـان یاریـدەیەکی چاکمان بدەن بەتایبەتیش لەسایەی پێوەندیان بەبەشەکانی تری کامپەکەوە.
شوێنێکی تایبەت لە دیووی دەرەوەی کامپەکە هەبوو. بۆ ئەوەی بگەینە ئەو شوێنە دەبوو پێشی هەمـوو شتێك لەم قەفەزەی خۆمان دەربچین. لە دەوراندەوری کامپەکە بە دووریی سەد مەتر کۆمـەڵێك بورج هەبوون، ئێشکگریان بەسەرەوە بوون و چاویان لە هیچ شتێك خافڵ نەدەکرد.
دووچینە پەرژینی درکداری بەرز هەبوون، دوو سێ مەترێك لەیەکەوە دوور بوون، هەرکەسێ پێی بنایەتە سەرلی نێوان هەردوو پەرژینەکە ئاشکرا دەبوو. هەر یەکێك لەم دوو پەرژینە بە تۆرێك سیمی تێـك پەرێـووی ڕاست و چەوپ چنـرا بوو. لەمپەری هەرە گەورەمان ئەو داوێنە پێکەوە تەنراوەی سیمە درکدارەکە بوو کە دیووی‌دەرەوەی پەرژینەکەی داپۆشیبوو.

ئەو کاتـەی تاریـك ولێڵە دەکـەوت، زرێپـۆشی سەرواڵای تیـژرۆ بە دەوری چیـوەی کامپـەکـە دەسـووڕانەوەو تیشکیان داوێشتە سەر پەرژینەکە بەڵام سووڕانەوەیان بەپێی کاتی دیاریکراو نەبـوو و هەندێك جار دەهاتنە بن سیمەکەو هەندێك جاریش پیاو دەیتوانی خۆی پەنا بداو، لە شوێنێکی نەدیوو خۆی لە پشت گومەتە خۆڵێك بشارێتەوەو بەم شەوە هەست لە گوێ هەڵخستن و چاوە چاوەی تیپە ئێشکگرەکە رابگرێ. ئیدی کارێکی ئەوەندە ئاسان نەبوو پیاو بتوانێ لەم کامپە دەربچێ. بەڵام خۆشەویستی دەتوانێ بەسەر گەورەترین تەگەرەدا زاڵ ببێ و گۆی گرەو بباتەوە!
گرەی گەرمای نیوەڕۆ بوو ، پێمان وابوو ئێشکگرەکانمان لەو کاتەدا هێند ووریا نین. دووان لە ئێمە وەك تێسکەی تفەنگ دەرچووین و بەسیمەکەدا هەڵگەراین و پێوەندیمان بە دۆستانی ناو بەشەکەی تری کامپەکەوە کرد بۆ ئەوەی هەڵاتنی ئەو ئێوارەیەی ئێمە سەروبەر بکەنبێ ئەوەی هیچ کەسمان لێ بەئـاگـابێ لە سیمەکەوە دابەزین و گەرایـنەوە شوێنی خۆمان ئەمە ئەزموونی بەکردەوەی هەڵاتنی ناو پەرژینەکە بوو.
هەموو شتێك ئامادەو تەیارکراو بڕیاری ئەو شوێنەشمان دا لێوی دەربچین.
شوێنەکە کەوتبووە نێوان دوو دووریی وەکو یەکی دوو بورجەوەو لەبەر ئەوەی زەویی ئەو شوێنە کەمێك لە بەشـەکانی تری پەرژینەکە نەوتر بوو، کەمتری رووناکی دەکەوتە سەر.
پێنـج شەش دانـە تێلی ئەم سەرو ئەو سەر نوشتاوەشمان خستبووە گیرفانەوە بۆ ئەوەی سیمە تەلبەندەکەی پێ بەرزو نزم بکەینەوە، ئیتر مرۆ دەیتوانی بەشێوەیەکی ئاسانتر بەژێر پەرژینەکەدا بڕوات.

ئێواره داهات. پاسەوانانی ئینگلیز پشکنینی ئێوارەیان تەواو کرد. وۆلس و ماڵاتەکە بەهێمنی لە گەوری خۆیان مات بوو بوون. دەبوو ئێستا دان بەخۆدا بگرین. بەبێ هیچ سۆنگەوسەبەبێك دڵمان بە تەپوکوت کەوتبوو و ترسمان لێ نیشتبوو. ڕێگاوبانی ناو کامپەکە هاتوچۆیەکی زۆری بەسەرەوە بوو. ئێشکگری نوێ هاتنە بەر دەرگا. کاتی دەرچوونمان لە زیندان کاتێکی ناسك و ئاستەم بوو چونکە نیو سەعاتمان پێ دەویست بۆ ئەوەی بگەینە شوێنی هەڵاتنمان. باشترین کاتی دەرچوونمان لە کامپەکە ئەو ماوە کورتە بوو کە دەکەوتە نێوان خۆر ئاوابوون و تاریکی کەوتنەوە. لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، گۆرانی لە ڕۆژەوە بۆ شەو زۆر نەرمەو ئەو ماوە کورتەی گۆڕانەکە زۆر بە کەڵکی مەبەستەکەی ئێمە دەهات. ڕەنگی کۆنتراست و دژبەیەك دیار نییە و شت بەچاکی لێك هاوێر ناکرێن و، هەروەها ئاوهەوای ئەو ماوە کورتە بە جۆرێکە زۆر کەڵکی هەڵاتنی ئێمەی دەگرت.

ئەو کاتەی لە زیندانەکەی خۆمانەوە چاوەنۆری یاریدەی کەسانی تر بووین، دووکەس لە هاوڕێیانمان گفتوگۆیەکی گەرمیان لەگەڵ پاسەوانەکانی بەر دەرگا هێنایە گۆڕێ.

بەمەش پاسەوانەکان بۆ ماوەی چەند دەقیقەیەك پشتیان کەوتە ئێمە. هەناسەیەکی قووڵمان هەڵکێشاو پاشان «بەرەو خەباتی ڕێگای ژن و منداڵ!» پێمان پێوەنا.

هەڵاتین و هێندەی نەبرد لە نێو هاتوچۆی زیندانییەکانی تر وون بووین. کاتێ خۆریش ئاوا بوو، برادەرانی ترمان بەهۆی تێلە چەنگاڵەکانەوە پەرژینەکەیان کون کرد. بەرینیی ئەو کونە تەنیا (٢٥) سانتیمەتریك دەبوو. درکەکانی سیمەکە زۆر تیژو ئازارز‌ەر بوون و ئەگەر جوڵانەوەیەکی بە هەڵەت بکردایە بە توندی لێت گیر دەبوون، بەڵام گوێمان پێ نەدا. ئەو یارمەتییە یارمەتییەکی بێ وێنە بوو. ئەو کاتەی ئێمە شتانەمان دەکرد، چەند کەسێك چاویان بڕیبووە شوێنی پاسەوانەکان تا بزانن ئاگادارن یان نا، بەڵام نا ئاگادار نەبوون. دە دەقیقە چاوەنۆر بووین، پاشان پێنجی‌تر ئینجا کاتی بەرێ کەوتنمان هات. کاتێ گوتم:

«باشە با بڕۆین» مۆچڕکێکی بچووکم هاتێ.

لەم ساتەوە ئیتر برادەرانمان نەیان دەتوانی پترمان یاریدە بدەن. ئێستا مەسەلە مەسەلەی ژیان و مردن بوو. ئەو شتەی بۆیان دەکرا ئەوە بوو تەنیا هیوای خۆشبەختیمان بۆ بخوازن، هەڵبەتە ئەمەشیان پڕ بە دڵ دەکرد.

**توانیم لە پەرژینی یەکەم دەرباز بم و، پاشان وەك ماری ئاوی لەسەر زگ بۆ پەرژینە دژوارەکەی دووەم خشیم، توانیم لەمەشیان دەرباز بم هەرچەندە ئاسانیش نەبوو. پاشان بە بێدەنگی و بەپەلە و بەبێ هیچ کۆسپێك مەتر لە دوای مەتر لە پەرژینەکە دوور کەوتمەوە. ئێستا نا ئێستا قرمەژنی گوللە دەهات. دەمارگیریمان لەو پەری کرژیدا بوو.**

**پاش ئەوەی نزیکەی پێنج مەتریك چوومە پێش سەرنجم دا وا تیشکێك لەلای چەپەوە بەرەو ڕووم دێ. تیشکەکە هێشتا لە پشت تەپۆلکەیەکەوە بوو و تا دەهات هەراشتر دەبوو. ئەو زرێپۆشەی لە چواردەوری کامپەکە دەسووڕایەوە لە ماوەی چەند ترووکەیەکی چاو دەگەیشتە سەرم. ئیتر نەمدەتوانی بگەڕێمەوە دواوە. زرێپۆشەکە پێش من دەگەیشتە جێ. ئەگەر ئاوهاش بمێنمەوە هێندە ناباو زرێپۆشەکە دەمدۆزێتەوە. ئەوە بوو پێم پێوە نا. هەر بێکەم کردە چوار پێ و تا هێزم تێدا بوو بەرەوپێش ڕام کرد. هەرگیز لە ژیانی خۆم بەو شێوەم ڕانەکردبوو. ماوەی دە پازدە چرکە بەم**

شێوەیە بە بیاباندا هەڵاتم، تا ئەوەی ماشێنە تیشکدەرەکەم هێندە لێ نزیک بووەوە، ناچار بووم لە سەرزگ راکشێم. دڵم بە جۆرێك بە تەپوکوت کەوتبوو، دەتگوت جارێکی تر هێور نابێتەوە، دەتگوت هێندەی نەماوە بتەقێتەوە. نەمدەزانی زرێپۆشەکە بەری بەکوێوەیە: بەرەو پەرژینەکەیە؟ پشتی لە پەرژینەکەیە؟ ئەگەر بکەوتمایە بەر تیشکی رووناکییەکە ئەوا وەك خاڵێکی رەش لەسەر لە سپیوازەکە دەردەکەوتم.

بیرێکی بە ترس و سامتر هاتە مێشکمەوە: باشە ئەگەر زرێپۆشی چەمەری ملی لێ نام؟ زرەی زنجیری رەوڕەوەکانی هێندە نزیك بوو بووەوە دەمگوت ئێستا نا ئێستا لە ژێری دەپلیشێمەوە. وەکو بەرد، بەبێ جووڵە و بزاوت لەوێ رکشابووم. پاشان نەرە نەرەکە بەرە بەرە دامرکایەوە. ئاهێکی خۆشیم هەڵکێشا، مەترسییەکە رابورد، کەس نەیبینیم.

ئەدی دووەکەی تر؟ ئەوانیش دەرباز بوو بوون؛ بە سنگەخشکێ وکۆمەکۆم لە دوای منەوە دەهاتن. زۆرم کەیف هات. ئەوانیش هەمان ترس دڵەراوکەیان بەسەر هاتبوو. پاش ئەوەی لە سیمەکە دەرچووبوون و نزیکبوونەی زرێپۆشەکەیان بینیبوو، وەکو شێتان ملیان بە دەشتەوە نابوو و رایان کرد بوو.

شەوێکی ئەنگوستەچاو یان چاتر بڵێین شەوێکی مەندی بە ئاسمانی پڕ لە ئەستێرەی جوانی ئەو تۆمان بەسەر داهات بە جۆرێك یەك ساڵی تەواو مرۆ لە بیابان وێڵ وسەرگەردان ببێ و راست وچەپی خۆی لێك هاوێر نەکات. شەپۆلی سێبەر بەناو بیابانی بێ سنووردا پەنگی دابووەوە. هەر دەتگوت دەریایەکی بەرهەڵدایە، تەپۆڵکە لەکان رووناك و نەوربییەکان تاریك دیار بوون، ئای دیمەنێکی چەند بەسام و مەترسی بوو.

دەبوو پێ هەڵگرین، تا دەتوانین پێ هەڵگرین ولەوێ دوورکەوینەوە نەبادا ئێشکگری بورجەکانی چاوەدێری سۆسەمان بکەن و بماندۆزنەوە. پەرجوویێکی سەیر بوو، لە هەڵاتنی ئێمە خافڵ بوون، ئێمەش بە دزیی چاوی ئەوانەوە دەرچووین. رەنگە نزیکبوونەوەو نەرەو هەراو تیشکی زرێپۆشەکە، ئێمەی لە بەرچاویان شاردبێتەوە.

پێڵاومان بە دەستەوە گرتبوو، وەك پشیلەی کێوی بەرمان بە دەشتەوە نا بوو، ملمان نا، چاومان لە تاریکی بریبوو، تاریکی ونوتەکیی شەو ترس وپاڕێزمانی پتر دەکردو لە هەموو بنەپنجك وبەردێك دەسڵەمینەوە، هەموو سات ئامادەی دەنگدانێکی لە ناکاو وبەرتیشکدانێك بووین. کاتێ تروسکەی چەند رووناکییەکمان لە دوورەوە بەدی کرد لە شوێنی خۆمان وەستاین، ئەمانە رووناکیی گوندێکی عارەب بوون کە پازدە کیلۆمەترێك لە دووری کامپەکەی ئێمەوە بوو. کەندرێك هەبوو ئاوی سازگاری لە نیلەوە بۆ ئەم گوندە دەهێناو بیابانێکی بەرفراوانی بە درێژایی سی کیلۆمەتر ئاو دەدا وباخ وباخاتێکی رەنگینی قامیشە شەکرو دارخورما ولۆکەو پرتەقاڵ و شتی تری وەبەرهەم دەهێنا. لەو شوێنەی کەندرەکانی ئاو دابەشکردن تەواو دەبوون، پێچێکی توند هەبوو وپاشان سەرلەنوێ بیابان دەستی پێ دەکردەوە. لە بەری ئەو بەرەوە دەسەڵاتی ئینگلیز نەبوو و ئەگەر سەربازێکی ئینگلیز خۆی دەربخستایە لەوانە بوو بدرێتە بەر دەسرێژی گوللە. جوتیارانی میسر لەبەری ئەو بەر دژی ئەڵمان نەبوون، بۆیە دەمانویست بە پەلە بگەینە ئەو بەر.

تاوێك بەرەو پێش رۆیشتین ولەناکاو رووبەڕووی باڵەخانەیەك بووینەوە. ناسیمانەوە، شوێنی

مالآت کوشتنەوەی کامپەکە بوو. گەلێك جارمان بینی بوو مێگەلی مەڕو مالآتی پیرو لاواز و ئێسك بە پێستەوە نووساویان بۆ ئەم لایە رادەدا.. سەگرەوێك دەستی پێ کرد، بەپەلە پێچمان کردەوەو باش بوو سەگـەل نەهـاتنــە دووومان. ئەو سەگانە نەك هەر راگیریان دەکردین بگرە لەوانەبوو لەت و پەتیشمان بکەن.

ئەو کەنــدرەی نیشانەی رزگاریی ئێمە بوو، نزیك کەوتەوە، هێندەی نەبرد چەند درەختێکمان لێ وەدەرکــەوت. مەتــرسیی گەورە لێرە بوو، کۆمەڵێك پۆلیسی ئینگلیزو میسری لەو ناوە بوو.. دەنگە دەنگێکمان لە لایەکەوە هاتە گوێ، بەرەو رووی ئێمە دەهات. دەرنگمان بەسەر هات و نەکرا لە رێگا لادەین. دەبوو بوێری وئازایەتیمان کۆکەینەوەو لە رۆیشتنی خۆمان بەردەوام بین، باش بوو ئەو دەنگـانــە دەنگی چەنـد عارەبە ژنێکی چارشێو بەسەر بوون و کاتێ ئێمەیان بینی بە بێدەنگی بەلاماندا رەت بوون.

ئەگــەر ئەمــانــە پیــاو بوونایە، گومانی تێدا نەبوو قسەیان دەکرد وکێ دەزانێ سەرەنجام چۆن دەکەوتەوە. هەر نەبا کەمێکیان دوا دەخستین وئێمەش نەماندەویست شتی وا روو بدات.

کاتێ گەیشتینــە ئەو رێگـایەی کەندزی ئاوەکەی کەوتبووە پشتەوە. خۆمان رووت کردەوەو جل وبەرگەکانمان پێکەوە بەست، هاتینە خوارەوەو چووینە قەراغی ئاوەکە. کەس لەو دەورو بەرانە نەبوو. مانگ لە چواردە بوو و پرشنگێکی زیوینی بە ورشەو پرشەی داوێشتە سەر ئاوەکە. بازێکم هەڵداو کەوتمە مەلە، بارکۆڵەی جلەکانم لە ژوور سەرمەوە بەستا بوو. پانیی ئاوەکە تەنیا بیست مەترێك دەبوو بەلآم بۆ لەشی ریوەڵەو ووشکەوە بووی ئێمە دووریيەکی بێ کۆتایی بوو. بەرە بەرە بارکۆڵەکان گران بوون و دوای تاوێك نەکرا چیتریان هەڵگرین، جلەکانی من کەوتنە ئاوەوەو تەواو تەڕ بوون، لەو چەند مەترەی دوایی هەر هێندەم پێ کرا نەهێڵم بە ئاوێدا بچن و بەرووتی بمێنمەوە. دەردی هاوەڵەکانیشم لە دەردی من باشتر نەبوو.

جلوبەرگەکانمان گوشی وخۆمان پۆشتە کردەوە، لەسەرمانە چوقەی ددانمان دەهات لەو کاتە پیاوێك ووردە ووردە لێمان نزیك بووەوە؛ پێ دەچوو لە زووەوە چاوی لێمان بووبێ. زۆری خوڵك کردین بۆ ئەوەی بەگەڵی کەوین؛ چاوی لێمان بێ و لە ماڵی ئەو بنووین. لە دەم ودووامانی دۆستانەی ئەو پیاوە زۆر ترساین. راستە دونگەی هیچ شتێکی ئەو تۆی لە ئێمە نەکرد بوو بەلآم وێش دەچوو فریوومان بداو، بیەوێ بمانباتەوە گوند و لەوێوە بچێتە پۆلیس ولە بریتی پاداشتێك زمانمان لێ بدا.

باش بوو من وفــریــدرێــك عارەبییەکی چاکمان دەزانی وپیاوەمان دایە بەر دەسرێژی سوپاس وستایش تا لەبەر دەستی دەرباز بووین، پاشان یەکراست بەنێو دارو دەوەنەکانەوە ملی رێگامان گرت و چاومان دایە بیابانی ئەو بەرو پاشان رێگای قاهیرە.

سەبــارەت بەوەی سەرفــرازیم بۆ گەرابووەوە، بوو بوومە پیاوێکی ئەوتۆ سەربەست خاوەنی بریاری سەربەخۆی خۆم بم، لە خۆشیانە پێم نەدەکەوتە زەوی. پاش ئەو هەموو ساڵانەی دیلی و بەندایەتیی کونجی زیندان، هەر دەتگوت ئێستا وا لە چیرۆکی ئەفسانەیی دەژیم. گەلێك لە مێژ بوو دەستم بە هیــچ درەختێـك نەکەوتبو! ئێستا وا درەختێکم لە بەرامبەر بوو و بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە بۆی دەچووم و بە ئەسپایی دەستم بەلك و پۆپ و گەڵاکانی دادەهێنا. پەنجەم بۆ پەسۆی

سپی قۆزاخە تەقیوەکانی دەبرد. لە بەرامبەر ئەم زەوییە، سەرتاسەری ئەم زەوییە پیرۆزە هەست وسۆزێکی بێ بن، سەروەری دای گرتم. هەردوو دەستم بەرز کردنەوە وسەرم بەرەو ژوور هەڵبڕی، بەبۆنەی ئەو سەرکەوتنە مەزنەی ئاسمان لەو گیانبازییە بۆی بەدی هێنا بووم، زۆرم سوپاس کرد، راستی بڵێم، ئەگەر لەو ساتە بگیرامایەوەو بدرامایەوە زیندان و لە سۆنگەی ئەو هەڵاتنەمەوە سزایان بدایەم ئەوا هێشتا ئەم ساتە کورتەی لە کۆت و پێوەند ڕزگار بوونم زۆر لەکن شایان و پەسەند بوو.

پیادەڕێی تەنگەبەری نێو دەوەنجارکە تاریکستانێك بوو، چاو چاوی نەدەبینی. ساتەمان دەکرد، سەرەنگرێ دەبووین، دەکەوتینە ئەم بەر و ئەو بەری ڕێگا. هەندێ جار دەکەوتینە ناو کەندرێکەوەو تا ئەژنۆمان لە قوڕ دەچەقی، بەڵام ووچانمان نەدەدا و ملی ڕێگامان دەگرتەوەو بەر، جارێك بەلای دەستە پیاوێکەوە ڕەت بووین، ڕەنگە کرێکاری بێستانەکە بووبن، بەو پەڕی ڕێزەوە سڵاوی عارەبیمان لێ کردن و ئەوانیش بە دەستووری خۆیان سڵاویان لێ وەرگرتینەوە. بێ گومان دەبێ ئەوان بە مەزندە زانیبێتیان ئێمە کێین، بەڵام زوو خۆمان کوتایەوە ناو تاریکی و بزر بووینەوە.

پاش ئەوەی چەند سەعاتێك ڕێگامان بڕی، گەیشتینە بیابانەکە، کۆمەڵێك خانووبەرەو نشیمەنی بچووك بچووك لە دەرەوەی سنووری بێستانەکە هەبوون، ئەم خانوانە کەوتبوونە ناو بیابانەوە، ئەمەش بۆ ئەوەی زەویوزاری بەراوو بەکەڵکیان پێوە بەفیڕۆ نەچێ. نەدەکرا بەم شەوە پتر بڕۆین، بەر لەهەموو شتێك دەبوو خۆمان لەم جل و پاتاڵە زیندانیانەیە ڕزگارکەین و ، هەروا دەبوو بزانین کام ڕێگا هی ئێمەیەو بەر بەکوێوە بدەین. بەو جلوبەرگە تەرانەوە لەسەرمانە دەلەرزیین، بەڵام کاتێ بۆمان دەرکەوت هێشتا گەرمای ڕۆژگار تینێکی خۆشی لە ژێر لمی بیابان ماوە، هەریەکەو چاڵێکمان بۆ خۆمان هەڵکەندو چووینە ژێر چینە لمێکی ئەستوورەوە. چەند سەعاتێك پشوومان داو ماندوێتیمان حەسایەوە. پێم وایە تاوێکیش هەڵاژاین . وێڕای ئەوەی هێشتا تەنگانەی زۆرمان لە پێشەوە مابوون بەڵام دڵمان خۆش و کەیفمان ساز بوو کەوا نیوچە سەرفرازێکین. لەگەڵ گەردوگۆڵی بەیانی بە خۆ کەوتینەوەو بەرەو قاهیرە بەڕێ کەوتین. خۆمان لە خەڵك و لە ئاوەدانی بەدوور دەگرت. گوندێکمان لێ وەدەرکەوت، فرێدریك بە تەنیا هەنگاوی بەرەو گوند نا. بەڕاستی پیاوێکی زانا و دنیا دیتە بوو، هێند ڕەمەکییانە لەگەڵ خەڵکی ئەو ڕۆژهەڵاتی ناوەراستە دەجووڵایەوە، هەر دەتگوت وا لە نیشتمان و زێد و وڵاتی خۆیەتی. لە دەرگای یەکەمین ماڵی داو، بەبێ ترس لە بەرچاوی ئێمە ملی ناو چووە ژوورەوە. پاشان دەستێکی بۆ ئێمەش ڕاوەشاندو بانگی کردین.

لەنزیك (ئەبو)وەوە وەکو ڕۆژهەڵاتییەك چوار مشقی دانیشتین، (ئەبو) چای بۆ تێکردین و، (خبز) و پەنیری بزنی بۆ دانایین. لە برسانە لاکەی سەرمان دەهات، زۆر بە ئیشتیاوە نانەکەمان خوارد. زوو لەگەڵ کابرا ڕێك کەوتین. لەبریتی جلەکانی خۆمان کە جلی زیندان بوون و بەئاسانی دەناسرایینەوە، کابرا هەریەکەو دیژداشەیەکی درێژی، کۆنی دڕادڕاوی پیس و چڵکنی ویمان دا، ئەو جلە عارەبییە هەر لە جلی شەوانە دەچێ، جوتیاری ڕۆژهەڵات ناوەڕاستی بۆ هەموو کاتێك لەبەری دەکات. جلێکی فشوفۆڵەو بۆ گەرمای ئەوێ دەست دەدا. ئەو وەرزێرە ڕووت و نەدارەمان بەجێ هێشت و بە کەیفێکی خۆشەوە بەڕێ کەوتین. وامان پێ باش بوو تا دەکرێ پتر لە کامپەکە دوور کەوینەوە. بەڵام ئێمە هێشتا لە تەنگانە دەر نەچووبووین، هەر میسرییەکی لەنزیکەوە زەینی

ئێمەی بدایە دەیزانی شێوەمان ئەوروپاییەو، ئەمەش مانای یەك شتی دەگەیاند. دیلی شەڕین، یان ئەڵمـانــین یان ئیتاڵین و رامان کردووە. خەڵکی سادەو رەمەکی هیچ زیانیان نەبوو، بەڵام لە میرەدێو گوندی گەورە گرفتمان بۆ پەیا دەبوو. بێ گومان فێڵبازو نامەردی وا لەو شوێنانە هەبوون لە بەرامبــەر پاداشتی چەنــد قرۆشێـك بەگـرتیـان دەداین. لە هەمــووی ناخۆشتر، دەبوو ئەو راستییــەمان لەبەر چاو بێ کە پۆلیس هەر لە پێناو راگرتنی شیرازەی هێمنی، رێورەسمی زۆر توندی هەبوو بۆ گرتنەوەی هەموو هەڵاتوویەك و دەسبەجێ دەیدانەوە قاهیرە. لەوێش دەخرایە گرتووخانەی ئەوروپاییان و پاشان دەدرایەوە دەستی ئینگلیز.

رۆژێـك، سەر لەبەیانی زوو بوو! بە پارێزو ماتە ماتە لە گوندێکی تر نزیك کەوتینەوە، حەزو ئالهای ژیانی شارستانانە هاتەوە سەرمان. لە ناوەندی باخ و باخاتێکی هەراو خانووێکی جوانی لە شێوەی ماڵە هەواری رۆژانی پشوو هەبوو، لە تەرزی ئەو خانووانەی ماڵە دەوڵەمەندی گریك و ئەمــەریکـایی شارنشــین لە گونـدانیان دروست دەکرد. بۆ ئەوەی رۆژانی پشوویان بە خۆشیو بەشادی بەسەر ببەن دەهاتن سەردانی ئێرەیان دەکرد.دڵنیا بووین ئەم جۆرە خەڵکانە دەزانن بە فرەنسی بدوێن. دیسان هەر فریدریکۆ بە خۆیو بەجلوبەرگی تیتۆڵ بە تیتۆڵی جوتیارانەیەوە رووی لە باخەکە کرد. ئافرەتی شۆخ و شەنگ و پیاوی بەسەمەر بەسەمەر لەسەر بانیژە دانیشتبوون و خواردنێکی زۆر و زەوەنــدیــان لە بەر دەست بوو مێــزو خوان بە دەفرو ئامانی گلین و زیووین رازابوونەوە. یەکراست رووی لەوانە کرد، بەرێزو شەرمەوە بۆیان چەمایەوەو بە زمانێکی رەوانی فرەنسی سڵاوی لێ کردن. خۆمانی پێ ناساندن و پاشان گوتی زۆر حەز دەکەین جارێکی تر وەکو ژیانی ماڵەوە، لە کووپی ناپاب چا بخوێنەوە. ئێمە نیاز و مەبەستی ترمان نەبوون و، بە هیچ بارێك داوای شتی ترمــان نەدەکـردو پاشی ئەوە یەکراست دەڕۆیشتین. ئەو ماڵە باشە زۆریان کەیف بەراشکـاویو بێ شەرمیی ئێمــە هات و لەگــەڵمان کەوتنە گاڵتەو گەپ. تێر و پڕمان چای و کێك ومیوەجات خوارد. پاشان هەستاینەوەو ماڵئاواییمان لێ کردن، بۆیان چەماینەوە:

«زۆر سوپاس مادامینە، زۆر سوپاس مسیۆیینە،»

بەسەری بەرەزەوە لە دەرگای حەوشە دەرچووین، بووینەوە جوتیارەبێ دەرمتانەکەی جاران و بە لۆژە لۆژ ملی رێگامان گرتەوە بەر.

بەراستی خۆش و دڵگـیر بوو، هەتــا بڵێی دڵگیر بوو. سەرفرازی تان و پۆیەکی- نوێی دەدایە هەمووشتان. تەنانەت کاتێ هەردوو چەتوڵەکەی رێگاشم وەبیر دێتەوە کە زۆر نامەردانە تاڵان و بڕۆیان کردین، پێکەنینم دێ. شان بەشانی کەندرێکی سێمەتر پانی ناو باخەکە دەڕۆیشتین، لە ناکاو دوو ئەسپ سواری درو کێوی و ناپیاومان لەو بەری کەندرەکە لێ هەڵکەوتن. راوەستان و دەنگیــان داین بەڵام ئێمــە گوێمان نەدانێ و بەجێمان هێڵان. لە دواوە هاواریان لێ کردین کە بووەستین. ئەدی شتێکی بێ ئابڕووانە نەبوو ئەو دزانە لە دوورەوە بێن و گیرفانی سووکی ئێمە ببڕن؟ نەیاندەتوانی لە کەندرەکە بپەڕنەوەو هەروەها چەکداریش نەبوون بەڵام دەیانتوانی چەکێکی ترمان لێ بخەنە کار. کورت و کرمانجی، گوتیان ئەگەر گیرفانمان بەتاڵ نەکەین ئەوا رێ و راست دەچنە نزیکترین مەڵبەندی پۆلیس و زمانمان لێ دەدەن. رەشە تاڵانێکی نا پیاوانە بوو بەڵام پیاو راست بڵێ تۆزێکیشی پیــاوەتی تێدا بوو. دەبوو بەو پەڕی دڵنیاییەوە خۆ بەدەستەوە بدەین. بە

دڵێکی گرانەوە یەکە یەکە گیرفانی خۆمان بەتاڵ کردو هەرچی سامان و کلووری هەمان بوو بۆمان هەڵدانە ئەو دیووی کەندرەکە. لە خۆشیی ئەوەی دزەکان دیژداشەکانیان لێ نەساندین شاگەشکە بوو بووین.

بەڵام لە هەمان ئەو گەشتەمان ڕێکەوتی کورە گەنجی میسریی ئەوتۆ دڵئاواو نان بدەمان دەکرد، خواردنیان بۆمان دەهێناو گەلێ جاریش ئەگەر بیانزانیایە ئێمە ئەڵمانین، داوەتیماڵەوەیان دەکردین.

تەنیا یەك جار گومانم لە دڵسۆزیی میواندارییەك کرد. ئێوارەیەك، جوتیارێك داوەتی کردین. پاش ئەوەی خواردنێکی سادە، بەڵام چەورمان خوارد، لەگەڵ چەند پیاوێك کەوتینە گفتوگۆ. لەناکاو یەکێکیان گوتی دەمەوێ سەیری ددانتان بکەم. بێ گومان دەیویست بزانێ چەند سەرە ددانی زێڕمان هەیە. هیچمان لە دەست نەدەهات ئەوە نەبێ دەمی بۆ بکەینەوەو ئەویش بە ئارەزووی خۆی ئەنگوستی تێدا بگێڕێ. زوو بڕوای هێنا، یان چاکتر بڵێم هەر بڕوای نەهێنا، چونکە بۆی دەرکەوت ئەوە ناهێنێ خۆی بەدەرهێنانی ئەو چەند سەرە ددانە زێڕەوە ماندوو بکا ئێمە نێچیری لاواز بووین و بەبێ ئەزیەت دەستی لێ هەڵگرتین.

دوای چەنـد ڕۆژێـك گەیشتینــە بیســانێکی تر، بێستانی ئەمجارە زۆر گەورە بوو. پیاوێکی کەڵەگەتی بیابانی (بدوي) پاسەوانی زەویوزارێکی فراوان بوو. ئێمەی بەناو بیبانێکی بەرهەڵدادا بردو لەڕێگـا سەرنجمانی بۆ چەند کونێکی بچووکی ناو لمەکە ڕاکێشاو گوتی ئەم کونانە مشکی بازهەڵدەریان تێدا دەژیو ئەمیش دەیانگرێو دەیانخوا. هێندەی پێ نەچوو چاوی تیژی ئەوپیاوە کونێکی بەدی کرد و کەوتە هەڵکوڵینی. مشکێکی بچکۆلە ویستی دەرپەڕێ، بەڵام پیاوەکە بەدەست گرتی.

زەحمــەتە مرۆ بتوانێ وەسفی ئەو گیانەوەرە بچووکە بکا. بۆ گەورەیی، لەمشك گەورەترو لە جورج بچووکتر بوو. دەتگوت کەنگەری بچووك بووەوەیە. دەستەکانی درێژ و بارێك بوون. بەڵام پاشووی کورت و بەهێز بوون. بە هۆی ئەو پێیانەیەوە دەیتوانی بە کەڵەمبازی یەك مەتر یەك مەتر بڕوا بەرێوە. ئەو گیانەوەرە بەستەزمانە هێند بە توورەیی سەیری کردم و دڵیشی وا بە تەپوکوت کەوتبوو ناچار بووم بە هانایایەوە بچم.

بەکـابـرام گوت بابـزانین ئەو مشکە بازهەڵدەرە چۆن دەڕوا؛ کابرا دەستی کردەوە، بەیەك تروکەی چاو مشکی تایین کەڵەمبازێکی داو، لەوێوە بۆ ئەوێ تا کونێکی دۆزیەوەو خۆی تێدا وون کرد. بەکەڵەمبازی سەیر و سەمەرەی مشکەکە پێ کەنین و، پێش ئەوەی کابرا چاو بۆ کونێکی تر بگێڕێ قۆڵیم ڕاکێشاو بەرێ کەوتینەوە.

لە دەروازەی پشتــەوەرا چووینە ناو بێستانەکەوە، چەند کرێکارێکی میسری بە خێرهاتنێکی گەرمیـان کردین و خولکیان کردین لەگەڵیان دامەزرێینە سەر توێشەبەرە سادەکەیان و، نانیان لەگەڵ بخوێن. تا ئێستاش بەیادی ئەو پیاوانەو بەیادی هەموو هەموو ئەوانەی لە ڕۆژانی پێویست و تەنگاوەدا دەستی یارمەتییان بەباڵەوە گرتین، موچرکەی شادیم دێتێ.

کرێکارەکان پێیان گوتین ئەندازیاری بەرپرسی ئەو کێڵگەو زەویوزارە، ئەڵمانییەو ڕەنگە یارمەتیو ئامــۆژگاریی باشمان بداتێ. ئێستگەیەکی پاڵەپەستۆ لەو نزیکانە هەبوو، ئەو ئەندازیارە ناو بە

ناوێك لە كاتی دیاریكراودا پەیا دەبوو بۆ ئەوەی ئێستگەكە بپشكنێ. ئێمە دەمانتوانی لە كاتی هاتنی ئەو دەرفەت وەرگرین و بچین لەگەڵی بدوێین. بە ڕۆیشتنی ڕێگاوە هێند كەشەنگ و ماندوو بووین، چەند سەعاتێك لە سێبەری دارو دەرختەكان حەسابنەوە. لە ناكاو ئەندازیارەكە بەسواریی كەرێك پەیا بوو، سەرنجێكی سەرتاپاگری داینێ، دەبوو ئێمەش ملی ڕێگا بگرین و بڕۆین. ئەو پیاوە بەپـارەو بە جلوبــەرگ هێندەی یاریدەی ئەو ئەڵمانانە دابوو كە لە چادرگە ـ گرتووخانە جۆر بە جۆرەكانەوە هاتبوون. پیاو چاكی هەرە گەورەی دنیا لەمە پتری لە دەست نەدەهات. چاكە نەوازی و پیاوەتیی ئەو هێندە بە بڵاوی دەنگی دابووەوە، ڕۆژ نەبوو میسریو ئەورووپایی خەڵك نەنێرنە لای ئەو ئەندازیارە. بەڵام كاتێ فرێدریك ـ هاوەڵە ڤیەننابییەكەم، بەو پەڕی ڕێزو حورمەتەوە لێی بپرسێ ئایـا دەتوانێ هەندێ ئامۆژگاریمان بكا چۆن بگەینە قاهیرە، ئەندازیارەكە بەسەرنجێكی گرژەوە گوێی بۆ شل كرد.

«هەر ئەوەم بۆ ناكرێ بهێڵم نەمسابییەكی وەك تۆ چیتر لەم بارو دۆخە بژی،» گوتی، «وەرن لەگەڵم.»

بە گەڵی كەوتین و، نزیكەی كیلۆمەترێك ڕێگامان بڕی تاگەیشتینە كۆمەڵێك باڵەخانەی بچووك، خانــووبەرەو مەڵبەندی كارگێڕی و كامپ و جێگەی لە قوتوو نانی بەرهەمی میوەجاتی تێدا بوو. كێڵگەیەك بوو لە هەموو ڕوویێكەوە نوێباو بوو لە ڕووی ڕێكوپێكی و ئامێرەوە لە سەرتاسەری میسر لە وێنــەی كەم بوو. بەلامــەوە سەیر نەبوو كاتێ پێیان گوتم ئەم داوو دەزگایە لەلایەن پیاوێكی ئەڵمانییەوە دامەزراوەو بەگەڕ كەوتووە. لە سەرەتای شەڕ، ئەم داوو دەزگایە بەو ناوەی ماڵی دوژمنە دەستی بەسەردا گیرا بوو و، فرۆشرا بووە (پاتشا)یەكی میسری. ئەندازیارەكە هەر لە سەرەتاوە لێرە بوو بوو، بەرپرسیاری مەكینەو بە تایبەتیش ترومپای فرە ئاڵۆزو ئامێری ئاو داشتنی زەویوزار بوو. زۆر شەرمەزار دەبووین كاتێ ئەو پیاوە ئاوها بەدڵ و بەگیان خەمی ئێمەی دەخوارد. خواردنی دەداینێ و شوێنی نووستنی پیشان دەداین.

پاش ئەو هەمووو ساڵانەی دیلی و بەندایەتی كە ڕۆژ بە ڕۆژ لە بەر چاوی خۆیشم بوو بوومە شتێكی هیچ و پووچ و، لە بیرم چوو بووەوە مرۆیەكی سەربەخۆی خاوەن كەسایەتیی خۆمم نەك كۆیلەیەكی چەپەڵ و ئێسك گران و بێ كەڵك، وا ئێستا هەستم بە سەنگ و بوونی خۆم كردەوە. پێم وایە ئەو هەل و دەرفەتەی منی تێدا لە زیندان وەدەر كەوتم، چاترین و لەبارترین كاتی ئەو هەلانە بوو.

بۆ ئێوارە، بەپێنێكی تەواو لە دەرەوە لە ژێر ئەستێران ڕۆنیشتین، خانە خوێیەكەمان پێی شەرم نەبوو لە بەرچاوی كرێكارو فەرمانبەران لەگەڵ ئێمەی ڕووتەو بێزەوەر دانیشێ.

هێنــدەی نەبــرد، باس و خواستی نێــوانمــان متمانە و بڕوای لەكن هەردوو لا پەیدا كردو، ئەندازیارەكە هەندێ سەربردەو بەسەرهاتی تاڵ و شیرینی ژیانی خۆی بۆمان گێڕایەوە. كوڕێكی تاقــانــەی تەمــەن هەژدە ساڵی هەبوو بوو ئەویش لە پێشبركەو جریدبازیدا لە سواریی ئەسپ پەڕیبوو. كورتەكی كوڕەكەی بۆ یادگار هەڵگرتبوو بەڵام هەموو شتەكانی تری دابووە ئەو كەسانەی داوای یارمــەتییــان لێی كردبوو. بێ گومان نەیدەهێشت ئێمەش بە تۆی دیژداشەیەكەوە لەوێ هەڵبڕێین، شتێكی هەر پێ دەداین، بۆ پارە پارەی نەبوو بەڵام مشووری چارەسەرێكیشی هەر

دەخوارد.

ڕۆژی دواتر، وەك باوکێکی دڵسۆز بەرێی کردین. کورتەکی کورەکەی یەکێ بوو لە شتانەی بە ئێمەی بەخشی. ئێستا فریدریك و من دەمانتوانی بچینە قاهیرە و بێ ئەوەی کەس پێ بزانێ، لەوێ بژین. بۆ هاوەڵەکەی تریشمان، لەلای زەویدارێکی ئەو ناوچەیە کە دۆستی خۆی بوو، کارێکی دۆزیەوە.

کورە گەنجێکی میسری لەوێ کاری دەکرد، بە هاتنی ئێمەی زانیبوو و هات. هەر دەرفەتێکی بۆی هەڵ بکەوتایە خۆشەویستیی خۆی نیشان دەداو هەندێکیش ووشەی هاندان و زات وەبەر نانی پێ دەگوتین. بەیانیی ڕۆژی دواتریش، زۆری کەیف هات کاتێ ئەندازیارەکە پێی گوت بەگەڵمان بکەوێ تا ئەو شوێنەی پاسی قاهیرەی لێ بوو. ئەو دۆستە دڵۆوانە کرێی ڕێگاشی لە گیرفانمان نا. هەروەها کۆمەڵێ ناوونیشانی ئەوکورە لادێییانەشی ویمان دا کە لە شار کاریان دەکرد. گەلێکمان سوپاسی کردو بەرێ کەوتین، ئیدی ئەوەتا کاروبارمان بەرەو لەباری هەمواری وەرسوڕاو لە خۆشیانە پێمان بەزەوی نەدەکەوت. ئەو شتەی لە هەموو شتان پتری کەیف شاد کردین ئەوکورە گەنجە هەژارە بوو کاتێ خواحافیزیمان لێ کرد چەند پارچە دراوێکی کە هەیبوو لە مستی ئێمەی ناو ڕۆیشت.

کاتێ پاسەکە گەیشت، بەبێ ترس و لەرز خۆمان هەڵدایە ناوی، داوای بلیتی قاهیرەمان کردو بەبێ ووڕتە لەزارەوە هاتن لێی دانیشتین. ترسی ئەوەمان بوو نەکا کتوپڕ لەیەکێ لە بنکە بێ ئەژمارەکانی پۆلیس بمان پشکنن. بەڵام خواو ڕاستان هەموو شتێ بەهێمنی ڕابردو پاشی سێ سەعات گەیشتنە مۆڵگەی پاس.

سەرەتا واماندەزانی لەشارێکی ئەوەندە گەورەو زەلام وون دەبین، بەڵام زوو کەوتینە خۆ بۆ ئەوەی جێگاو ڕێگا بدۆزینەوەو کارمان دەست کەوێ. ئێمە لەبەر ئەوەی دوو کەس بووین کاروبارمان چاکتر هەڵدەسووڕا. ژوورێکمان لە ئوتێلێکی نوێی عارەب گرت و خۆمان بەناوی نوێمانەوە ناونووس کرد. من ئۆلاف کارلسنی سویدیو، هاورێکەشم بەناوی ئەندرسنی دانیمارکییەوە. دیار بوو ئەمە گرفتی بۆ نەدەنایەوەو ئێمەش دڵنیاو سەرئاسوودە دەبووین.

هەر لەبەیانیان زووەوە تا درەنگانی شەو پێوە بووین پێوەندی بەپیاوە دەشتەکییەکانەوە بکەین، ئەمە خوایەبەڵکو یەك دوو فرۆشمان بدەنێ بۆ ئەوەی کرێی ئوتێل و پێداویستیی ترمانی پێ جێبەجێ بکەین. سەرەتا گران و دژوار بوو بەڵام بەرەبەرە سەردەکەوتین. خەڵکەکە نواربیان ئێمە سواڵکەری بەپیشە نین، بگرە بەراستی دەمانەوێ بەزوویی کارمان دەست کەوێ بۆ ئەوەی نەبینەتار بەملی خەڵکەوە..لەمەش بەولاوە دەمانویست بڕێ پارەو پوول بۆ خزم و کەس و کارمان بنێرینەوە ئەڵمانیا. بەڵام لەیەك بار دەبێ دانی پێدا بنێم من سواڵکەر بووم، بەهیوام ئەوکەسانەی یارمەتیم لێ وەرگرتوون ـ ئەڵمانی، نەمسایی، سویدی، فەرەنسی، میسری ـ لێم ببوورن، شەوو ڕۆژ ژنێکی نیوە برسیو منداڵێکی سێ ساڵانەی بەدرێژایی ڕۆژ زگ لەبرسا هەڵگوشیوم لەبەرچاو وون نەدەبوو. ئیتر بەرە بەرە بەسەر ترس و دڵەڕاوکەدا زاڵ بووم و، پیاوی ئەوتۆ دڵئاواو نان بدەم دۆزیەوە کە خۆراك و بژێوی بۆ ماڵ و منداڵم بنێرن. پاشان زانیمەوە، ئەو خۆراك و بژێوییەیان لە

کاتێ هەرە پێـویست و تەنگـانــە گەیشتبــووە دەست و، ئەگــەر ئەو خۆراکە نەبوایە لەوانە بوو چارەنووسیان بەبارێکی تر وەرگەڕێ. حەز دەکەم پڕ بە زارو لەبنەبانی دڵەوە سوپاسی ئەو پیاوە دڵۆوان و دڵ پڕ بەزەییانە بکەم هەرچەندە دەشزانم ئەوان بۆ سوپاسیان نەکردبوو.

ئەزمـوونی ژیـان بەو بڕوایەی هێنام ـ چۆن بە گوێرەی یاسای فیزیا هیچ ووزەیەك لە دنیا نافەوتێ، هەروەها هیچ چاکەیەکیش بزر نابێ. ئەو کەسەی چاکە دەکا سەرەنجام ئەو چاکەیەی دێتــەوە رێگا. نافەوتێ. زۆربەی جاران دێتەوە رێگای ئەوکەسەی خۆی ئەم چاکانەی کردوون، هەنـدێ جاریش دێتــەوە رێگـای خۆشــەویستانی. ئەرێ دەبێ ئەو هەموو چاکەو پیاوەتییانەی لەقاهیرە لە گەڵیان کردم لەئەنجامی ئەو چاکانە نەبووبێ دایکم لە ژیانی خۆی لەگەڵ خەڵکی دەکردن؟

لەسایەی ئاوڕی خێری دۆستێکەوە توانیمان ژوورێکی تەواو چەپەك و پەنا لە گەرەکی جوولەکان بەکرێ بگرین. لەوێوە بەخۆکەوتین. کاتێ هاوڕێکەم کاری وەدەست کەوت، ماوەیەك خۆمان لەیەکتر جودا کردەوە بۆ ئەوەی کەس مەزەندەی هیچمان لێنەکاو نەبادا لەهەڕێك بگیرێین. بەڵام ڕۆژ بەڕۆژ کەمتر بیرم لە شیمانەی گیرانەوەمان دەکردەوە، تاوای لێهات هەر نەمدەویست جارێکی تر بیری لێ بکەمەوە.

بڕیارم دا ئیتر پارە کۆبکەمەوە بۆ ئەوەی بتوانم پارەی ئەو شتانەی پێ بدەمەوە کە بۆ ماڵەوەم ناردبوون. بەڵام کاری نووسین و ئەرکی دەستی هێندە بە هەرزانی لەلایەن وڵاتییەکانی ئەوێوە جێبەجێ دەکران، شتێکی زەحمەت بوو پیاو بتوانێ هیچ بڕپارەیەکی لەم رێگایەوە دەست بکەوێ. باشە لە کوێوە دەست پێبکەم؟ پاشان بیرێکم بۆ هات. ئەوەتا من بەناو سویدیم و، ئەدی مەساژ (شێلان)ی سویدی لە هەموو دنیا بەناوو دەنگ نەبوو؟ ئەدی من خۆیشم لەوان کەسانە نەبووم بایــەخ بە شێــلان و ئەم جۆرە چارەسەرانە دەدەن؟ باشە چۆنە لە ئێستاوە خۆم وەك ناتر (ئەو کەسەی شێلان دەکا بەپیشە) هەڵ دەم.وێڕای ئەمەش دەتوانم کار بۆ خۆم بکەم و بەرفەرمانی کەسیش نەبم و ئەگەر توانیشم لێوەشاوەیی خۆم دەرخەم ئەوا دەتوانم ژیانێکی شایان بژیم.

هەر زوو بووم بە مسیۆ ئۆلاف لیزانی مەساژی سویدی‌و، دەستاوێژی (خۆکردی) مەساژزانیم لەتەنکەی گیرفانم نا. چەندین سات ئەم پیشە نوێیەم لەسەری خۆم هەڵگێڕو وەرگێڕو تاوتوی کردو ڕاهێنانی مەساژکاریم بە خەیاڵ جێبەجێ کرد. هەروا ئەم پێشنیازەم لەگەڵ چەند دۆستێکی ئەم پیشەیەیان بەلاوە گرنگ بوو، تاوتوی کرد. یەکێك ناونیشانی کۆنە مست وەشێنێکی میسریی بۆ هەڵدام. ئەو پیاوە مەساژکارێکی دەویست هەفتەی دووجار بچێتەلای. ئەمە یەکەمین ژووان گرتنم بوو. گەیشتمە ماڵی کابرا، ماڵەکە لە خانوویکی شێوە ڕۆژهەڵات ناوەراستی لەبەشی کۆنی قاهیرە بوو. کە چووم کابرا لە چاوەنۆڕیی من دانیشتبوو، منیش مەچەکی کارم لێ هەڵماڵی، یا ئەوەتا دەبەزم و کۆڵ دەدەم یان وورەی پتـرم وەبــەردێ. کاتێ لە شێـلانی یەکـەمین پیل و بازووی ماسولکە تێکسمــراوی کابــرا بوومــەوە تەواو هێزم لەبەر براو پشووم سواربوو. ترسم هاتێ ئیتر نەتوانم بەردەوام بم. دەمزانی بەهرەی کارکردنم هەیە بەڵام هەر ئەوە بوو هێزی بازووم شل و کوت بوو بوو. لەسایەی وورەی بەرزی باوەڕەوە توانیم هێزی لە شم گورج کەمەوەو هەر چوار پەلی کابرا یەك لە دوای یەك بشێلم. دواجار هەموو سەنگ و گرانایی لەشم هاویشتە سەرپشتی و ئەوجا توانیم

پشتی بشێلم. سەرەنجام شێلان تەواو بوو و منیش تەواو لە پەل و پۆ کەوتم. کاتێ لە خۆشوشتن بوومەوە، کابرا دانیشتبوو نانی بەیانی بخوا، خولکی نان خواردنی کردم، لەبرسانە لاکەی سەرم دەهات و لەگەڵی دانیشتم. دەمزانی ئەگەر لەم پیشەیە بەردەوام بم و سەربکەوم هێندەی نەدەبرد هێزو توانم دەگەڕایەوە بەر. ئیدی کەوتمە خۆبنیاتنان و، لە گەڵ بە هێز بوون و پتەو بوونیشم وورەی کارکردنم پتر هەڵدەکشا.

لەلای ئەم نۆشدارەوە دەچووم بۆ لای ئەو نۆشدارو، بە پسپۆڕی وەرزش و چارەسازی بە (مەساژ) خۆم پێ دەناساندن. لەسەردەمی ئەو کارەم جارێکیان پرۆفیسۆرێك لێی پرسیم لە چارەسەری کام نەخۆشی بەڵەدم و دەستی باڵام هەیە. بەو پەڕی شایی بەخۆ بوونەوە گوتم: دەتوانم چارەسەری زۆر چاکی ئەوانە بکەم کە شێوانی دەمارگیرییان هەیە.

لێی پرسیم، چۆن ئەم شتەم بۆ دەکرێ.زۆر نەترسانە گوتم بەهۆی ئەو هێزە موگناتیسییەی لەناو دەستم هەیە دەتوانم ئەم کارەبکەم.

دەستی گرتم و بەسەرسامی گوتی: (جابەڕاستی، هێزێکی نائاساییی موگناتیسایەتیت لەناو دەست هەیە.) بەڵێنیدا لەمەو دوا نەخۆشم بۆ بنێرێ.

خولیای پارە پەیاکردن، زۆر زوو کۆمەڵێ خەڵکی چاکی بۆ ڕەخساندم، زۆریان تێدا ئەورووپایی بوون و منیش بەرێکوپێکی چارەسەرم کردن و ئەوانیش پارەی چاکیان لەمست نام. زۆربەشیان خەڵکی بەئاگاو ووشیار بوون و سەبارەت بە شێلانەوە شتیان دەزانی. زۆر زوو ناوبانگم پەیاکرد. ئەمە هانی دام پتر مەچەکی مل لەکارگوشینی لێ هەڵبماڵم.

هەروەها پێش لە گرتووخانە ڕاکردنیشم، سەرکەوتنم لە چارەسەرکردنی ئەم جۆرە نەخۆشییانە هەبوو. فرێدریکی هاوڕێم چەندین مانگ بوو بەدەست ئازاری یەکێ لە جومگەکانی پێیەوە زۆر پەرێشان بوو. دیاربوو هیچ چارەسەرێك دادی نەدەدا و هەلاتنی لەگەڵ ئێمەش بەوە بەند بوو ئایا دەتوانێ رابکا ئەگەر پێویستمان بەراکردن هەبووایە. دەستم دایە مەساژکردنیو دڵنیاشم کرد کەچاك دەبێتەوە، لەراستیشدا کاتێ لەسیمەکە دەرچووین و دەبوو بۆ ڕزگارکردنی ژیانی خۆمان رابکەین، فرێدریك وەکو ئێمە بەسووکی ڕای دەکرد. ئەمە هیچ شتێکی نائاساییی تێدا نەبوو. بەکورتی ئەم چارەسەرە لەسایەی هێزی سروشتیو خوداییو موگناتیسییەوە بوو.

کاتێ هەستی دڵنیایی لەدڵم نیشت. دەستم کرد لەرێگای پێناوێکەوە نامە بۆ ژنەکەم بنێرمە ئەڵمانیا. پۆستەی ئەوکاتە باش نەبوو، سێ مانگی پێ دەچوو تا نامە دەگەیشت بەڵام لەگەڵ بەسەرچوونی ڕۆژگار چارەنووسی من بەبارێکی نالەبار وەرچەرخا.

## گەڕانەوەم بۆ مەعادی

بۆ ماوەی سێ مانگ تامی ئەو سەربەستییە نوێ دەستکەوتووم کرد، تارۆژێکی شەمووی پاش نیوەڕۆ، کاتێ بۆلای یەکێ لەو نەخۆشانەی بەڵێنم لەگەڵی هەبوو دەچووم، لە گۆشەیەکی هێمنی

شەقامێك دوو بازووی بەهێز لەراست و چەپمەوە باوەشیان لێدام. ئاوڕی ئەملاو ئەولای خۆمم دایەوەو ڕووی کەسێکی بیانیم هاتە بەرچاو. پاشان پیاوێکی میسری بەجلی شارستانییەوە بەرەو ڕووم هات و لێی پرسیم بەڕاستی من کێم. لەوانەیە یەکێك لەو چەند کەسەی ڕازی دڵی خۆمم لەکن درکاند بوون، لەلای پۆلیس زمانی لێدابم. ڕك و کینەم لێی نییە، بەهیوام خوا لێی ببورێ. پێم وایە دەبێ گەلێ جار لەم و لەو ببورین؛ ئێمە لە چارەمان نووسرابوو ئازارو ئەشکەنجە بچێژین.

لە ژوورێکی گرتووخانەی تایبەت بە ئەورووپاییان بەندکرام. هەرچەندە تارادەیەك لەگرتووخانەی نیشتمانییەکانی میسر چێتر بوو بەڵام هێشتا پەنجەرەی بچووك و بەرزی گیراوو دەرگای لە دەرەوەرا بەقفڵ و شمشێرە گیراوی هەبوون. پاشی چەند ڕۆژێك ئینگلیز هاتن و بردمیان. بیرم لەسەرەنجامی خۆم نەکردەوە، چونکە گومانی تێدا نەبوو ئەوان یادگاری چاکیان لەمەر ئەو کەسەوە نەبوو کە ویستبووی لەناوچەیەکی هەرەگرنگ، لە کێڵگەکانی نەوت ئاژاوەیان بۆ بنێتەوە.

حەزم دەکرد پاشی ئەوبیست و هەشت ڕۆژەی ئەو زیندانە، ڕووداوەکە پووش بەسەر بکرێو بمبەنەوە کامپە گرتووخانەکەی جاران. بەڵام وادەرنەچوو. دوای سەعاتە ڕێیەك ڕۆیشتن، ئۆتۆمۆبیلەکەی منی تێدا بووم وەستا. کاتێ هاتمە دەرەوەو سەیری دەوروبەرم کرد، لەترسانە زارەترەك بووم. دوای سێ ڕۆژان لەبەر ئەو دەروازەیە وەستام کەزیندانە ناهەموارەکانی تۆژینەوەی (مەعادی)یان لە پشتەوە بوون. کاتێ دەرگام لە پشتەوە پێوە درا، دڵم داتەپی. ئەوا جارێکی تر هاتمەوە ئەو شوێنەی خاچی سوور پێی نەدەزانی. ئەو شوێنەی وورەی بەرگرتەنیی مرۆی تێدا دەبەزیو پەبێ لە سێدارە دان تا مردن جەزرەبە دەدرا.

لەسەر جێیەکەم هەڵترووشکام و سەرنجم بۆ پەنجەرەکە هەڵبڕی. لەهەمان زیندانە دزێوە چەپەڵەکەی جاران بووم، هەر ئەوە نەبێ لە زیندانێکی ئەولاترەوە بووم.

هەستی بێزارییو دڵ بەباری دایگرتم. هیچ شتێك دادی نەدابوو. هەر چەندە چەندین باوەش خواردەنیم بۆ خۆشەویستانم ناردبوووەوە نیشتمان بەڵام هیچ وەڵامم بۆ نەهاتبووەوەو نەشم دەزانی بارو گوزەرانیان چۆنە. پێم وابوو دەبێ بەدەردی برسێتییەوە مردبن. ڕەنگە خواردەنییەکانیان بەدەست نەگەیشتبێ یان ڕەنگە زۆر درەنگ گەیشتبێ. یەکێ سەربەستییەکی تازە دەست کەوتووی دۆڕاندبێو سەبارەت بەباری ناهەمواری ماڵ و منداڵیەوە تەنگاو بووبێ، ئەو کەسە هەموو خەیاڵێکی ڕەشبین بەبیرو مێشکیدا ڕادەبوورێ.

بەڵام سەرەڕای هەموو شتێك، هێندەی نەبرد هێور بوومەوەو بزەخەنینەم هاتێ. دڵی خۆم بەوەدایەوە کەتەنیانیم. خوام لەگەڵە. خوا دەست بەباڵەوە دەگرێو دەمپارێزێ.

چەندیادی زایین (christmas)م لەمەوپێش لە زیندان بەسەر بردبوون، کاتێ نالەبارو ئاستەنگی ژیانم بوون. دەمزانی کۆمەڵێك خۆشەویستی دڵ و گیانم لە شوێنێکی ئەم دنیایەن، بەدڵی بەخەمەوە چاویان بریووەتە تاریکایی شەوو یادم دەکەن. چاوم دەگرتە ئەستێران وەك بڵێی ئەم ئەستێرانە پردێکم لەگەڵ نیشتمان بۆ دروست بکەن. هێند بێ دەرمتان و بێ ئەنوا بووم، هێند لێو بەبارو دڵتەنگ بووم، هەر ئەوەم لەدەست دەهات بەناڵەو گریەی بێ دەنگ کوڵی دڵ برێژم و هەندێ ووشەی کپ و نەبیستەنی بۆ (ئەو) بنێرم کە ئێستا منداڵ بوو و لە بێشکەی خۆی ڕاکشابوو.

ئەمجارە وانەبوو. ئاهەنگی زایینی ئەمساڵم تایبەت و بەتەنیایی بوو، لە گەڵ گیانی خۆم بوو.

چاوم بە هەمـوو شتێکی دەورو بەرم گێراو، هەر دەتگوت بەسەرهات و ڕووداوی ناوفلیمە، بەبێ ئەوەی بێـزارم بکـەن بەبـەرچـاومەوە ڕادەبردن. دەنگی سەربازانم هاتەگوێ، بەسەرخۆشییەوە (شەوی کش و مات)ی کتێبی پیرۆزیان بە ئینگلیزی دەگوتەوە. لەدڵی خۆمەوە گوتم هەی ئیبلیسنە! لەجـەژنی زایینی ئەمجارە، لەجیاتی ئەوەی وەکو جاران خۆراکمان لەناو دەفری کۆنە تەنەکەی ژەنگـاوییـەوە بدەنێ، لەنـاو ئامـانی سپیو پاك و بەدەستی پاسـەوانـان خۆراکیان بۆناردین، یەکەمجاریش بوو پارچـە مریشکێکی بەسەرەوە بێ. لەبەر ئەوەی من بڕیارم دابوو ئیتر گۆشت نەخۆم، ئاهەنگی خۆم بەو چەند پارچە پەتاتەیە گێڕا کە لەگەڵ خواردنییەکەیان ناردبوو. ئەفسەرێك زیندانەکانی یەکە یەکە بەسەر کردەوەو جەژنە پیرۆزەی زیندانییەکانی کرد، نازانم هەر بۆگاڵتە بوو یان بەڕاستیی بوو. بەڵام ڕاستیشت دەوێ شتێکی نائاسایی بوو پیاو لە زیندانی لیتۆژینەوەی مەعادی ئاهەنگی جەژنی زایین بگێڕێ. بۆی گرژیمەوەو پرسیم: «کەواتە هەر تۆی ئاهەنگی جەژنی زایین بکەی؟»

وەڵامی دامەوە: «بەڵام تۆش ئەمڕۆ چێشتت لەناو دەفری سپی بۆ هاتووە. وانییە؟» گاڵتەم بەو ڕەفتارە نابەجێیەی ئەو هات و جارێکی تریش بۆی گرژیمەوە. گوتم لەوانەیە ئەم پیاوە سکۆتلەندی بێو تەنیا بۆ خۆرانان و پیاوەتی نواندن وابکا. هەر بۆ خاترانەو دەم و دوو لەگەڵ کردنم گوتی «هیچ هیوایەکت هەن؟» گاڵتەم پێ هات، گوتم «نەخێر گەورەم،» ئەو نەیدەزانی ئەمەم زۆر بەڕاستی بوو. ئاواتی من سەرفرازی بوو، دەمزانی ئەم ئاواتەشم لەسنووری دەسەڵاتی ئەو بەدەرە. زۆرم پێ ناخۆش بوو کاتێ زانیم فرێدرێکی هاوڕێشم گیراوە. لە هەمان ئەم باڵەخانەیەی خۆمان بوو، چەند زیندانێك لێمەوە دوور بوو.

ڕۆژێکیان لە گۆڕەپانی مەشقـدا بینیم، کاتێ تیشکی هەتاو لە ناوبڕە لە گوش دروستکراوەکەی دەداو ڕۆشنی دەکردەوە، تیلەی چاوێکم گرتە ئەو دیوو.

پاسەوان چاویان لێ نەبوو، زەینی خۆم دایێ، تارماییەکەم کەوتە بەر چاو هاتۆچۆی دەکرد. لەدڵی خۆم گوتم هەوە هەونییە؟ ئەمجارە سووڕامەوەو کاتێ گەیشتمە ڕاست بەڕاستی ئەو، پرسیم: گەلۆ دەبێ ئەمە فرێدریك نەبێ؟ بەسەری زار ناوی ئەوم چرپاند. وەڵام نەبوو. جارێکی تر دووبارەم کردەوە، ئەمجارە بیستی. ئەویش بەمە سەرسام بوو.

ڕۆژانی دواتر، هەر جارێکی وا هەڵ بکەوتایە هەردووکمان پێکەوە لە گۆڕەپانەکە بین، بەچەند ووشەیەکی سەیرو کورت و بەدەنگێکی چپە دوو سەربردەی خۆمان بۆ یەکتر دەگێڕایەوە. توانیم ئەو شتەی لێ تێبگەم کەوا دوای ماوەیەکی کەمی پاش گیرانم نامەیەکم لە ژنەکەمەوە بەناوونیشانی هاوەڵێکی میسری بۆ هاتبـوو. نەیدەزانی ڕاست و دروست ئەو نامەیە چیی تێدا بووە، بەڵام وا دیاربوو ماڵ و خێزانەکەم باش بوون.

فرێدرێك بەهۆی ڕێکەوتێکی بەدبەختییەوە کەوتبووە دەستی پۆلیس. ئەوان بەدوای خەڵکی تر گەڕابوون و لەکاتی پشکنین ئەویان بەگیر کردبوو. ئەگەر باوەڕم بەوە نەبوایە هەمو شتێك لەئەنجامی ڕێکەوتەوە ڕوو دەدا ئەوا یەکانگیر بوونەوەی ئێستامانم بە بە چارەنووسێکی کڵۆڵ دادەنا. بەڵام. ئەمە ڕێنوێنی بوو، ڕێنوێنییەکی خوداییانەی ژیرانە بوو هەردوومانی بۆ یەکتر لێرە کۆکردبووەوە.

# پچڕینی کۆت و پێوەند

ماوەیــەك پاش ئەوەی فریـدریکم بینی، هەستم بەهــەوای ناسازو بەدیوومی مەعادی کردو نەمدەتوانی ئەو دڵەڕاوکەیە لە دڵ وەدەرنێم کە ئێستا پیلانێکی دژ بەمن لە گۆڕێدایە.

رۆژێکیان کاتێ دەرگای زیندانـم بەسەردا کرایەوەو چاوەشی ئێشکگر ئاماژەی دام کەل و پەلم کۆکەمەوەو بەگەڵی کەوم، ترسم هاتێ. ئامێر ئاسا، وەك چەندین جاری پێشوو پەشتەماڵ و بەتانیم لوول کردو لەبن هەنگڵم نان. سابوون و فلچەی ددانم بەدەستەوە گرت و بەناو داڵانەکەوە بەدوای کەوتم. دەرگای دوا زیندانی کردەوە، پتر سەرسام بووم: فرێدریك لەوێ دانیشتبوو! کەیفی پێکەوە بوونمــان بێ سنوور بوو. تائێستاش سەرم سوڕ دەمێنێ چۆن بریاریان دابوو دووکەسی ئەوتۆ شایانی لە سێدارەدان بن لەیەك زیندان کۆبکرێنەوە.

ئیتر ئاوەها بوو، فرێدریك پێی گوتم ئەویش هەمان هەستی نالەباری هەیەو پێی وایە خەریکن پیـلانێکی لە دژ دەگێڕن. ئەم هەستە دنەی دابوو بیر لە چارەسەرێك بکاتەوە چۆن لەم زیندانە دەربچێ‌و، ڕێوشوونێکی لەم بارەیەوە دانابوو. زۆرم سەربەم بیرو ڕێوشوونەی ئەو سوڕما. چەندین کەسی بەرەمەرگان لەمەوپێش لەم زیندانە ڕۆنیشتبوون و بیریان لەسەرەو دەرێك کردبووەوە، بەڵام وەك من زانیبم کەسیان دەرنەچووبوون.

سەرنجمی بۆلای پەنجــەرەی زیندان ڕاکێشا. ئەم پەنجەرەیە تەنیا شتێ بوو چاکی بناسم. لەسەردەمی گیرانم لە زیندانی تاکە کەسیی گرتووخانەی (مەعادی) چەندین مانگی دووری درێژم لە پشت ئەم پەنجەرەیەوە بەسەر بردبوو. ئەوکات لە شەوانی ساردی ئاسمان پڕ لە ئەستێرە، یان لە ڕۆژانی گەرمەتاو، بیرو خەیاڵم لەم پەنجەرەیەوە بۆ دنیایەکی چاکتر دەفڕین.

پەنجـەرەکـە، مەتـرێـك لەســەر زەوییــەوە بوو، ۲۰ر۱ مەتـر بەرین و ۵۰ر۱ مەتر بەرزبوو. چوارچێوەکەی دارین بوو، ئەستووریی دوازدە سانتیمەتر و بەپانی هەژدە سانتیمتر بوو. ئەستوونە ئاسنینەکان تا بڵێی پتەو بوون و ئەمسەرو ئەو سەریان زۆر توند بەسترا بوون. ئەم ئەستوونە ئاسنیانە لەگەڵ کونی تووڵە ئاسۆییەکان تێك هەڵکێش بوو بوون. هێشتا لەبیرمە، جارێ لەجاران تەواو هومێدبڕا بوو بووم و هیچ شتێکم لەناو زیندانەکەم وەگیر نەدەکرد خۆمی پێ هەڵ بواسم، تەنانەت تووڵە ئاسۆیییەکانیش بەکەڵك نەدەهاتن، بەشێوەیەکی ئەوتۆ بەسترابوون هەرخۆت پێوە هەڵ واسیبایە دەم و دەست لە گرێژنەوە دەردەچوون. لەجیاتی شووشە، میناکانی بریتی بوون لە فەیبەری سپی‌و، لەرووی ئەودیوویش دوودەریی دارینیان هەبوو.

فرێدریك گوتی: «هەموو شتێکم بەهۆی پارچە داوێکەوە پێواوە.» برۆی هەڵکشاند، لێوی خۆی کرۆشت و وەك هونەرومەرێك دەستی بەرزکردەوە، پەنجەکەڵەو پەنجە شادەی خستنە سەریەك و پەنجەکانی تری بەرەو ژوور هەڵبری.

«تاکە یەك شیمانەی چوونە دەرەوە هەیە، ئەویش بەتاکە کەسێك ناکرێ، بەڵام بەدوو کەس دەکرێ. لەهەموو شتێ تر پێویستمان بەدان بەخۆداگرتنە، چونکە ئێمە دەزانین ئەگەر لەم کارە بگـیرێـین ئەوا کارمــان کراوە، لەلایــەکی تریشەوە هەردووکمان دەزانین ئەگەر لێرە بمێنین ئەوا

چارەنووسمان لەمەترسیدایە، بۆیە نابێ خۆمان بەهەموو شتێ دابدەین و شێتانە هەڵسوکەوت بکەین! هیچ سەرەودەرێکی ترمان نییە. دەبێ شتێ بکەین و زۆریشی لێ بەپەلەبین.
دەستی دایە داوەکەو لە پەنجەرە نزیك بووەوە.
«دووریی نێوانی دوو تووڵ کەمترە لەوەی کەسێکی پێوەبچێ.»
شوێن دەستی ئەوم بینی.
«هەروەها دووریی نێوان دوا تووڵ و چوارچێوەکەی تەنیشتی هێشتا کەمتریشە.» گوتم راستە.
گوتی: «ئەگەر ئەم چوارچێوە دارە لێرە نەمێنێ،» سرتەم لێوە نەدەهات. «هێشتا نێوانیان بەشی ئەوە ناکا پێوەی بچین.» هەناسەم سارد بوو.
«کەواتە یەك رێگای گونجاو هەیە بۆ دەرچوون.»
ئەمەش ئەو رێگایە گونجاوە بوو کەئەو مەبەستی بوو. بەووریایی سەرنجم بۆ شل کرد. «دەبێ بەشێك لە دیوارەکە لادەین.»

پێکەنیم، پێم وابوو ژیانی درێژخایەنی بەندیخانە، فرێدریکی لە ئاوەز بێبەری کردووە. وام دەزانی ئێستا نەخشەیەکی لەبارو گونجاوم بۆ دەکێشێ، بەڵام دیارە پیاوە بیرتیژ و لێهاتووەکەی جاران نەماوەو خەیاڵ پووچێکی بیر بەتاڵ شوێنی گرتووەتەوە. وورتەم لە خۆم بری و گوێم بۆ شل کرد، زۆر بە ئاووتاوە پیلانەکەی خۆی بۆ باس کردم. بە چرپە دەدوا نەبادا کەسێك لە دەرەوە گوێی لێمان بێ.بەتیلەی چاویش سەرنجی دەگرتە کونی سەرانسۆی ناو دەرگاکە. ئەو کونە هەندێ جاران بە بێدەنگی دەکرایەوە، یان کتوپڕ دەرگا دەخرایە سەرگازی پشت و زیندانییەکانیان دەپشکنی.
«هەروەها پێوانەی ئەوەشم کردووە چەندی دیوارەکە لادەدەین بۆ ئەوەی سەری پێوە بچێ. دوای سەربردنە دەرەوە دەبێ بە خۆبەکێش کردن و خۆ پاڵ ئان لەشت بۆ دەرەوە بجووڵێنی. ئەم شتەش هێندە سووك و سانا نییە».
سەرتاپام بوو بووە گوێ چۆن ئەم‌شتانەی هەموو ئەزموونیوە؟ بەهۆی چوارپایەکانەوە. ئەم چوارپایانە بە هۆی دوو تووڵە شیشەوە پێکەوە بەسترا بوون.
دووریی نێوانی دوو چوارپـایەکە کتومت هێندەی ئەو پانییە بوو کە دوای لابردنی ئەستوونی چوارچێوەی پەنجەرەکەو کوڵینی دیوارەکە پەیدا دەبوو.
ئیدی خۆم بۆ نەگیرا، سووکە پێکەنینێکم هاتێ. (لەبەرامبەر ژیری ولێزانینی‌ئەم بلیمەتە دەستەو ئەژنۆ وەستام.)
«با لە ئێستاوە پێت بڵێم ئەزیەت دەکێشی، سەرەتا سەرو کەللەت دەبەیە دەرەوە، پاشان دەکرێ خۆت بەکێش بکەی و لەشیشت ببەیە دەرەوە.
گوتم: فرێدریك تۆبیلمەتی!»
لەبەردەمم وەستا بوو، پارچە داوەکەی بەدەستەوە بوو.
سەیری کردم. هەستم کرد ئەوا بە خەیاڵ گەڕاوەتەوە قاهیرە، گەڕاوەتەوە ئەو شوێنەی ماوەیەکی باشمان بە ئاسوودەیی تێدا بردبووە سەر.
پێش ئەوەی دەست پێ بکەین، بڕیارمان دا بۆ دواجار کۆششێك بکەین بەڵکو بمانبەنەوە لای بەدیل گیراوانی شەڕ. هەردووکمـان پێکـەوە بە پاسـەوانـەکـەمـان گوت دەمانەوێ ئەفسەری

ئێشککگرببینن له ماوەی سێ ڕۆژان هیچ دەنگ و خەبەرێك نەهات. گوتمان نەخێر پێی ناوێ، با بەخۆمان کەوین.

گرفتی ئێمە تەنیا له پەنجەرە دەرچوون نەبوو. گەلێ کەندو کۆسپی تریش له دەرەوە هەبوون، دەبوو بەسەریاندا زاڵ ببین. مەڵبەندی لێتۆژینەوە بە سەربازی پرچەکی ئینگلیز دەورەدرابوو و بەخۆیان و بە (سۆلی کرێپی) و سەگی پاسەوانییەوە لەوناوە دەخولانەوە. ڕۆژی پێشوو بە چاوی خۆم پێنجم لێ ژمارد بوون. پەرژینی تەلبەندی درواوی چواردەوری سەربازگەکەی گرتبوو.

بەدرێـژایی شەو تیشکی ئێشکگرانەی بەسەرەوە بوو. هەروا کەندرێکی پان و بەرینی پڕ له سیان و چڵپاویش له سەر ڕێگا هەبوو، وێڕای ئەمانەش سەربازگە کە زۆر گەورە بوو، دەبوو زوو له سنووری ئەویش دەربچین.

ئیدی هەڵاتن کارێکی هێندە ئاسان نەبوو.

★★★

دوای مانـدوێتی و ئازارێکی زۆر، توانیمان بزمارێك له جومگەی سەرپەنجەرەکە دەربێنین و بەهۆی ئەم بزمارەوە خۆمان بە ئەستوونە دارینەکەی دەستەچەپی چوارچێوەکەوەـ لەو شوێنەی تووله ئاسۆییەکەی دەچووەوە ناو، خەریك بکەین.

دەمـانویست چوارچێوە ئەستوونییەکە لێرەو لەو شوێنەش کە تووله ئاسۆییەکەی دووەمی تێوە دەچوو، ببرینەوە. بەمەش تەواوی ئەو پارچە ئەستوونەمان دەردەهێنا.

ئیدی بە هۆی ئەم بزمارەوە دەستمان کردە هەڵکۆڵین. کونێکی بچووکمان کرد. پاشان تا دەهات کونەکە بەبەرەوە دەچوو. پاش ئەوەی بزمارەکە کورت دەهات و نەدەگەیشتە مەبەست، پارچەتێلێکی چوارپایەکەمان بەکار دێنا. هەموو ئەم شتانەمان لەبەر لووتی پاسەوانان دەکرد. دەمانزانی ئەگەر بەم کارەوەمان بگرن چ دەردێکمان بەسەر دێنن.

پێشتر زانیبووم ئەو گیراوانەی ئەم جۆرە کۆششانەیان کردبوو چۆن گیرا بوون و چۆن له ناوەندی گۆڕەپانی گرتووخانە لەژێر دارانیان کوشتبوون.

کاتێ یەکێکمان خەریکی کار دەبوو، ئەویترمان لەناوەندی ژوورە کە دەوەستا، هەناسەی له خۆی دەبری و گوێی بۆ هاتنی پاسەوانان ووشت دەکرد. نانمان هاری بووو شێلا بوومان بۆ ئەوەی کونـەکەی پێ پڕ بکەینەوە. هەروەها ئاردە داریشمان ئامادە کردبوو بۆ ئەوەی بیپرژێنینە سەر شوێنی کردەوەکەمان . ئیتر بەم شێوەیە هیچ شوێنەوارێکی کردەوەکەمان له دوورەوە نەدەبینرا. بەڵام ئەگەر بهاتایە و یەکێك له نزیکەوە سەرنجی بدایە ئەوا هیچ شاردنەوەیەك داینەدەپۆشی و دادی نەدەدا.

گەیشتینـە ئەو شوێنـەی بتوانین لەمەودوا لەکاتی لەبارو پێویست چاومان له نزیکبوونەوەی دوژمن بێت. دوژمنیش ئەو دووپاسەوانە بوون یەکێکیان ناو بەناوێك له کونی سەرانسۆی دەرگاوە دەمانی پشکنی و ئەویتریش له دەرەوەڕا چاوی له پەنجەرەی زیندانەکان دەبوو

ویستمان بە هۆی ئەو پارچە گۆشتانەی لەگەڵ خواردنیمان وەردەگرت، سەگەکان کەمۆ بکەین. فرێدریکیش خۆم ئاسایی گۆشتی نەدەخوارد و بەمیوە ژەمی دەگوزەراند.

بۆ ئەوەی بتوانین ئەو سەگانە ئاشناو هۆگری (بۆن)ی خۆمان بکەین و بە ئاسانی بێنە دوامان،

لیکاومان بۆ دەرژاندنە سەر ئەو گۆشتەی بۆمان فڕێ دەدان.

لەسەردەمی بەرێوە گەڵی جارم بۆ دەرکەوتبوو، ئەو کاتانەی ئێمەیان دەبردە گۆڕەپانی مەشق، زیندانەکەمیان دەپشکنی. بۆ ئەوەی دڵنیابین ئایا تا ئێستاش ئەم شتە دەکرێ ، فیلّ و تەڵەکەیەکمان دانایەوە. پەنجەرەمان بە گۆشەیەکی تایبەتی دەکردەوە و کورسیمان بە بارێکی پێوانەیی دادەناو بەتانییمان بە شێوەیەکی تایبەت دەپێچایەوە.

هەموو جار کاتێ دەگەڕاینەوەو دەمانبینی دەسکاریی هیچ شتێکیان نەکردووە، لە خۆشیانە شاگەشکە دەبووین. ئەو کونەی کۆلّیبوومان هێشتا بچووك بوو، بەلاّم هێندەی نەمابوو جارێکیان دووچاری بەلاّیەکمان بکا.

لەسەر لێوی پەنجەرەکە بە پێوە وەستا بووم، دەستێکم بە شیشەکانەوە گرتبوو و بە دەستەکەی تریشم خەریکی هەڵکەندنی بەشی سەرەوەی چوارچێوە دارینەکە بووم.

کتوپڕ تارمایی عەریفە پاسەوانەکەم هاتە بەردەم. ئاگام لە هاتنی نەبوو، نەمزانی لە کوێوە پەیا بوو. عەریفی تاین سەرنجێکی سەرتاپاگری دامێ. بینینی ئەم پاسەوانە وای لێ نەکردم لە ترسانە بازێك هەڵدەم و لەپەنجەرەکە دابەزم. دەسبەجێ بیرێکی وا چاکم بۆ هات چاوی عەریفەکەی نووساندو و نەیهێشت ئەو زەندۆڵە گەورەیە ببینێ یەکراست لەبەر لووتی هەڵکەندرابوو (چەند ڕۆژێکی دواتر جارێکی تریش ئەم پاسەوانەم بە فێڵ و دەھۆیەك فریوودا)

هەر بە پێوەوە، قۆڵێشم هەر لە ناو تووڵە شیشەکانەوە بوو، بۆ ئەوەی کونەکە پەنا دەم و بیشارمەوە، هەروەها سەرنجی عەریفەکە بۆ لای خۆم بەکێش نەکەم، وەك مەیموونی ناو قەفەز بەلاس و پەلاّسدا دەچووم، بە ئینگلیزی هاواری فرێدریکم کرد و گوتم : «کورە پیاوی چابە ئەو. بەتانییەم وێ دە، ئەوا ڕۆژ لە ئاوابوونە، دەبێ ئەمشەویش لەناو نوێنی بۆگەنی بنووم.»

بە پەلە بەتانییەکەی دایە دەستم و، منیش بەسەر پەنجەرەکەوەم هەڵواسی. هێشتا ڕۆژ ئاوا نەبوو بوو.

ڕووم لە عەریفەکە کردو گوتم «ئاوەها باشە وا نییە؟»

عەریفەکە هیچی نەگوت و ڕۆیشت.

لەترسانە زاڵەترەك بووین، بەلاّم باش بوو هیچ شتێ ڕووی نەدا. هەروا دواتریش کاتێ چووینە گۆڕەپانی مەشق و گەڕاینەوە، نەمانبینی هیچ پشکنین مشکنینێك لە ئێمە کرابێ.

بەرە بەرە پتر لەم کارەمان شێلگیر دەبووین و لە جاران پتری لێ دەخەپتین سەرەنجام ئەستوونە دارینەی چوار چێوەی پەنجەرەکە لەم سەرو ئەو سەرەوە هەڵتەکاو جومگەی لای دەستەچەپی پەنجەرەکە شل بووەوە. زۆر بەوریایی بزمارەکانمان لێ هەڵکێشان و پاشان دوولەتمان کردن. لەتەکان و سەرە بزمارەکانمان شێردنەوەو هیچ شوێنەوارێکمان لەوناوە نەهێشتن.

ئەو پەنجەرەیەی جاران کۆسپی سەر ڕێگای دەرچوونمان بوو، ئێستا بە ئاسانی بەلای دەستەچەپدا دەکرایەوە. هەروا دیووی دەرەوەی پەنجەرەکەش کە ڕێگای دەرچوونی لێ دەگرتین ئەویشمان بە هەمان شێوە چارەسەر کرد.

ئەو کاتەی ویستمان ئەستوونە دارینەکە بئەزموونین و بزانین ئاخۆ لادەچێ یان نا، کاتی هەرە

ناسك و تەنگاویمان بوو. چاوەنۆڕ بووین تا تاریکان داهات و پاسەوان چوون شیومان بۆ بێنن و نانی خۆیشیان بخۆن .

فرێـدریـك بەرەنگـاری پەنجـەرەکە بوو و دارەکەی بۆ نەدەهاتە جوولان. ئەمجارە توندتری راکێشـا، هەر سوودی نەبـوو. پاشـان تا هێـزو توانی هەبوو دارەکەی راکێشاو، بەشێکی ئەو ئەستوونەی کە پێشتر دەستمان پێ نەکەوتبوو هەڵکەندراو شرقەژنێکی توندی لێ هەستا.

ئەمجارە نۆرەی فرێدریك بوو لە ترسانە سپی هەڵگەرێ. نابێ ئەوەمان لە یاد بچێ کە دەبوو بەپێی رێوەرەسمی گرتووخانە سەرتاسەری کامپەکە هەمیشە بێدەنگ وکشومات بێ نەدەبوو کەس بە دەنگی بڵند بدوێ، ئەمەش بۆ ئەوەی پاسەوان و ئێشکگر ووریای هەموو جووڵەو زەڵەیەك بن. بەڵام ئەو شرقەژنە بە دەنگ و زایەڵەیە سەرتاپای گرتووخانەی وەك شارەزەردەواڵە لێمان دەووروژاند.

ئەو کاتـەی کارمان لە ئەستوونە دارینەکەی چوارچێوەکە دەکرد، دیوارەکەی پشتیەوە لەزۆر شوێن درزی دەبرد و تۆز و خۆڵی لێوە دەرژایە ناو کەلێنی دارو دیوارەکە، پاشانیش دەرنەدەهات .فرێدریك فووی لێ کرد و تۆزەکەی هەڵدایە دیووی دەرەوەی پەنجەرەکەو ئەستوونەکەی گێرایەوە شوێنی خۆی. ئەم هەویرەنانەی پێشترمان ئامادە کردبوو بەپەلە خستمە ناو کونەکان و بەتۆز و خۆڵم داپۆشی، ئیتر ئێستا نا ئێستا پاسەوان و ئێشکگرمان لێ پەیدا دەبوون.

دەبـوو خۆمـان بەدیمەنێکی بێوەری و بێ ئاگا نیشان دەین و، خۆمان بدەینە پاڵ پەنجەرەو سەیری دەرەوە بکەین. هەڵبەتە زیندانییانی تریش هەر وایان دەکرد. دەبوو خۆمان بەشێوەیەك دەرخەین گوایە ئێمەش دەمانەوێ بزانین سەرچاوەی ئەم بشێوییە چییە و لە کوێوەیە، بەشێوەیەك خوبنوێنین کەس مەزەندەی ئەوە نەبات کەوا ئەو دوو زیندانییە مەسەلە ـ تایبەتەی لە ژووری ژمارە (دە) ن هۆی هەموو ئەم ئاژاوەو بێزارییەن.

ئیدی لەو رۆژەوە دەستمان لەکار هەڵگرت و، لە بارێکی پڕ ترس و لەرزە ژیاین. درۆم نەکردووە ئەگەر بڵێم ئەوەندە کاتەی بەم کاری هەڵاتنەوەمان بووین بەلای کەمەوە پێنج ساڵی تەواوی لە ژیانم بەسەر بردبێ.

لەگەڵ هەراکردنی پاسەوانان و بڵاوبوونەوەیان بەم ناوەدا ، هەتا بڵێی دڵ بەترس و نارەحەت بووین، هەرچی فێڵ و تەڵەکەی ئامادەمان کردبوون هەموومان بەکارهێنان

بەڵام هیچ شتێك، هەر هیچ شتێك رووی نەدا.

بەیـانیی رۆژی پاشتـر، پاسـەوانی ئێشکگر دەگۆرا. دەبوو سەرۆك پاسەوان خولێکی سەر پێییـانـەی ناو زیندانەکانی بدایە و بەدڵێکی نیاوە ئەرکی پاسەوانێتی بگرێتە ئەستۆ. ئەم ئەرك گۆڕانە وای دەکرد ئیتر کەس بیر لە دەنگە گەورەکەی دوێنێ نەکاتەوە. بەڵام پێویست بوو زۆر بە چاکی خۆمان بۆ هاتنی لە ناکاوی سەرۆك پاسەوان ئامادە بکەین.

بلیمەتی و پێشبینی کردنی فرێدریك هاتە فریامان. زۆربەووردی بیری لە دەروونایەتی مرۆ بەگشتی و دەروونایەتی ئەم پاسەوانانەی لەمەڕ خۆمان ـ کردەوە و پاشان سەری دڵنیابوونی راڵەقاند.

مێزێکی بچووکمان لەبەر پەنجەرە هەبوو. لە هەردوولاوە دوو کورسی داندرابوون. مێزەکەمان

کەمێك بۆلای چەپ ڕاکێشاو یەکێ لە کورسییەکانمان هێنا لە بەرامبەریمان دانا. پاشان لای چەپی پەنجەرەکەمان داخست بۆ ئەوەی کەس نەچێ بەلایەوە ودەستی لێ نەدا (ئەگەر بهاتایەو یەکێ دەستی لەم لایەی پەنجەرەکە بدایە ئەوا کارمان لێ ئاشکرا دەبوو، پەنجەرەکەش دوولەت دەبوو).
کورسییەکەی تریشمان هێناو کەمێك دوورلەبەری ڕاستی مێزەکەوەمان دانا، ڕووی کوسییەکەمان کەمێ بۆ لای خۆمــان سووڕانــد. ئــەم بارە نزیکبوونەوەی بێ ماندوو بوونی دەدایە ئەوکەسەی بیویستایە پەنجەرەکە بکاتەوە. لای ڕاستی پەنجەرەکەشمان بە واڵایی بەجێ هێشت بۆ ئەوەی هێنان و بردنی کردنەوەو پێوەدانی پەنجەرەکە ئاسایی بێ. ڕۆژی دواتر هاتنی پاسەوان و سەرۆك پاســەوانمــان بە چاکی بیست .بۆمان دەرکەوت سەرۆك پاسەوان بەینێکی تەواو لە زیندانەکان بەسەر دەبات. گوتمان ووریابن کورینە، خۆتان مەشێوێنن، ئەگەر نا کارتان کراوە.
قفڵەکــە ڕاهــەژا، دەرگــا کەوتــە سەر گازی پشت وچاوەشێك بە خۆیو کورتە داردەستێکی بن هەنگڵیەوە لێمان بە ژوور کەوت.
«بەیانیتان باش» بە ژێری لێوەوە گوتی.
«بەیانیت باش چاوەش،» خۆمان ئاسایی بە نەرمی وەڵاممان دایەوە.
هێشتــا بە پێوە وەستا بوو، لە چوار دەوری خۆی دەنۆڕی، لەسەر تا بنی زیندانەکەی بە چاو دابیژت. پاشان بەرەو پەنجەرەکە چوو. گیانمان هاتە ناو دەستمان و زەینمان دا هەمان ئەو شتەی دەکــرد کە فرێــدریك پێشبینیی کردبوو، چووە نێوان کورسی ومێزەکەو ئامێر ئاسا چەند جارێك پەنجەرەکەی هێناو وبرد و، تەنیا بۆ ئەرك بەجێ هێنان چەند جارێکی کردەوەو پێوەی دایەوە. وەك چۆن فرێدریك پێشبینیی کرد بوو، ئەرکی ئەوەی نەدایە بەرخۆی بەسەر مێزەکەدا بچەمێتەوەو دەست بۆ چەپی پەنجەرەکە ببا.
کاتێ چاوەشەکە ڕۆیشت، ئاهێکی دڵنیایی پڕ بە سینەمان هەڵکێشا. نەماندەتوانی چیتر خۆمان ڕاگیر بکەین. ئەو پیاوەی ئەرکی پاسەوانێتی ئێوارانی لەسەر بوو زۆری ڕك لێم هەبوو. بەیانیان زوو یەکەمین جار دەهاتە زیندانەکەی من و ئەگەر وەك برووسکە لە چوارپایەکەم دانەبەزیایەم ئەوا هەردوو چۆکی دەهاوێشتە سەرم تا دەنگی تێدا بوو دەیشیراند: «هەستە هەی بیژووی بە خوێن!» حەزم دەکرد ئەو هەڵاتنەی ئێمە کە ئەو بەر پرسی دەبوو، دەردێکی ئەوتۆی بەسەربێنێ هەرگیز منی لەبیر نەچێتەوە.
وەکــو هەمــوو جاران، سەعــات هەشت ئێمــەیان بۆ دەست بەئاو گەیاندن بردە دەرەوە. پاشان گەڕاینەوە زیندان و چاوە نۆڕ بووین تا پاش نیو سەعاتی تر ڕووناکیمان بەسەردا کوژایەوە. پێنج دەقیقە بەسەر چوو، ئینجا بە تانیەکمان لەسەر زەوی لە بەرامبەری پەنجەرەکە ڕاخست بۆ ئەوەی هیچ دەنگێك نەچێتە دەرەوە. ئەستوونە دارینەکەمان لە شوێنی خۆی بزواند و توولە شیشەکانمان بە سابوون چەورو لووس کرد و خۆیشمان تاکەمەر ڕووت کردەوە.
لەمــەو پێش مەشقمــان لەســەر توولە شیشــەی داوێنی چوارپایەکانمانەوە کردبوو و، بەوپەڕی ووردییەوە باشترین شێوەی خۆسووڕان و پێوەچوونمان ئەزموونی بوو و، دەمانزانی چەندی پێوە دەبین. ئێستاش کاتێ ئەوەم بیر دەکەوێتەوە پەراسووەکانم ژان دەکەن. ئەو ئێوارەیە مەشقی پێوە چوونمان لەسەر کونەکە جێبەجێ کرد، کونەکە هێندە بچووك بوو هەرێ ئەوەتا پێوەی دەچووین.

فرێدریك لەمن لاوازتر بوو. لەبەرئەوە ئەو لە پێشەوە چوو. سەرەتا دەستێك و پاشان سەری. منیش لە دواوە پاڵم دەدا تا چووە دەرەوەو لەبەر تیشكی مانگەشەو بەپێوە وەستا. پاشان نۆرەی من دەهات و دەبوو فرێدریك بەو پەڕی تواناوە بۆ دەرەوەم بەكێش بكات. هێندی نەبرد منیش چوومە دەرەوە. هەر هێندە لە باڵەخانەكە وەدوور كەوتباین سەرجەم زیندانییەكان ئێمەیان دەبینیو لەبەر ئەوەی هەموویشیان ئەڵمان نەبوون لەوانە بوو هی وایان تێدا هەبێ زمانمان لێ بدا، ئەم شتە هیچ چارەسەرێكی نەبوو. كراسەكانمان لەبەر كردو زۆر چاونەترسانە وەك شتێكی هەرە ئاسایی بە ناوەندی گۆرەپانی مەشقەكەدا ڕۆیشتین وتا پەنای دیوارە بە گوش هەڵچنراوەكەوە وون بووین.
هێشتا سەگەل دەنگیان لێوە نەهاتبوو ئێمە بەسەر كەندرەكەدا بازمان داو هاتینە پێش ئەو پەرژینە سیمەی تۆڕەكەی بە شێوەیەكی سەیر چنرا بوو. هەر هێندە دەستی كەسێكی پێ بكەوتایە وورشە وورشێكی بەهەراو هۆریای لێوە هەڵدەستا. پەنجا مەتر لەلای ڕاستمانەوە ژوورێكی پشوودان وكات بەسەر بردن هەبوو. هەندێكم لە پاسەوانانی خۆمان لە دەرگای كراوەی ژوورەكەوە كەوتنە بەر چاو. بەری ئەو دیوی پەرژینەكە تەواو ڕووناك بوو. ڕێگایەكی لێ بوو و لەو دیوویشیەوە كانتینێك هەبوو، بەردەوام كۆمەڵێك سەربازی لە پێش وەستا بوون. دەرفەتی بەرەو پاش گەڕانەوەمان نەبوو، دەبوو زۆر چاونەترسانە ملی پێوە بنێین.
پێوە بووم سیمەكە هەڵدەمەوەو ولە بنیەوە دەرچم. كتوپڕ فرێدریك لە پشتەوەرا بەتوندی ڕایكشام.
«سەر هەڵبڕە، ئەوا دووكەس بۆ ئێرە دێن!» چرپاندی.

بەپەلە دەستم لەسیمەكە كێشایەوە، وورشە وورشێكی ترسناكی لێوە هەستا، هەر ئەوەم بۆ كرا بەیاریدەی فرێدریكەوە خۆم لە سیمەكە دەرباز كەم. دوو سەربازم بینی لە دووریی پازدە بیست هەنگاوێكەوە ڕووەو ئێمە دەهاتن.
بروام نەدەكرد ئێمەیان نەبینیێ یان دەنگی سیمەكەیان نەبیستبێ. بە بەرگی زیندانەوە بووم. لە نێوە بەرەو ژوورم ڕووت ولەم بەر تیشكە ڕووناكە، وێڕای ئەمەش ڕێگا چۆڵ وكەسی بەسەرەوە نەبوو. لەوانەیە ئەو دوو سەربازە كەرو نابینا بووبن، ئەگینا هیچ لێكدانەوەیەكی تری بۆ نەدەكرا. كشاینەوە ناو تاریكی ولەوێ هەڵكونجاین تا ئەوان ڕەت بوون. وێ دەچوو ڕۆیشتنەكەیان یەكراست بۆ ژووری پاسەوانان بێ و لەوێ ئاگاداریێك لەم بارەیەوە بدەن. بەڵام هیچ شتێك ڕووی نەدا.
چەند ساتێكی كەم چاوەنۆڕ بووین تا سەر ڕێگاو دەرگای كانتینەكە چۆڵ بوونەوەو ئینجا هەوڵێكی ترمان دا. یەكەمجار من و پاشان فرێدریك، بەهێزی هەردوو لا لە سیمە وورشە وورش كەرەكە دەرباز بووین.
ساتێكی پڕ لە دڵەكوتەو تەنگاوی بوو! هەستاینەوەو بەپەلە پرووزێ خۆمان كوتایە نێو تاریكییەوە. هەموو شوێنێك پڕ بوو لە باڵەخانەو، كۆگەو ئاوەدانی. ترسی ئەوەی نەبادا لە نێو تاریكییەوە دەنگمان بدەن بەڕاستی ترسێكی دڵ ئازار دەر بوو.
زوو گەیشتینە دوا لەمپەرو كۆسپی سەر ڕێگا كەپەرژینە سەرەكییەكە بوو. باش و بە سانایی لێی دەرچووین، ئەوا جارێكی تریش لەسەر خاكی میسر سەربەست بووینەوە. پاش كێشانەو پێوانەیەكی بەپەلە، بە پێدزكە لە سنووری مەعادی دەرچووین. لەبەر ئەوەی هێشتا بە جل وبەرگی زیندانییەوە بووین خۆمان لە ڕێگاو بانان بە دوور دەگرت.

بەڵام برینی بیست کیلۆمەتر بە پێیان بۆ قاهیرە شتێکی سەخت بوو. ڕێگا بە تەواوی لە ژێر دەسەڵاتی پۆلیس بوو، بەری ئەوبەریش زۆربەی زۆری زەنەکاو بوو. جۆگایان لە نیلەوە بۆ هەڵگرتبوون و ئاوێکی زۆریان دەچووەوە سەر. ڕۆیشتنی بە ئۆتۆمۆبیل تاکە چارەسەرێك بوو بەڵام کرێی ڕێگا چۆن دابین کەین.

لە ڕاستیدا، مەعادی گەڕەکێکی جوان دەرەوەی قاهیرەیە و چەند کەسێکی لەوانە لێ بوون کە جاران من مەساژم بۆ دەکردن، بیرم کەوتەوە یەکێکیان پارەی منی لەلا مابوو بەڵام نەدەکرا بەم جل و بەرگەی زیندانەوە بچمە لای ئەوێك منی بە مسیۆ ئۆلاف دەناسی. فرێدریك چوو لە دەرگای ماڵەکەی داو بە ئینگلیزییەکی ڕەوان پرسیاری کابرای کرد. دەرکەوت تازە لەماڵ دەرچووە بەڵام دەتوانێ بە هۆی تەلەفۆنەوە پێوەندیی پێوە بکا. فرێدریك بە تەلەفۆن پێ گوت پارەم پێ نەماوەو وێـگەر هەبێ چەند قرۆشێکم پێ دەوێ. ئایا دەتوانێ یارمەتیمان بدا، گوتی چەندی بتەوێ دەتوانی لە (ناو ماڵ)ەکەی وەرگری. لەو سەرەوە فرێدریك بە بزەی سەر لێوانەوە هاتەوەو پارەشی لەگەڵ خۆی هێنا بوو. بەشی ئەوەی هێنا بوو پێی بگەینە قاهیرەو پێوەندی بە دۆستانەوە بکەین.
چووینە وێستگەی شەمەندەفەر، چاوەنۆڕی هاتنی شەمەندەفەر بووین. تا ئەو کاتە هەڵاتنی ئێمە ئاشکرا بوو بوو وئاگاداریان لەم بارەیەوە ڕاگەیاندبوو، بە هیوا بووین شەمەندەفەر زوو بگات. ئەوە بوو لەناکاو گەیشتەجێ. بەراکردن چووینە شوێنی بلیت برین. خەڵکێکی زۆری لێ مۆڵ بوو بوو. دوو بلیتی قاهیرەم بڕی‌و لێمان دا سوواربووین. خۆمان لە سووچێکی تاریك شاردەوە. ئەگەر یەکێك لێمان نزیك بکەوتایەوە بە ئینگلیزی لەگەڵ یەکتر دەدواین. لەبەر ئەوەی ئێمە لە هەرزانترین پلەی شەمەندەفەر سوار بووبووین، تەواو دڵنیا بووین هیچ سەربازێکی ئینگلیز چاوی پێمان ناکەوێ.

نەماندەزانی تا دوا وێستگە دانەبەزین یان نا. لەوێ هەموو ڕەوتەنی دادەبەزین و دیارە ئێشکگری سوپایی ئینگلیز لە وێش هەبوون. سەرەنجام بڕیارمان دا تا دوا وێستگە بچین. لەوێ دابەزین و خۆمان لەناو ئاپۆرەی خەڵك وون کرد. چاومان لە پۆلیسی سوپایی دەگێڕا، کڵاوە سوورەکانیان لێرەو لەوێ دەکەوتنە بەرچاو. وێستگەکەمان بە پەلە بەجێ هێشت. سواری یەکەمین پاس بووین. پێمان وابوو ئەگەر لەناو پاس بەپێوە بووستین سەرو ڕوومان نابینرێ. کورە گەنجێکی میسری لە بەرامبەرمان وەستا بوو، لە یەکبینە سەیری دەکردین. پاشان بۆمان گرژایەوەو سەرێکی بۆ لە قاندین، هەرچەندە ئەو گەنجە خۆی بە دۆست نیشان دەدا بەڵام ئێمە زۆر بەترس وپارێز بووین. بەپەلە دابەزین و سواری پاسێکی تر بووین و ڕووەو لایەکی تر ڕۆیشتین. چەند جارێك ڕووکاری خۆمان گۆڕی، دواجار گەیشتینە ماڵێك چەند دۆستێکی ئێمەی تێدا بوو.

بە بینینی ئێمە سەریان سوڕ ما. ئەوا گەیشتینە هێمنی وئاسایش. هەڵاتنمان لە یەکەمین لادانی داری پەنجەرەکەوە تا ئێرە لە سەعاتێکی پتر نەبرد.

## بەختیاری و بەدبەختی
## شادی و خەمباری

چوارده ڕۆژ خۆم شاردەوه. دۆستــەکانم به دوامدا دەگەڕان وجل وبەرگ وپارەیان بۆ دەهێنایین. پاشان وەکو گیانلەبەرێکی ڕاوەدوونراو بە پارێزو ماتەماتە هەنگاومان بۆ دەرەوه هەڵێنا. ئەمجارەش کەوتمە پارە کۆکردنەوەو باشترین شت ئەوه بوو پیشەی جارانم هەڵگرمەوه.
بە زەردەخەنەوە چوومە لای یەکێ لە کۆنە نەخۆشەکانم و وویستم بزانم چۆنم پێشوازی دەکا. بەبینینی من تەواوێ سەرسام بوو. وەکو جاران بەگەرمی پێشوازیی لێ کردم. گلەیی لێ کردم بۆچی وەکو جاران شەمووان و سێ شەمووان سەری لێ نادەم. داوای لێبووردنم لەم ولە هەموو ئەو پیاوه باشانەی ئەوێ کردو، پێم گوتن هەندێ جار مسیۆ ئۆلاف ئاووهەوای میسری پێ ناکەوێ، لەبەر ئەوه چەنــد هەفتــەیــەکــە چووبــوومــە سویسرا بۆ ئەوەی بە فرمخلیسکێ بکەم. ئەوا ئێستاش هاتوومەتەوەو تکام ئەوەیە لەم کردەوە نا بەڵەدەم ببورن وئامادەشم دەست بکەمەوە بە چارەسەریان.
«بــەڵام ئەمــڕۆ یان سبەی یان کاتێکی ترسەردەدەی!» هەر ئەمــەی گوت. هەڵبــەتــە ئەم داوای لێبووردنەم درۆیەکی بە ئاشکرا بوو. تا ئێستاش دڵم سەبارەت بەو درۆیەم نارەحەتە. سەرچاوەی گەورەی بەختەوەریم ئەوەبوو نەخۆشکانم تا ئەم کاتە چاوەنۆڕم بوون. ئەمەش جارێکی تر لەوەی دڵنیا کردم کە هێشتا دەتوانم شتێك بەشتێك بکەم.
ژوورێکی بەکرێم لە شوێنێکی دوور لەوەی جارانم دۆزیەوه. ئەمجارەش ناوێکی بە درۆم لە خۆم نا. ناوی ئەمجارەم (فسچەر) بوو، ئەمە ناوێکە بۆ ئینگلیزو فرەنسی وئەڵمانی لەسەر زمان ئاسانە. ئیدی لەلای هەندێ ناساوەکانم مسیۆ ئۆلاف بووم و لەلای ئەوانیتر (فسچەر) بووم.
زۆر زوو گەڕامەوە سەر ڕواڵەتی جارانم و (مەعاد)یم لەبیر چووەوه. جارێکی تریش پارەو پێناسەو کارم هەبوو و پەیوەندیم لەگەڵ ئەم وئەو دامەزراندو دەستم پێ کرد بارگە خواردەمنی بنێرمەوە ماڵەوه. هەندێك لە ناسیاوانم لە هەندێك داوو دەزگای میری بەراشکاوی پێیان گوتم پسپۆرییەکەی تۆمان پێ باشە. ئیدی ترسی گیرانم ڕەویەوەو، تەنانەت ترسی ئەوەشم نەما یەکێك بچێ لەلای پۆلیس زمانم لێ بدا.
زۆر شادو سەربەست بووم و، پاشان بەهۆی ناونیشانی دۆستێکی میسرییەوە توانیم پەیوەندی بەژنەکەمەوە بکەم و بزانم ئێستا چی دەکا. هەروەها توانیم ئاگاداری بکەمەوە کە ئێستا سەربەستم ودەتــوانم یارمەتییان بدەم. ئەوەندەم هەست بە هێمنیو دڵنیایی دەکرد بڕیاری ئەوەشم دا ژن ومنداڵە کەم بهێنمە میسر. بەڵام ئەمە نەکرا. لەوکاتەی ژنەکەم خۆی بۆ سەفەر ئامادە دەکرد لە گەرداوێکی تر ئالام.
شەوێکیان، فەرمانبەرێکی پۆلیس بەئاگای هێنام. زۆر بەئەدەب بەڵام زۆریش بە ڕژدی داوای لێ کردم بەگەڵی بکەوم بۆ گرتووخانە: چەند پرسیارێکیان هەیەو دەیانەوێ لێمی بپرسن. زانیم ئیتر ناگەڕێمەوه.

گوتی وایـان تاوانبار کردووی گوایە تۆ بەدیل گیراوی شەڕیت ولە گرتووخانە رات کردووەو هیچ چارەسەرێکی نییە ئەوە نەبێ بمگرێ. هەروا لە هەمان کات ئاگای لە کارو فرمان وپێوەندیی من هەبوو و داوای لە وەزارەتی ناوەخۆیی کرد فەرمانی بەرەڵلا کردنم بدەن. بەداخەوە وەزیری ناوەخۆ بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك بەسەفەر چوو بوو.

چیم لە دەست دەهات؟ دەبوو لەوێ بمێنمەوە، ڕۆژ بە ڕۆژ چاوەنۆڕ بووم، لە کاتی لێتوژینەوەم لە زینـدانییـانی تر جودا کرا بوومـەوە. لەنـاکـاو ڕۆژێکییـان ئینگلیـز ڕێیـان کەوتـە ئەوێ و بەمـنـیـان زانـی. پاشـان بەبـێ ئاگـاداریـیـەکـی پێـشـیـنـە ڕۆژێـکـیـان هاتـن راپێچیـان دام. هاوەڵ زینـدانـە ئەڵـمـانییـەکـەم لێ بەجێ ما. بۆ یەکـەمـین جار لە ژیـانم. کەلەپچـەیـان لە دەست کردم و لەگـەڵ پەنجـا ڕاکردووی تری زیندانەکانی وولات بردمیان بۆ گرتووخانەیەکی ترانزێتیٚ ئینگلیز.

پاشان کە لەگەڵ ئاوەڵ زیندانەکەم یەکانگیر بووینەوە، گوتی دوای ڕۆیشتنی تۆ هێندەی نەبرد کار بەدەستێکی بەناوبانگی میسر هاتە گرتووخانەو پرسیاری تۆی کرد، زۆر ی پێ ناخۆش بوو تۆ لەوێ نەمابووی، بەڵام زۆر درەنگ داهاتبوو بۆ ئەوەی شتێکی پێ بەشتێك بکرێ. کێ دەزانێ؟ لەوانەیە بەهۆی درێغی و خەمساردیی هەندێك لە فەرانبەرانەوە بەدەست ئینگلیزەوە درابم.

لە گرتووخانەی ترانزێتەوە توانیم بە هۆی دۆستێکەوە هەواڵی گیرانەوەم بۆ ژنەکەم بنێرم. گوتم، بڵێ نەساغ کەوتووەو لە نەخۆشخانە نووستووە. ژنەکەم. تێ دەگەیشت و دەستی لە تەدارەکی سەفەر هەڵدەگرت.

ئەو گرتووخانەیەی سەرەنجام مەنزڵم تێدا گرت، گرتووخانەیەکی تایبەت بوو.

لەنـاوەنـدی بیـابان بوو لەسەر شێوەی ناڵی ئەسپ. گرتووخانەکە بریتی بوو لە (٢٥) زیندان. زیندانەکان دەرگای ئاسنی نارێك و پێکیان هەبوو. باڵەخانەکە بە جۆرێك هەڵکەوتبوو هەتاوی گەرم و بێ بەزەی میسر دەکەوتە سەر دەرگاکان. زیندانەکان تابڵێی گەرم بوون. هەندێك لە گیراوەکان لە گەرمانە ئەقڵیان شێوا بوو و هەندێکی تر ویستبوویان خۆیان بکوژن. ئەگەر بۆیان بکرایە خۆیان بکـوژن و سەربکەوتایەن ئەوا بەبێ ئاگاداریی هیچ لایەنێك دەنێژران، چونکە کەس بە ڕەسمی ئاگای لە زیندانییەکانی ئەم گرتووخانەیە نەبوو. ئەگەر سەریش نەکەوتایەن خۆیان بکوژن ئەوا بێ کەس و بێ دەر لەناو زیندانەکانیان دەکەوتن و کەسیش ئاوڕی لێ نەدەدانەوە.

کەم کەس هەبوو بتوانێ بەبێ مێشك تێکچوون یان زیانی دەروونی لەم دۆزەخەوە دەربچێ.

هەر گەیشتینەجێ، ئێمەیان دایە بەر قۆنداغەی تفەنگ و تف و جوێن و تێهەڵدان و هەریەکەو لە زێندانێکیان پەستاین. بەرینی هەر زیندانێك هێندە دەبوو هەردوو باڵت ڕاکێشی. کونێکی بچووکی لە ساپیتەکەی هەبوو. هەڵاتن لە توانا بەدەربوو.

هەر گەیشتمەزیندان و نەگەیشتم ناڵەو نرکەی زیندانییەکم هاتە گوێ، لە زیندانەکەی تەنیشتمەوە بوو، پێ دەچوو لەمێژ بێ لەوێ بێ.

« بمکـوژن، بمکـوژن، لەڕێی خوا بمکـوژن! ئای زگم، ئای زگم، دایـە، دایە! زگم.لەڕێی خوا بمکوژن!». ئەمە سەعاتێکی خایاند، پاشان ناڵەو هاوار وورده وورده کپ بووەوەو دواجار دەنگ نەمـا. نازانم کابـرا چیی بەسەرهات. بەڵام هەتا بڵێی شتێکی ناخۆش و ئەستەمە گوێت لێبێ

ریندانییەکەی تەنیشتت لەباروۆخێکی ترسناکەو تۆش دەستە وسان و هیچت لەدەست نایەت. بیرم لەوە کردەوە دەبێ چی‌وای لەم کابرایە کردبێ ئاوەها هاوارو ناڵەی بێ؟ دەبێ ئەمجارە نۆرەی من بێ؟

نوێن نەبـوو، دەبوو لەسەر زەوییە چیمەنتۆیەکە ڕاکشێین. پێڵاوەکانم لە سووچێك فڕێدا. ئەم پێڵاوانە تاکە شتێکم بوون. وێنەی ژن و کوڕەکەم کە لە ئۆردووگای بەدیل گیراوانی شەڕ بەدەستم گەیشتبوون، چەندی لە سەرۆك پاسەوان پاڕامەوە ئەمە تاکە یادگارێکەو لێمی مەستێنە، سوودی نەبوو. پیاوە داردەست لەبن کەوشەکەی مەعادیم بیرکەوتەوە، هێشتا ئەو لەم پیاوە پتر لە خواترس و دەروون زیندووتر بوو.

لەدەرەوەی زینـدان، بۆ هەر شوێنێکی بچوایەی دەبوو بەڕاکردن بڕۆی  دەبوو زۆر بەپەلە بۆ ئاودەست ڕابکـەی، سەربازێکیش بەنێزەوە بەدواوەتەوە بوو، فەرمانی پێ بوو ئەگەر یەکێك دوا بکەوێ لە دواوە نێزەی تێوە بژەنێ.

گۆڕەپـانێکی بچووك لەبەردەمی باڵەخانەکە هەبوو. دەبوو گیراوەکان چوار چوار بەجارێك لەبەر تیشکی هەتـاو مەشق بکەن. هەریەکەو لە گۆشەیەك دەوەستا. کاتێ فەرمان دەدرا دەبوو بەرەو گۆشەکەی بەرامبەریان ڕابکەن.. قسەکردن قەدەغە بوو.

ڕۆژێ لە درزی دەرگـاوە سەرنجی دەرەوەم دا. پیـاوێکی خەمبـارم کەوتە بەرچاو. بە بێزاریەو مانـدووییەوە ئەمسەرو ئەو سەریان پێ دەکرد. جووتە کیسێکی کاغەزی لەپێی هەڵکێشا بوو. سەرم سوڕما، ئەو پیاوە فریدرێك خۆی بوو.

بۆ بەدبەختی، ماوەیەکی کەم پاشی هەڵاتنمان کەوتبووە دەستی پۆلیسی سوپاو بەدرێژایی ئەو سێ مانگەی منی تێدا سەربەست بووم، ئەو ڕووت و عوریان لە زیندان دەژیا. ماوەیەکی زۆر کۆتێکی ئاسنیشی بەپێوە بەسترا بوو، هەر هێندەی پێ کرابوو سانتیمەتر سانتیمەتر خۆی لەسەر زەوی ڕابکێشێ. شەرواڵێکی لە کۆنە کیسەی چیمەنتۆ دروست کردبوو. باش بوو ئەمەی دەست کەوتبوو لە پێی هەڵکێشێ، پاسەوانەکانیش حەزیان نەدەکرد ڕووت و ڕەجاڵ بێ.

دراوسێ زینـدانەکەم دەستی پێ کرد بەمۆرس پێوەندیم پێوە بکا. ڕاستەوخۆ لەسەر دیوارەکەوە نامـەمان بۆ یەکتر دەنارد. من زریزەهەڵوەشاوەکەی شەرواڵەکەی خۆمم بەکار دەهێنا. گوێم بە دیوارەکەوە نا. پێی گوتم بەیانی سەعات هەشت مەچەکی خۆی بریندار دەکا بۆ ئەوەی کۆتایی بەم ژیانە کوێرەوەرییە بێنێ، یان هیچ نەبێ بخرێتە نەخۆشخانەوەو لەوێوە ڕابکا. تکای لێ کردم سڵاوی بە خوشکەکەی بگەینم، (ناوونیشانی خوشکەکەی هێندە بۆ دووبارە کردمەوە تا وام لێ هات ئەزبەرم کرد) و بەسەرهاتی ئەوی بۆ بگێڕمەوە.

بەڵام کۆششەکە سەری نەگرت  ئەو مووسەی بەدزییەوە لەگەڵ خۆی هێنابوویەوە زیندان زۆر لەوە کولتـر بوو دەمـارێکی خوێن هەڵگـری پێ ببـڕێ. لەنـاکاو پاسەوانێکی لێ بەژوور کەوت. مووسەکەی لە دەستی ساندو برینەکەی پێچایەوەو لێیدا ڕۆیشت.

هەنـدێ جار هێنـد گەرم دادەهـات، تەنیـا لەسایەی دان بەخۆدا گرتنەوە پیاو دەیتوانی خۆی لەبـەربگـرێ. هەر ئەوەندە کەمێك سەرم بجوڵاندایە برووسکەو ئازارێك لەبرینی سووتانی بەر هەتاوەوەوە دەهات ئەوەندەی نەدەما لەسەلای گریان بدەم.

کاتێ توانای بەرگە گرتنیشم نەدەما، لە دەرگای زیندانەکەمم دەدا، ئاوامم لەبەر دەبڕا، لە پاسەوان دەپاڕامەوە ڕێگام بدەن بچمەی لای بەلووعەی ناو گۆڕەپانەکە. هەر کە ئاماژەی دەدام دەکەوتمە ڕاکردن و بەلووعەکەم دەکردەوە، دەمویست دەم بۆ ئاو ببەم ، بەرەو زیندانیان ڕاپێچ دەدامەوە. ئەمە سادیزمییەك بوو لەو پەڕی.

## گەڕانەوەم بۆ نیشتمان

دوو مانگم لەم کامپە بەسەربرد، دوو ساڵ بوو شەڕ تەواو بوو بوو بەڵام بەو پەڕی نامەردییەوە ئەوروپایی جەزرەبەی ئەوروپاییی تریان دەدا. من تاکە هۆی تاوانبار بوونم ئەوە بوو یاریدەی ژن و منـداڵێکی سەر لێـواری مردنم دابوو، ڕۆژێکیان بەبێ هیچ ئاگادارییەکی پێشینە پێکەوەیان کۆکردینەوەو گوتیان هەمووتان دەگەڕێنەوە ئەڵمانیا.
ئەم شێـوە هەواڵ پێ گوتنەمان جۆرێکی تری ئازاردان بوو. لەپێشەوە دەمردی سەگمان بدەنێ و پاشــان بمانبەنەوە نیشتمان. دەبوو مانگێك دوان لەکامپی بەدیل گیراوانی شەڕ بژیم بۆ ئەوەی لەگەڵ ژیانی ئاسایی ڕابێمەوە.
بەرگـری بەرەڵلاکـردنی سەربـازییان داینێ و پاشان ئێمەیان بردە پۆرسەعید. کەشتیەك لەوێ وەستابوو هەزاران دیل بەسەر پشتەوەبوو. سەرەتا تاسابووم، نەمدەزانی ئەمە چییە! ژیانی کامپی تەمبێ کردن ئەوەنـدە لە ئێسـك و پرووسکم ڕەگـاژۆ بوو بوو بە ئاستـەم لە ژیـانی دەورووبەر دەگـەیشتم. پاش ئەوەی زانیم ئەو دوو هاوڕییـەی خۆیان بەچەتر لەگەڵ هەڵدابووم وا بەسەر کەشتییـەکـەوەن زۆر کەیف شاد بووم. بەتایبەتیش کاتێ زانیم هەردووکیان باشن و یەکێکیان خەریکـە لە ئەقـڵ شێـوانـەکـەی ڕاست دەبێتەوە هەر شاگەشکە بووم. ئەگەر هەواڵی ڕەمزیی (خوێنرا)م و دۆستی بەوەفام بزانیبایە ئەوا کاسەم بەجارێ پڕ دەبوو. تا ئێستاش وێڵی دوای ئەوەم لەگەڵ ڕەمزی پێك بگەینەوە. پاشان زانیمەوە زۆربەی ئەوانەی سەر بە تیپەکەم بوون و لە بنکەدا مابـوونـەوە ڕەوانـەی بەرەی شەڕ کرابـوون. بەڵام زۆر شاد بووم کە زانیم هانزلی برام و هانز کریستۆف بەژیان ماون.
سەرەنجام گەشتی ناو زەریامان دەست پێ کرد. گەشتێکی زۆر بە مەترسی بوو. یەکەمین ڕۆژ دەنگ بڵاو بووەوە یەکێك مرد. لەزەریا ناشتیان. پاشی دوو ڕۆژان یەکێکی تریش مرد. ئەویشیان لە گۆڕنا.
لە گوشێکی کاغەزیان دووری، زنجیرێکی گرانیان لەپێ هەڵکێشا بۆ ئەوەی بەژێر ئاو بکەوێ.
پاشی دوو ڕۆژی ترکاتێ گەیشتبووینە ناوەندی زەریای ناوەراست، پانکەکانی ناوکەشتییەکە کتوپڕ لەکارکەوتن هەوا زۆر گەرم داهات. لەبڵندگۆ پێیان گوتین دان بەخۆدا بگرین، ئاگر لە بەشێکی ناو کەشتییەکە بەر بوو بوو، بەڵام بەربەستی نێوان بەشەکانی کەشتییەکەیان پێوەدا. هەر چەندە ئاگرەکە بەتوندی کڵپەی دەساند بەڵام نەدەپەڕیەوە بەشەکانی تر.
داواجـار لە بەندەرێکی باکووری ئەفەریقا گیرساینەوە، وا بزانم جەزائیر بوو. کات بەیانی بوو. لەسەرپشتی کەشتییەکی بەستراوەی ئاگر تێ بەربووی ناو زەریادا بووین، دڵ و دەروونمان تا

بلێی ناڵەبار بوو. بەم شێوەیەماینەوە تا ئێوارەی ڕۆژی دوایی چووینە بەندەرێکی بچووك، تیپی ئاگر کوژێنەوە لەوێ هەبوون و ئاگرەکەیان بۆ کوژاندینەوە. کونێکیان لە کەشتییەکە کردو ئاویان بەردایە ناوی و پاشان جارێکی تر کونەکەیان گرتەوە.

ئیدی بەو شێوەیە گەشتی گەڕانەوەمان بۆ وڵات بەدوایی هات. وورده وورده ئەو بیرەم لە مێشك پەیدا بوو ئیتر لەمەودوا جەزرەبە نادرێم و بەرەو وڵات دەگەڕێمەوە. ئەو وڵاتەی زۆر بێ بەزەییانە ناپاکی لەگەڵ کردم.

لە دڵی خۆمدا گوتم فلانی! دەبێ ڕاست بێ وڵات ناپاکی لەگەڵ کردبم؟ ئایا ناشێ تاوانی یەکێکی وەکـو خۆم بێ‌و پێـویست بێ ڕك و کینـەی لە بەرامبەر هەڵنەگرم؟ زوو لە هەلیگۆلاند تێپەڕین. بەیەکەمین دیمانەی خانووبەرەی ئەڵمان، چاوم ڕوون بووەوە. دەبوو لە کوخاڤین Cuxhven دابەزین. جارێکی تریش بە دیداری منداڵی ئەڵمان، زەوییوزارو پاوان و مێرگ و لێرەواری ئەڵمان گەیشتمەوە. هەموو ئەمانە دڵیان پڕ کردم لە شادی.

لەو کاتەوەی بەم هەموو بیروباوەڕە مەزن و فراوانانەی خۆمەوە لە پێناو گۆڕینی دنیاو پەرەسەندنی ئاوەڕۆی ڕوود او گەردنی خۆم هێنابووە بەر چەقۆ، پێنج ساڵی تەواو بەسەر چوو بوو. بەسەروەت و سامانێکەوە گەڕابوومەوە نیشتمان بە هیچ پارەیەك نەدەکرا. ئەو سەروەت و سامانەش ڕێنوێنیتی‌و هیدایەتی خودایی بوو. لەبێ هیواترین هەلو مەرج مرۆڤ خۆی تێدا دەبینی، تەنانەت لەبەردەمی سێدارەش دەیتوانی لەسایەی ئەو ڕێنوێنییەوە چارەنووسی خۆی لە دەستی خودا بنێ.

بەبێ هیچ هۆیەکی پێ سەلمێن دەبوو ساڵێکی تریش لە کامپی بەدیل گیراوانی ئەڵمان بەسەر ببەم. بەڵام باوەڕی گۆڕین هەرگیز بەری نەدەدام.

ساڵ بە ساڵ ئەم باوەڕەم گوڕو تاوی سەندو، بنکەی پیشەی داهاتووی ژیانمی دروست کرد. بەڵام بەسەرهاتی ئەم شتەی دوایی‌و بەسەرهاتی ئەو دۆستانەی لە ئەڵمانیاو هەموو سووچ نکالی دنیا یاریدەیان دام کتێبێکی تری پێ دەوێ.

●

## پەراوێزەکان

١- مەبەستی لە «شێخ» دەبێ «کوێخا» بێ. (د. مارف)

٢- محـەمـەدایـەتی یا محەمەدانیزم. زاراوەیێکە ڕۆژهەڵاتناس وڕۆشنبیرو خوێندەوارەکانی ئەوروپا لە ئەدەبیات دا بەکاری دێنن بەرامبەر بە زاراوەی «ئیسلام» (د. مارف)

٣- بەشێکی کوردستان لە سوریاش هەیە. (د. مارف)

٤- نافیع ئاغای حاجی ڕەشید ئاغای باوکی ڕەمزی سەرۆکی خێل وعەشیرەت نەبوو، ئاغایێکی شارستانی خاوەن ماڵ وسـامـان بوو لە شارو دەشتـدا، دیارە دەست ڕۆیشتوو و خاوەن دەسەڵات بووە لە ماوەی ژیانیدا. (د. مارف)

٥- مەبـەستی لە خێـلی دایکی، میرەکانی شەقڵاوەیە، ئەوانیش بنەماڵەی دەوڵەمەندی خاوەن زەوی وزەر بوون، نەوەکو عەشیرەت. (د. مارف)

٦- ئامۆزاکەی ڕەمزی خورشید نووره دین (١٩١٧ - ١٩٨٧) بوو. (د. مارف)

٧- شێخە کوردەکان، مەبەستی ئاغا و بەگ وخان و میرو لەقەبەکانی تری دەسەڵاتدارانی کوردەوارییە. (د. مارف)

٨- گوندی (تەرجان)

٩- مەبەستی لە (سوعاد نافیع ڕەشید)ە.. (وەرگێر)

١٠- خزمەکانی ڕەمزی دەڵێن «نەخێر قلومچییەکە ناوی عەلی بووەو ناوی کوری ئەحمەد بوو، ڕەنگە (ئەبو ئەحمەد)یان گوتبێ. (وەرگێر)

١١- مەبەستی لە (خورشید نوورەدین)ە.. (وەرگێر)

# پاشەکییەك بۆ

## ( لە ڕۆژهەڵاتی گڕگرتوودا )

خوێندەواری خۆشەویست

لەوانەیە زۆر حەزبکەی بزانی دوای ئەو ڕووداوانەی لەم کتێبە باس کران ڕەمزی ومن چیمان بەسەر هات.

لەگەڵ ئەو پەڕی ڕێزەوەم بۆ ڕەمزی، هاوەڵ خوێندنێکی ڕەمزیم بەڕێکەوت بینی، زۆر جاران لە گوندەکەی خۆیانی بینیبوو، گوتی نزیکەی دەساڵ لەمەو بەر بە نەخۆشیی ئەقڵ شێوان دوا کۆچی کردووە. ئەو هاوەڵەی، پێی گوتم ڕەمزی هەمیشە شادو بەکەیف بووەو هەرکاتێ باسی کۆماندار گۆتفرید میوولەرمان بکرادایە، زەردە خەنەیەك دەپەڕیە سەر لێوی.

ئەمڕۆ گەلی کورد، بە سەردەمێکی تاڵ و تراژیدیدا ڕادەبووری‌و و هێشتا نیشانەی هیچ سەرەودەرێك لە ئاسۆوە دیار نییە. خوا دەست بداتە باڵیان و بەزەیی پێیان بێ و سەرفرازیان بکا. کورد لە مێژە بە ئاواتی سەرفرازییەوەن.

من چیم بەسەرهات؟

پاش هەموو ئەوساڵە دوورو درێژانەی گرتووخانە، دەسبەجێ لە خوێندنگای بەرزی تەکنیك کاری لە شتوتگارت وەرگیرام، دەمویست لە سەر بنەمای ئەو شارەزاییەی جاران لە بازرگانییەوە هەم بوو ئابووریی سیاسی بخوێنم. تەوژمی چاکەکاری‌و ماخولیای پارە کۆکردنەوە بەرە بەرە پەرەی گرت و، دەستم دایە کارێك بەڵکو ژن و منداڵەکەمی پێوە بەرێوە ببەم. لەگەڵێ کاران سەرکەوتم، بەڵام باوەڕێکی تر هەمیشە ختووکەی دەدام و دەبوو خۆم بۆ کارێکی سەربەخۆ تەرخان بکەم.

سەرنجام، ساڵی ١٩٥٧ بیری دامەزراندی کۆمەڵەیەکی خێرو مەندایەتی گشتیم کردەوەو ناوم نا (کۆمەڵەی دۆستایەتی ـ سالم)

ژمارەیەك خانەی بێ نەوایانم لە شتوتگارت و بەرلین و میونیخ و فرانکفۆرت و نۆرمبێرگ یەك لە دوای یەك کردەوە و زوو ناویان دەرکرد. بەڵام وێڕای هەموو ماندوێتی و خێرخوازیی خۆم و هاورێیانم بۆم دەرکەوت شتێکی دوورە دەستە بتوانی ژیانی ئاسایی و لەبار بۆ هەموو ئەم بێ نەوایانە دابین بکەی.

له گه‌لێکیانم بیست که سه‌رچاوه‌ی کڵۆڵیو به‌دبه‌ختی خۆیان له‌وه ده‌زانن به منداڵی هاتوونه‌ته کۆمه‌ڵه‌ی خێرو مه‌ندایه‌تی‌و، هه‌روا له سه‌رچاوه‌ی میریم بیستەوه ٧٠٪ی ئه‌و مێر منداڵانه‌ی له‌و کۆمه‌ڵانه ده‌رده‌چن. سه‌رپێچی له یاسا ده‌که‌ن، ئیدی بڕیارم دا وورده وورده بایه‌خم به پێگه‌ییوان که‌م بکـه‌مه‌وه‌و خۆم بۆ منداڵ و بچووکان ته‌رخان بکه‌م و ئه‌م خولیای تاوانکاری‌و سه‌رپێچی له یاسایه که‌م بکه‌مه‌وه.

بۆم ده‌رکه‌وت هۆی سه‌رنه‌که‌وتنی ماڵ و گوندو کۆمه‌ڵه‌ی خێرو مه‌ندان هه‌ڵه‌ی تاکه که‌سیی ئه‌وان نییه سه‌بارەت به‌و ڕه‌نج و کۆشش و ئه‌رك و کات و ماندوێتییه‌ی به‌م منداڵ و بچووکانه‌وه‌ی ده‌کێشن.

به‌لای منه‌وه کلیکی گیروگرفت له پڕۆیه‌که‌دایه.

لێره، له گه‌وره‌یی ئه‌م ئه‌رکه‌ی ئه‌ستۆی خۆم گه‌یشتم. چۆن بابایه‌کی لایده‌ی وه‌کومن له کارێك سه‌رده‌که‌وێ هێنده شارەزاو پسپۆره‌ی تێدا دۆڕابن؟

دوای له خوا پارانه‌وه‌و تکای سه‌رەو ده‌ر نیشاندان و، ڕه‌نج و کوێره‌وه‌ری کێشان وه‌ڵامی ئه‌و گرفته‌م به ده‌سته‌وه هات. سه‌رەو ده‌رێکم دۆزیه‌وه، سه‌رەو ده‌رێك خۆی ده‌سته‌به‌ری سه‌رکه‌وتنی خۆیه‌تی‌و، منداڵانمان بۆ ئامانجێك ڕێ به‌دیێنی ده‌کا ئامانجی نیاز پاکی و، کارگوزاری‌و، هاوکاری‌و هه‌ستی نیشتمان په‌روه‌رێتی له خوا ترسه.

ده‌رگامان بۆ هه‌موو پێشنیازێك ئاوالایه، زۆرمان پێ خۆشه زانیاریتان له‌م باره‌یه‌وه بۆ بنێرین و، زۆر که‌یف شاد ده‌بین ئه‌گه‌ر له گوندی سالم پێشوازیتان بکه‌ین.

(ئه‌و پرسیاره‌ی بوو بووه دڵه‌ڕاوکه‌ی هه‌میشه‌ییم ئه‌وه بوو چۆن له‌گه‌ڵ سۆسیالیستی نه‌ته‌وه‌یی پێشوومان یه‌ك بگرینه‌وه.)

له‌ســه‌رو به‌نــدی (نــازی)یــه‌تی، لاوانیــان به‌بیرێك گۆش ده‌کرد که‌وا ماکه‌ی هه‌موو کڵۆڵی‌و کوێره‌وه‌ریمان نیشتمانییه ڕه‌سه‌ن جوله‌کان بوون. ئه‌مه‌ش ته‌واو له‌گه‌ڵ ئه‌و ڕێوشوونه ناته‌با بوو جاران له کڵێسا فێری ده‌بووین. له‌وێ، (سه‌رده‌می کۆن و سه‌رده‌می نوێی کتێبی پیرۆز) به ووردی ده‌مخوێندران، وا فێر بوو بووین به چاوی ڕێزو حورمه‌ته‌وه سه‌یری جووله‌که بکه‌ین.

به‌ڵام پێش ئه‌وه‌ی ملمــلانــه‌ی تونــدی نێــوان ئه‌م دوو گۆشه‌نیگایه به‌لایه‌کدا بکه‌وێ،بانگی سه‌ربازی کرام و شه‌ڕ ده‌ستی پێ کرد.

ئه‌و شته‌ی هه‌میشه شانازیم پێوه کردووه ئه‌وه‌یه هه‌ر ئه‌رکێکم خرابێته ئه‌ستۆ، به‌و په‌ڕی تواناوه بۆ جێبه‌جێ کردنی تێ کۆشاوم. ئیدی ئه‌وه بوو هه‌موو گیان و دڵی خۆم بۆ ئه‌وه به‌خت کرد شه‌ڕ به‌سه‌رکه‌وتنی خۆمان به کۆتا بێ. ئه‌وکاته ته‌واو باوه‌ڕم وابوو ئێمه سه‌رده‌که‌وین.

کاتێ به‌دڵه‌ڕاوکـه که‌وتم له‌وه‌ی ڕه‌نگه چاره‌نووسمان بۆ لایه‌کی تر وه‌رسووڕێ، ده‌ستم کرده جێبه‌جێ کردنی ئه‌و کرده‌وه‌یه‌ی له‌م کتێبه باس کرا.

به‌بڕوای من، گه‌لی ئه‌ڵمانیا تا ئه‌مڕۆش له ڕووداوه‌کانی سه‌رده‌می هیتله‌ر نه‌گه‌یشتووه‌و له‌گه‌ڵیان ڕێك ناکه‌وێ. هه‌ڵکشانی به‌په‌له‌ی «په‌رجووی ئابووری» ڕێگای ئه‌مه‌ی نه‌داوه. به‌ڵام ئه‌گه‌ر بێو دوا ڕۆژمان دابین ببێ ئه‌وه شتێکه ناتوانین به ئاسانی به لاوه‌ی بنێن.

کۆمه‌ڵه‌ی (سالم) جگه له ئه‌رکی خۆی ـ له ئاواتی ئاسووده‌یی سه‌رجه‌م گیانله‌به‌ران و سروشتی

خۆ کرد، ئاواتی سیاسیشی هەن. کاری سیاسی لە حزبی سیاسی نا، بگرە لە گەڕان لە پێناو دەوڵەتی مەدەنی یان هاوبەشایەتی (کۆمیونەیی).

لە ڕێگای (سالم)ەوە بە هیواین گەنجێکی نوێ بگوورێنین، گەنجێکی ساغ لە بیرو لە گیان، گەنجێك وەکو هەوێن بێ بۆ کۆمیونەیی. لە تان و پۆی ڕابردوو بگاو لێوەی فێر بێ، کرێتی و دزێوی لەو مێژووەیتەکێنێ و ئەوەی بەرزو بەنرخە هەڵی بژێرێ و لەگەڵ ژیانی خۆی تێ هەڵکێشێ بکاو، گەلی ئەڵمان بگەڕێنێتەوە سەر ئەو بارەی جارێکی تریش ڕۆڵی چاکە لە دنیا بگێرێ.

ساڵانی دوورو درێـژی گرتووخانە، دەرفەتی ئەوەم هەبوو بە وردی لە بارەی ئەم شتانەوە ببیرێم و، سوپاسی یەزدان دەکەم هەلی ئەوەی بۆ گونجاندم بتوانم ئەم شتانەم جێبەجێ بکەم.

سوپاسی بەزەیی یەزدان دەکەم، لە تەنگاوەترین سەردەمی شەڕ، بەرگی پاراستنی لەبەرکردم و نەك هەر هەڵی ژیانی پێ دامەوە بگرە دەرفەتی ئەوەشی نەدام ببمە سۆنگەی ئەقڵ شێوانی کەسێك یان کوشتنی یەکێکی تر.

هەروەکو گوتم ڕەمزی بە ئەقڵ تێکچوون مرد. تادوا پشوو لە خۆشەویستیی من و ئەڵمانیا نەکەوت.

مردنی ڕەمزی کارێکی گەورەی لە گیانم کرد. پێم وایە تاکە ڕێگای تۆڵە کردنەوە ئەوەیە پتر بازوو لەم ژیانە هەڵبماڵم و پتر چاکی مەردانەی لێ بەلادا بکەم بۆ ئەوەی ئەو کاتەی بانگ دەکرێمە بەر بارەگای یەزدان، بەر هەمێکی ئەوتۆ پێشکێش بکەم پاکانەی ڕەمزیشی پێ بکرێ.

●



● نافیع ئاغای باوکی ڕەمزی



● ڕەشید ئاغای باپیری ڕەمزی



● ڕەمزی و نوورەدین زارا (لە بێرووت)



● وێنەی دەستی چەپ قەرەنی نافیع (١٩١٢ ـ ١٩٦٩)
● وێنەی دەستی ڕاست: سوعاد نافیع (١٩٢٩ ـ ١٩٩١)



● سوعاد نافیع برا بچووکی ڕەمزی لەو سەردەمەدا کە ڕەمزیو ئەڵمانەکان هاتن بۆ هەولێر.



● تیپی تۆپی پی لە دواناوەندی کەرکووک (١٩٣٧/٤/٢٠) وێنەی ڕەمزی (بەدانیشتوویی) دیووی ڕاستی کاسەکان



● لە راستەوە بۆ چەپ
قالە (خەڵکی سلێمانی بووە)، رەمزی، کامەران بەدرخان، نوورەدین زارا، محەمەد ئەرمەغانی

**Gottfried Johannes Muller**

# *In The Burning ORIENT*

**Dangerous Mission Middle Eeast 1943**

Translated into Kurdish By:

**Bedran Ahmed Habeeb**

Introduced By:

**Dr. Maruf Kheznedar**

Hawler - 1992

---

# في الشرق الملتهب

**«بعثة شرق الاوسط المحفوفة بالمخاطر ١٩٤٣»**

كتبه : **كوتفريد يوهانز ميوللر**

ترجمه : **بدران احمد حبيب**

قدم له **الدكتور معروف خزنەدار**

أربيل ١٩٩٢

# ڕەمزی نافیع ڕەشید

ئەو کەسەی دەرفەتی دیمانەی کوردێکی ڕەسەنی لەم شێوەیەی بۆ هەڵدەکەوێ، ناتوانێ خۆی لە هەستی بە هێزی خۆشەویستی لە بەرامبەری ئەو گەلەو وڵاتەکەیاندا ببوێرێ. کورد گەلێکی بەرچاوڕوون و ژیر و وریان. وزەیەکی بەرزەوت نەکراوی لە بڕان نەهاتوویان هەیە. مرۆگەلێکن هێشتا لە ڕێوڕەچەڵەکیان، لە گوندیان، لە داوو نەریتیان نەشۆراون. هەر کوردێکی تۆ دەیگری ڕەسەنزادەیەکە شیری دایکی خۆی مژتووە.

(میوولەر).

ڕەمزی بۆ هەولێر شۆڕشێك بوو، شۆڕشەکەی لە پێناسی خۆیەوە دەست پێ دەکا، شانازیی بە وشەی «ئاغا»وە نەکردووە، بە «ڕەمزی» نافیع ڕەشید» خۆی بە خەڵك ناساندوە. ئەگەر چی لە شار گەورە بووە بەڵام خوو و ڕەوشـتـی دەشـتـیشی پاراسـتـووە.. نیشتمانپەروەرییەکەی تەنیا بە قسەو لە ڕووی تیۆرییەوە نەبوو، بەڵکو بە کردەوە و پراکتیکـەوە چووە مەیـدان. بەرلین و مەشقی پەراشـووت و سیـلاحشۆری، بەبێ ڤیزە دابەزین لە وڵاتی خۆی.

د. مارف خەزنەدار

ڕەمزی! ڕۆڵەی بە شەرەف کورد و هەولێر!... بە هەموو ئاناوە شاگوڵێك بوویت لە باغی کوردایەتیدا؛ بەر لە پشکووتن هەڵوەرییت.. ئاواتێك بوویت بە ناکامی لە کیس نیشتمانت چوویت... بزەیەك بوویت، لە شەبەقی بەیانیدا، بەر لە خۆرهەڵات بەسەر لێوانەوە وشك بوویتـەوە، وای لە ڕەنجی بەفـیڕۆ ڕۆیشتـووت.. وای لە زیـانی بێ ئامـان و سامانی میللەتەکەت بە کۆژانەوەت..

(مەسعوود محەمەد)

هەولێر ١٩٩٢